## ناوەرۆك

# پێشکەشە

- بەوکەسانەی لەوباوەڕەدان کە هۆشیاری زانستی پاڵنەری ڕاستەقینەی ڕەوڕەوەی مێژووی مرۆڤایەتی‌یەو هەروەها باوەڕیان بەوە هەیە کە هۆشیاری زانستی بەشداری‌یەکی چالاك دەکات لە بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی کوردی سەربەخۆو پێشکەوتوو.

- بەو کەسانەی لەو باوەڕەدان کە هوشیاری پزیشکیی ڤێتێرنەری پێویستی یەکە لە پێویستی یەکانی سەردەم.

# پێشەکی بەرگی یەکەم

ئاشکرایە هەر لەسەرەتای ژیانەوە مرۆڤ وئاژەڵ دوو بوونەوەری سەرەکیی سەر گۆی زەوی بوونو پەیوەندییان بەیەکەوە بەستووەو بەیەکەوە ژیاونو بەشێوەیەك کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ مرۆڤ لە ئاژەڵ نزیکبووەتەوەو لەئەنجامدا سوودی لێوەرگرتووە لەپڕکردنەوەی پێداویستیەکانی لە خۆراكو پۆشاكو هەروەها هۆکارێکی باشبووە بۆ گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و هەروەك ئامرازێکیش بەکارهاتووە لە کشتوکاڵدا.

ئاژەڵداری واتە ماڵیکردنو بەخێوکردنی ئاژەڵ هەر لەدێرزەمانەوە بەپیشەیەکی سەرەکیی خەڵکی کوردستان دەژمێردرێت، بەجۆرێك ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی کوردستان بەتایبەتی گوندنشینەکان خۆیان خەریککردووە بەبەخێوکردنی مەڕو ماڵاتو باڵندە جۆربەجۆرەکانو هەروەها ئارەزووی ڕاوکردنی ئاژەڵو باڵندە کێوییەکانیشان هەبووە. وەکو ڕاوکردنی ئاسکی کێویو کەروێشكو کەوو قەتی..هتد بەشێوەیەك کەڕاوکەری چالاکیان تێدا هەڵکەوتووەو لەداستانو ئەفسانە فۆلکلۆرییە کوردیەکاندا ئاماژەیانپێکراوە.

لەم سەردەمەشدا سامانی ئاژەڵ لە مانگاو مەڕوبزنوگامێشو پەلەوەرو ماسیو ئاژەڵە کێوییەکان بەسامانێکی نەتەوەیی گرنگ دادەنرێتو دەتوانین بڵێین ئەمڕۆ پایەیەکی سەرەکی ئابووری کوردستان پێکدەهێنێتو پارێزگاریکردنیو هەوڵدان بۆ پێشخستنی بێگومان بەئەرکێکی نەتەوەییو نیشتمانی دادەنرێت.ئاژەڵیش هەروەکو مرۆڤ پێویستی بەچاودێریی بەردەوامو خۆراکی دروستو تەندروستیی باش هەیە بۆئەوەی بتوانێت لەڕێگەی بەرهەمەکانیەوە سوود بەمرۆڤ و ئابووری وڵات بگەیەنێت، بێگومان ئەم ئەرکەش لە چاودێریکردنو

پارێزگاریکردن و باش راگرتنی تەندروستیی ئاژەڵ و گەشەپێکردنی سامانی ئاژەڵ لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە ئەستۆی پزیشکانی ڤێتێرنەرییە.

پیشەی پزیشکی ڤێترینەری پیشەیەکی پیرۆزو زیندووە، پیشەیەکی پیرۆزە" لەو روانگەیەوە کە پزیشکانی ڤێتێرنەری مرۆڤێکی بەسۆزن کە هەمیشە هەوڵدەدەن کە ئازارو ئەشکەنجەی ئاژەڵی بێزمان کەم بکەنەوەو لەم کارەشیاندا تەنها پشت بەخۆیان دەبەستن، چونکە ئاژەڵی نەخۆش ناتوانێت باسی ئازارو ئەشکەنجەی خۆی بکات.

هەروەها پیشەیەکی زیندووە ئەمەش لەبەرئەوەی ساڵ لەدوای ساڵ پێویستی کۆمەڵگە جیهانییەکان بەگشتی و کۆمەڵگەی کوردەواری بەتایبەتی بۆ پیشەی پزیشکی ڤێترینەری روو لەزیادبوونە، چونکە پەیوەندی بەزۆری لایەنەکانی ژیانی خەڵکەوە هەیە و زانستی پزیشکی ڤێترنەریش لە گەشەکردن و پێشکەوتندایە، هەر لەبەرئەمەش لەدوای راپەرینە مێژووییەکەی گەلەکەمان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەستکردن بەپێویستی زۆری کۆمەڵگەی کوردەواری بەپزیشکانی ڤێترینەری" لەساڵی ١٩٩٥ کۆلێجی پزیشکی ڤێترینەری لەزانکۆی سلێمانی کرایەوە لەساڵی خوێندنی ١٩٩٥-١٩٩٦ یەکەم دەستەی خوێندکارانی وەرگرت و لە ساڵی ٢٠٠-٢٠٠١ یەکەم وەجبەیان بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان وەرگرت و پێشکەشکران بەدامودەزگاکانی حکومەتیهەرێمی کوردستان بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان، ئەرکەکانی پزیشکانی ڤێترینەری لەکوردستان زۆرن و لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا روونیان دەکەینەوە:

یەکەم: پزیشکانی ڤێترینەری هەڵدەستن بەدیاریکردنی (تشخیص) کردنی نەخۆشییە جۆربەجۆرەکان لە ئاژەڵ و باڵندە جۆربەجۆرەکانداو هەوڵدەدەن بۆ چارەسەرکردن و بنبڕکردنیان، ئەمەش بێگومان بەئەرکێکی سەرەکی دادەنرێت، چونکە نەخۆشییەکانی ئاژەڵ زۆرن و ترسناکن و کارێکی خراپ دەکەنە سەر تەندروستیی ئاژەڵ و دەبنە هۆی کەمبونەوەی بەرهەمەکانی لە شیرو گۆشت و هێلکەو..هتد، لەبەر ئەمە پێویستە پزیشکانی ڤێترینەری لە کوردستاندا ساڵانە

بەرنامەی گونجاو دابڕێژن بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشیەکانی لەڕێگەی کوتانی ئاژەڵەکان بەڤاکسینی نەخۆشییەباوەکان.

دووەم: پزیشکانی ڤێترینەری کاردەکەن لەپێناوی نەهێشتنی گواستنەوەی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ (دەردە مرۆژەڵییەکان یان ZOONOSES) بەپێی سەرچاوە پزیشکییەکان هەتاکو ئەم سەردەمە زیاتر لەدووسەد نەخۆشیی هاوبەش دۆزراوەتەوە، کە لەئاژەڵەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆیان ناڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و لە ئەنجامدا زەرەرو زیانێکی گەورە بەتەندروستیی مرۆڤ دەگەیەنێت، هەر لەبەرئەمەش بیرکردنەوە لەبنبڕکردن و نەهێشتنی ئەم نەخۆشیانە پێویستە لەئاژەڵەوە دەسپێبکات، چونکە هەتاکو لەئاژەڵدا بنبڕنەکرێت" لەمرۆڤدا بنبڕناکرێت.

سێیەم: پزیشکانی ڤێترینەری هەڵدەستن بەچاککردنی ئاژەڵ لەڕووی چۆنایەتی و لەڕێگەی پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد. کەڵدانی دەستکر یەکێکە لەو هۆکارە گرنگ و خێرایانەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ چاککردنی ئاژەڵ بەگشتی و لەمانگادا بەتایبەتی، ئەمەش بەهۆی گۆڕینەوەی پێکهاتە بۆماوەییەکان دەبێت و ئاژەڵ لەچەند روویەکەوە سوودی لێوەردەگرێت.

چوارەم: پزیشکانی ڤێترینەری رۆڵی بەرچاویان هەیە لەبەهێزکردنی ئابووری کوردستان و هەروەها دابینکردنی خۆراکی باش و دروست، کە ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی دابینکردنی ئاسایشی خۆراک و لە ئەنجامدا پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی لەکوردستاندا، چونکە لەم سەردەمەدا ئاژەڵ وەك یەکەیەکی ئابووری و خاوەن بەرهەمێکی بەنرخ سوودی لێوەردەگیرێت بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی مرۆڤ لە گۆشت و هێلکە و شیر بەنرخێکی گونجاو.

پێنجەم:پزیشکانی ڤێتریندەری کاردەکەن لە پێناو پاراستنی ژینگەی کوردستان و هەوڵدان لەپێناو مانەوەی ژینگەی کوردستان بەپاکوخاوێنی ئەمەش دەبێت لە ئەنجامی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بەشێوەیەکی ڕێکوپێک.

شەشەم:پزیشکانی ڤێتریندەری هەڵدەستن بەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری پزیشکی ڤێتریندەری، کە بەبەشێکی گرنگ لەهۆشیاری زانستی دادەنرێت، کە بێگومان ئەمەش بەهۆکارێکی باش دادەنرێت لەهۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگەی کوردەواریدا.

حەوتەم: پزیشکانی ڤێتریندەری خاوەن بڕوانامەی باڵا (ماستەرو دکتۆرا) هەڵدەستن بەپێگەیاندنی خوێندکارانی کۆلێجی پزیشکی ڤێتریندەری و هەروەها وانە وتنەوە لە کۆلێجە پزیشکییەکاندا.

لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە گرنگی و بایەخدان بەپیشەی پزیشکی ڤێتریندەری گرنگی و بایەخدانەبە: (سامانی ئاژەڵ،مرۆڤی کورد، ئابووری کوردستان، ژینگەی کوردستان، هۆشیاری زانستی، ئاسایشی نەتەوەیی).

هەر لەبەرئەمەش بەپێویستم زانی کە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە بخەمەپێش چاوی خوێنەران کە بەهیوام لەخزمەتی گشتی دابێت و هەروەها لەخزمەتی پیشەی پزیشکیی ڤێتریندەری و پزیشکانی ڤێتریندەری دا بێت.

## پێشەكی بەرگی دووەم:

خوێنەری بەڕێز ئەم كتێبەی لەبەردەستدایە بەرگی دووەمی پزیشكی ڤێترینەری یە كە پێكهاتووە لە كۆمەڵێك بابەتی گرنگو پڕ بایەخ لەبواری زانستی پزیشكی ڤێترینەری. لە ساڵی ٢٠٠٤ بەرگی یەكەم لەپزیشكی ڤێترینەری بە تیراژی ١٠٠٠ دانە لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپو بڵاوكردنەوە لە سلێمانی چاپ كراوەو لەئەنجامدا دەركەوت كەوا داواكاریەكی زۆری لەسەر هەیە لەلایەن خوێندكارانو پزیشكانی ڤێترینەریو خاوەن پرۆژەكانو زانستخوازان بەشێوەیەكی گشتی، لەبەر ئەوە بڕیارم دا بە زووترین كات هەوڵ بدەم بەرگی دووەم ئامادە بكەم. ئەم بابەتانەی بڵاوكراوەتەوە لەبواری پیشەی پزیشكی ڤێترینەری زۆر پێویستە بۆ كۆمەڵگا لەبەر ئەمە بەهیوام كە لەخزمەتی گشتی دابێت.

## پێشەكی بەرگی سێ یەم:

خوێنەری بەڕێز:

هۆشیاری پزیشكیی ڤێتێرنەری پێویستی یەكە لەپێویستی یەكانی سەردەم ، واتە بوونی زانیاری دەربارەی بابەتەكانی زانستی پزیشكیی ڤێتێرنەری لەنەخۆشی یە جۆر بەجۆرەكانی ئاژەڵ و باڵندە لەچۆنیەتی گواستنەوەیان بۆ ئادەمیزاد و هەروەها چۆنیەتی خۆ پاراستن لێیان بۆ گشت تاكێكی كۆمەڵگای كوردستان پێویستە چونكە تا تەندروستی ئاژەڵ پارێزراو نەبێت تەندروستی ئادەمیزاد پارێزراو نابیچت.

لەبەرئەوە هەروەك ئەركی سەرشانمان بەپێویستمان زانی كەبابەتەكانی بەرگی سێ یەمی پزیشكیی ڤێتێرنەری ئامادە بكەین و بیخەینە پێش چاوتان و سوودی لێوەربگرن و هەروەها لەبەر داواكاری یەكی زۆری ئەو كەسانەی نەیاتوانیوە بەرگی یەكەم و دووەمیان دەستبكەوێت بەباشمان زانی كەبابەتەكانی بەرگی یەكەم و دووەم جارێكی دیكە چاپ بكرێتەوەو بخرێنەوە

ـ رگی سێ یەمەوە بەهیوای ئەوەی کە بەئاسانی بگاتە دەست ئەو کەسانەی کەمەبەستیانە مە یردا بەم کارەش بتوانین کەلێنێکی بچوك لەکتێبخانەی زانستی کوردی پڕبکەینەوە.

ـ.فەرەیدون عبدالستار

ـــێمانی

# نەخۆشی‌یە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ

# یان دەردە مرۆژەڵییەکان ( Zoonoses )

هەرلەسەرەتای ژیانەوە مرۆڤ و ئاژەڵ دوو زیندەوەری سەرەکی سەر گۆی زەوی پێك دەهێنن و پێکەوە ژیاون و پەیوەندیان بەیەکەوە هەبووەو بە چەشنێك رۆژ لەدوای رۆژ مرۆڤ لەئاژەڵ نزیك بۆتەوەو سوودی لێوەرگرتووە بەمەبەستی جێبەجێکردنی کارە جۆربەجۆرەکانی و هەروەها ئاژەڵ سەرچاوەیەکی سەرەکی خواردنی مرۆڤ پێك هێناوە و هەتاکو ئەم سەردەمەش بە سەرچاوەیەکی گرنگی پرۆتین دائەنرێت.

لەرووی پزیشکیشەوە پەیوەندییەکی بەتین هەیە لە نێوان تەندروستی مرۆڤو تەندروستی ئاژەڵو ئەتوانین بڵێین کە ترسناکی ئاژەڵ بۆسەر مرۆڤ رۆژ لە دوای رۆژ روو لەزیاد بوونە، ئەمەش لەرێگەی گواستنەوەی هەندێك لە نەخۆشییەکانی ئاژەڵ بەشێوەیەکی راستەوخۆیان ناراستەوخۆ بۆ مرۆڤ، کە لەئەنجامدا زەرەروو زیانێکی گەورە بەمرۆڤو دەوروبەری دەگەیەنێت، وەبەم نەخۆشییانەش دەگوترێت نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ یان دەردە مرۆژەڵییەکان (Zoonoses ).

وەبەپێی سەرچاوە زانستییەکان هەتاکو ئەم سەردەمە نزیکەی زیاتر لە دووسەد نەخۆشی هاوبەش دۆزراوەتەوە کە لە ئاژەڵەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ، ساڵ لەدوای ساڵیش ژمارەی نەخۆشییەهاوبەشەکان روو لە زیادبوونە بەشێوەیەکی خێراو ترسناك کە هەرەشەیەکی راستەوخۆش پێك دەهێنێت بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ و ئابووری وولاتو ژینگەو هەروەها تەندروستی ئاژەڵیش.

جا لەبەرئەوە پێویستە هەموو توێژو چینێکی کۆمەڵگای کوردەواری هۆشیار بکرێنەوە بەزانیاری پێویست دەربارەی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ

لە ڕێگەی هۆکارە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنەوەو هەروەها لەڕێگەی کۆڕو کۆبوونەوەی بەردەوام. بەهیوای بەرزکردنەوەی ڕادەی هۆشیاری تەندروستی و ڕۆشنبیری تەندروستی و هەروەها لەئەنجامدا پاراستنی مرۆڤی کوردو ژینگەی کوردستان لەم دەردوو نەخۆشیانە.

## پێناسەی دەردەمرۆژەڵییەکان:

دەردەمرژۆڵییەکان یان نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤو ئاژەڵ، لەسەرچاوە عەرەبییەکاندا بە (الأمراض المشترکة بين الأنسان والحيوان) ناودەبرێت و لەسەرچاوە پزیشکییەکاندا بەگشتی بە (Zoonoses) ناودەبرێت.

بەوکۆمەڵە نەخۆشیانە دەگوترێت کە سروشتیانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ تووشی مرۆڤ وئاژەڵ دەبن لە ڕێگەی گواستنەوەی هۆکارە نەخۆشخەرەکان (Causative agents) لە:

١- زیندەوەرە ووردبینەکان (Microscopi cl organism) لە-بەکتریا-ڤایرەس-کلامیدیا-ڕیکێتسیا-زیندەوەرە سەرەتاییەکان-کەڕووەکان.

٢-کرمەکان (Helminth Parasites)

٣-جومگەدارەکان (Arthropod parasites) لە نێوان مرۆڤ وئاژەڵدا.

## پۆلێن کردنی دەردەمرۆژەڵییەکان:
## (Classifi Cation of Zoonotic Diseases)

دەردەمرۆژەڵییەکان بەشێوەیەکی گشتی بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن دەکرێن:-

## یەکەم: بە پێی جۆری خانە خوێی هۆکاری نەخۆشیەکە: دەکرێتە سێ بەشەوە:-

### Anthropozoonoses-١

ئەو نەخۆشیە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە لە ئاژەڵەوە (خانەخوێ) دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ . وەکو نەخۆشی تای ماڵتا (Brucellosis)

### Zooanthroponoses-٢

ئەونەخۆشییە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە لە مرۆڤەوە (خانەخوێ) دەگوێزرێتەوە بۆ ئاژەڵ، وەك نەخۆشی سیل (TuberCulosis)

### Amphixenoses -٣

ئەونەخۆشیە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە بەشێوەیەکی یەکسان تووشی مرۆڤو ئاژەڵ دەبن، وەکو ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی بەکتریای (Streptococcus) تووش دەبن.

## دووەم: بە پێی سوڕی ژیانی هۆکاری نەخۆشییەکە دەکرێتە چواربەشەوە:-

### Direct-Zoonoses -١

ئەو نەخۆشییە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە هۆکارەکەی بۆ تەواوکردنی سوڕی ژیانی پێویستی بەیەك خانە خوێی بڕبڕەدار هەیە، وەکو: نەخۆشی هاری سەگ (Rabies).

### Cyclo- Zoonoses -٢

ئەونەخۆشییە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە هۆکارەکەی بۆ تەواوکردنی سوڕی ژیانی پێویستی بەچەند خانە خوێی بڕبڕەدار هەیە، وەکو: نەخۆشی تورەکەی ئاوی (Hydatid cyst).و کرمی شریتی (Taenia Saginata)

## ٣- Meta- Zoonoses:

ئەونەخۆشییە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە هۆکارەکەی بۆ تەواوکردنی سوڕی ژیانی پێویستیبە خانەخوێیی بێبڕبڕە هەیە، وەکو ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی ڤایرۆسی (Arbo virus) بلاّودەبنەوە.

## ٤- Sapro- Zoonoses:

ئەو نەخۆشییە هاوبەشانە دەگرێتەوە کە هۆکارەکەی بۆ تەواوکردنی سوڕی ژیانی پێویستی بەیەك خانە خوێی بڕبڕەدار هەیەو هەروەها پێویستی بەشوێنێك هەیە لە دەرەوەی لەشی خانە خوێ بڕبڕەدارەکە وەکو (خاك-خۆڵ-خۆراك-ڕووەك).

وەکو:هەندێك لەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی کەڕووەوە (Fungi) بلاّودەبنەوە.

## سێیەم :بە پێی جۆری هۆکاری نەخۆشیەکان دەکرێتە نۆ بەشەوە:-

١- نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵەکە هۆکارەکەی ڤایرەس (Virus):

کۆمەڵێك نەخۆشی ترسناکن کە لە ئاژەڵەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ، وەکو:

- نەخۆشی تای خوێن بەربوون (Haemorrhagic fever)
- نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە (Avian Influanza)
- نەخۆشی هاری سەگ (Rabies)

٢- نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ کە هۆکارەکەی بەکتریا (Bacteria):

گرنگترین ئەو نەخۆشییە بەکتریایانەی کە لە ئاژەڵەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ:

- نەخۆشی (Anthrax) (نەخۆشی سپڵ)، بەکتریای ئەم نەخۆشییە هەروەکو چەکی بایۆلۆژی بە کاردەهێنرێت.

- نەخۆشی (Brucellosis) دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لەرێگەی بەرهەمی ئاژەڵی (شیر-پەنیر)و مرۆڤ تووشی تای ماڵتا دەکات.

نەخۆشی (Glanders) کەتووشی ئەسپ و ماین دەبێت لەویشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

٢- نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤو ئاژەڵ کە هۆکارەکەی کەڕووە (Fungi):

- ئەم نەخۆشیانە زیاتر تووشی ئاژەڵی ماڵی دەبن و لە ئەنجامدا دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ. وەکو:

- نەخۆشی Ring Worm کە هۆکارەکەی جۆرێکە لە کەڕووەکان پێی دەوترێت (Trichophyton) وە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ زیاتر لە ناوچە گوندنشینەکاندا.

٤- نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ ئاژەڵ کە هۆکارەکەی زیندەوەرە سەرەتاییەکانە(Protozoa): وەکو:-

- نەخۆشی تۆکسۆپلازمۆسز (Toxoplasmosis) کەزیاتر لە پشیلەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لەئەنجامدا دەبێتە هۆی لەبارچوونی ئافرەتی سك پڕ.

- دەردە خەو (Sleeping sickness) کە هۆکارەکەی (Trypanosoma) کە بەهۆی مێشوولەی تسی تسی دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

٥- نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ کە هۆکارەکەی کرمەکانە بەگشتی (Helminth Parasites) وەکو

- نەخۆشی تورەکەی ئاوی (Hydatid Cyst) کە هۆکارەکەی پێی دەوترێت: کرمی شریتی:

(Echinococcus granulosus) لەرێگـەی هێلکـەی ئـەم کرمـەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ .

٦- نەخۆشـییە هاوبەشـەکانی نێـوان مـرۆڤ وئـاژەڵ کـە هۆکارەکـەی رێکێتسـیا (Rickettsia) وەکو:

- نەخۆشی (QFever).

٧- نەخۆشـییە هاوبەشـەکانی نێـوان مـرۆڤ و ئـاژەڵ کـە هۆکارەکـەی کلامیـدیا (Chlamydia) وەکو:-

- توتنی (Psittacosis) کە لەباڵندەوە بە تایبەتی توتنی و کەناری دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

٨- نەخۆشییە هاوبەشـەکانی نێـوان مـرۆڤ وئاژەڵ کـە هۆکارەکـەی جومگەدارەکانە (Arthropod Parasites) : وەکو

- -نەخۆشی گەڕی (Manage).

٩- نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوانِ مرۆڤو ئاژەڵ کە هۆکارەکەی پریۆن (Prion):

کە بەنوێترین هۆکاری نەخۆشخەر دادەنرێت.

کۆمەڵێك نەخۆشی لە مرۆڤ و ئاژەڵدا دەگرێتەوە:-

**-لەمرۆڤدا:**

- نەخۆشی کروتزفیلد- یاکوب Creutzfeldt-Jacob Diseases
- نەخۆشی کورۆ (Kuru).

- نەخۆشی {Gerstmann- Straussler-Scheinker disease}

**-لەئاژەڵدا:**

- نەخۆشی سکرەیپی ( Scrapie) لە مەڕو بزن.
- نەخۆشی شێتبوونی مانگا { Bovine Spongiform Encephalopathy}
- ئاسکو ئێسترو پشیلە تووشی نەخۆشی دەکات.

## ڕێگاکانی گواستنەوەی نەخۆشیە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤو ئاژەڵ:-

**یەکەم/** لەڕێگەی پێستەوە بەهۆی

ا-گازگرتن لەلایەن سەگی هارەوە.

ب-بەهۆی مێش ومێشولەو گەنەوە.

ج-برینی پێستەوە.

**دووەم/** لەڕێگەی کۆئەندامی هەرسەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی خواردن و خواردنەوەی پیس بووبە هۆکارە نەخۆشخەرەکان

**سێیەم/لە** ڕێگەی کۆئەندامی هەناسەدانەوە، ئەمیش بەهەڵمژینی هەوای پیسبوو بەهۆکارەکانی نەخۆشییەکان. هۆکارە نەخۆشخەرەکان

## ڕێگاکانی خۆپاراستن

**یەکەم/** بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری تەندروستی، ئەویش بەڕوونکردنەوەی ترسناکی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ بەشێوەیەکی زانستیانەی سادەو ساکار بۆ خەڵکی شارو لادێ لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە.

**دووەم/** پێکهێنانی چەند لیژنەیەك لە پزیشکانی ڤێترینەری و پزیشکانی ئادەمیزاد بە مەبەستی سەردانی گوندەکانی کوردستان بۆ روونکردنەوەی ڕێگاکانی گواستنەوەی نەخۆشییە هاوبەشەکان و ترسناکیان لەسەر تەندروستی مرۆڤ و پیسبوونی ژینگە، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ چونکە خەڵکی گوندەکان زیاتر تووشی نەخۆشییە هاوبەشەکان دەبن ئەویش لەبەر ئەوەی زیاتر پەیوەندیان بە ئاژەڵەوە هەیە.

**سێیەم/** پێویستە بەپێی بەرنامەیەکی زانستی داڕێژراو، نەخۆشخانەی ڤێترینەری ساڵانە قەڵاچۆی ئەو نەخۆشیە هاوبەشانە بکات لەڕێگەی بەکارهێنانی دەرمان و ڤاکسین ی پێویستەوە.

**چوارەم/** قەڵاچۆکردنی گوێزەرەوە بایۆلۆجییەکان لە (مێش و مێشوولە و گەنە و ئەسپێ...هتد) بەتایبەتی لە وەرزەکانی هاوین و بەهارو پاییز.

**پێنجەم/** پشکنینی هەموو بەروبومێکی ئاژەڵ کە دەکەوێتە بازاڕەوە لە (ماست و پەنیر و شیر و کەرە و...هتد) هەروەها پشکنینی لاشەی ئاژەڵی سەربڕاو لە قەسابخانە لەلایەن پزیشکی ڤێترینەرییەوە.

**شەشەم/** لە گوندەکاندا پێویستە شوێنی تایبەتی بۆ ئاژەڵ دروست بکرێت و بەردەوامیش خاوەن ئاژەڵەکان پەیوەندی بکەن کلینیکی پزیشکی ڤێترینەرییەوە بۆ وەرگرتنی زانیاری پێویست دەربارەی چۆنێتی بەخێوکردنی ئاژەڵ و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکان .

## ئەو سەرچاوە زانستیانەی سودیان لیّ وەرگیراوە:

١-الأمراض المشتركة بين الأنسان والحيوان. د.جليلة مصطفى خليل

٢-الأمراض المشتركه بين الأنسان والحيوان. د.صباح العلوچي و د.عبدالحسين بيرم.

٣-مجلة ابقار اغنام الشرق الأوسط وشمال افريقا. سالّى چوارەم ژمارە (١٥) ١٩٩٨.

٤- Stedman's Medical DICTIONARY

1990 25 th edition USA

٥- Veterinary Medicine-

D,.C. Bood

## نەخۆشی

## "ئەنفلۆنزای باڵندە"و پەیوەندی بە مرۆڤەوە

## Avian Influenza

نەخۆشـــی ئـــەنفلۆنزای باڵنـــدە نەخۆشـــییەکی ڤایرۆســـی تونـــدو تیـــژە، بەشێوەیەکی کتوپڕ بڵاودەبێتەوەو دەبێتە هۆی لەناوبردنی ژمارەیـەکی زۆر لـە باڵنـدە (لەمریشك وقەل) هەروەها لە زۆربەی وولاتانی جیهاندا هەیەو ئەم نەخۆشی‌یە یەکێك لـــە دەردە مرۆژەڵییـــەکان (Anthropozoonoses) دادەنرێـــت، واتـــە هۆکـــاری نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی سروشتی تووشی مرۆڤ وئاژەڵو باڵندە دەبێت.

## کورتەیەکی مێژوویی:

بـۆ یەکـەم جـار لەسـاڵی (١٨٧٨)ز لـە ولاتـی ئیتاڵیـا لەلایـەن زانـای ئیتـاڵی پیرۆنســـیتۆ (Perroncito) نەخۆشـــی ئـــەنفلۆنزای باڵنـــدە دۆزرایـــەوە لـــەکاتی بڵاوبوونـەوەی نەخۆشی یەکـە لـە پەلـەوەری ئـەو وڵاتـەدا بەشێوەیەکی ترسـناك هـەر لەبەر ئەمەش ناویان لێنا تاعونی باڵندە (Fowl plague)

* لەســـاڵی (١٩٠١) ز، زانایـــان (Centanni)و (Savunossi) ســـەلماندیان کـــە هۆکاری تاعونی باڵندە ڤایرۆسی‌یە. (Virus) Filterable agent

*لەســـاڵی (١٩٣٠) ز ڤایرۆســـی ئـــەنفلۆنزای جـــۆری "A " دۆزرایـــەوە. ("A" Influenza virus type)

*لەسـاڵی (١٩٥٥) ز سـەلمێنرا کـە هۆکـاری سـەرەکی نەخۆشـی تـاعونی باڵنـدە دەگەڕێتـەوە بـۆ ڤایرۆسـی ئەنفلۆنزا جـۆری (A) کـە تووشـی زۆربـەی جۆرەکـانی

باڵندە دەبێت لە قەل و مریشك و قازو مراوی..هتد هەر لەبەر ئەمەش ناویان لێنا ئەنفلۆنزای باڵندە (Fowl Influenza)

*لەساڵی (١٩٦٣)ز بۆ یەکەم جارل ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا لە قەل دا دۆزرایەوە لە باکوری ئەمریکاو سەرچاوەی نەخۆشی یەکەش باڵندە ئاوییە کۆچەرییەکان بوون و هەروەهاچەند سەرچاوەیەکی زانستی ئاژەڵە شیردەرەکانی وەکو (بەراز)ی تاوانبار کرد بەوەی کە نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە دەگوێزرێتەوە بۆ قەل و پەیوەندییەکەش بەم شێوەیەیە:

– (مراوی ⟵ بەراز ⟵ قەل)

لەسەدەی بیستەمدا نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە چەند جارێك لەشێوەی چەند شۆڕشێکدا (Disease outbreak) سەری هەڵداوەو لە زۆربەی ولاتانی جیهاندا بڵاوبۆتەوە، هەر لەم بیست ساڵەی رابردوودا ئەنفلۆنزای باڵندە بەم شێوەیە لە جیهاندا تەشەنەی کردووە:

– لەساڵی ١٩٧٩ لەبەریتانیا.
– لەساڵی ١٩٨٣–١٩٨٤ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.
– لەساڵی ١٩٨٣–١٩٨٤ لەئیرلەندا.
– لەساڵی١٩٨٦ لەهۆنگ کرنگ.
– لەساڵی١٩٨٨ لەهۆنگ کۆنگ.
– لەساڵی ٢٠٠٣–٢٠٠٤ لەوولاتانی باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیا.

## خانە خوێی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای باڵندە:

بەپێی زۆربەی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری، ڤایرۆسی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە بەشێوەیەکی سروشتی لە خانەکانی ریخۆڵەی باڵندە کێوییە ئاوییەکاندا (Wild water Fowl) دەژین و هەروەها لەم خانانەدا دابەش دەبن و

گەشە دەکەن و لە ئەنجامدا زۆر دەبن و بەبێ ئەوەی هیچ زیانێك بەخانە خوێ کە بە ‌یەنن، واتە ئەم باڵندە کێویە ئاویانە بەسەرچاوەیەکی هەمیشەیی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە دادەنرێت و لە ئەنجامیشدا ڤایرۆسەکان لەڕیخۆڵەی باڵندە ئاوییەکانەوە دەردەدرێنە ئاوی رووبارو دەریاچەکانەوە بۆماوەی چەند هەفتەیەك بەچالاکی دەمێننەوە.

باڵندە ئاوییە کۆچەریەکان وەکو "مراوی" لە زۆریەی باڵندەکانی تر زیاتر ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا لە لەشیدا هەیە.

## هۆکاری ئەنفلۆنزای باڵندە: Causative agant

بەپێی زانستی ڤایرۆلۆجی ترسناکی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ چەند تایبەت مەندی یەك کە تەنها لە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای باڵندەدا هەیە لەوانەش:

**یەکەم:**

ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا بەگشتی سێ جۆری سەرەکی هەیەو هەروەها چەند جۆرێکی لاوەکی (Subtype) تری لێ دەبێتەوە، بەشێوەیەك کە جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوانیاندا هەیە (Antigenic Variation).

**دووەم:**

بەهیچ شێوەیەك هیچ جێگیریەك نییە لە پێکهاتەی پەردەی دەرەوەی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا واتە ڤایرۆسەکە لە گۆڕانێکی بەردەوام دایە: (Antigenic Changes).

هۆکاری نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە بریتیە لە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا (Influenza Virus) کە سەربەخێزانی (Orthomyxo viridae)، لەجۆری (RNA Virus) ە. تیرەی ڤایرۆسەکە نزیکەی (٨٠-١٠٠) نانۆمیترە.

لەرووی پێکهاتەی کیمیاییەوە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا بەشێوەیەکی گشتی لەم ماددانە پێکهاتووە:

١-مادەی پرۆتین نزیکەی ٧٣٪

٢-ماددەی چەوری نزیکەی ٢٠٪

٣-ماددەی کاربۆهیدریت نزیکەی ٦٪

٤-ترشە ناوکی [١] RNA نزیکەی ١٪

## جۆرەکانی پرۆتینی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا بەم شێوەیەیە:

Hemagglutinin ←—— HA-١

Neuraminidase ←—— NA -٢

Nucleoprotein ←—— NP-٣

Polymerase asidic ←—— PA-٤

Polymerase basic 1 ←—— PB1-٥

Polymerase basic 2 ←—— PB2-٦

Matrix protein 1 ←—— M1-٧

Matrix protein 2 ←—— M2-٨

Non structural protein 1 ←—— NS1-٩

Non structural protein 2 ←—— NS2-١٠

بـەپێی سروشـتی ئـەنتیجینیی پرۆتینـی (M-NP) ڤایرۆســی ئـەنفلۆنزا دەکرێتەسێ جۆری سەرەکی جیاوەزەوە:

یەکەم: جۆری "A" تووشی مرۆڤ وبالندەو بەرازو ئەسپ و منک (ئاژەلێکی شیردەرە) دەبێت.

دووەم: جۆری "B" تووشی مرۆڤ دەبێت.

سێیەم: جۆری "C" تووشی مرۆڤ دەبێت.

ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای جۆری "A" (Influenza Virus type)

ڤایرۆسی ئەنفلۆزای جۆی "A" لەهـەمو جۆرەكانی دیکە گرنگترە لـەرووی پزیشـکییەوە چونکە تووشی مـرۆڤ وئاژەڵ و باڵنـدە دەبێت و بەلێپرسـراوی یەکـەم دادەنرێت لەسەرهەڵدانی ئەو نەخۆشییانەی کە لەشێوەی شۆڕشێکدا ( Outbreak Disease) بڵاودەبنەوەو بەتایبەتی لەسەدەی بیستەمدا.

لەسـەر رووی دەرەوەی ڤایرۆسـی ئـەنفلۆنزای جـۆری "A" دوو چـوکلەی پرۆتینی هەیەو هەر یەکەیان فەرمانی تایبەتی خۆی هەیەو بەم شێوەیە:

١- Hemagglutinin(HA)کەبەهۆیەوە ڤایرۆسەکە دەلکێت بەخانەوەو هـەروەها توانای (hemagglutinating activity ) لەگەڵ خرۆکە سوورەكاندا هە.

٢-Neuraminidase (NA) یارمـەتی چـونە ژوورەوەی ڤایرۆسـەکە دەدات بـۆ نـاو خانە بەشی کردنەوەی ماددەی (neuraminic acid).

وەبەپێی سروشـتی ئـەنتیجینی (Antigenic nature) پرۆتینـی (HA) وە (NA) ڤایرۆسـی ئـەنفلۆنزای جـۆری "A" چـەند جـۆرێکی لاوەکـی (Subtypes) لێ دروست دەبێت.

پشت بەستن بەسەرچاوەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە ساڵی (١٩٨٠) بەم شێوەیە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای جۆری "A" پۆلێن کراوە هەروەکو لەم خشتەیەی خوارەوەدا روون کراوەتەوە

| Hemagglutinin (HA) | Neuraminidase (NA) |
|---|---|
| H 1 | N 1 |
| H 2 | N 2 |
| H 3 | N 3 |
| H 4 | N 4 |
| H 5 | N 5 |
| H 6 | N 6 |
| H 7 | N 7 |
| H 8 | N 8 |
| H 9 | N 9 |
| H 10 | |
| H 11 | |
| H 12 | |
| H 13 | |

واتە بەپێی چوکڵەی "HA" سایزدە (١٣) جۆری لاوەکی هەیەو بەپێی چوکڵەی پرۆتینی "NA" نۆ (٩) جۆری لاوەکی تریش هەیەو، پێویستە هەموو ڤایرۆسێك جۆرێك لە چوکڵەی پرۆتینی "HA" و جۆرێك لە چوکڵەی پرۆتینی"NA" تێدابێتو بەم شێوەیە لە ئەنجامدا (١١٧) سەدو حەڤدە جۆری لاوەکی جیاواز لەیەکتری دروست دەبێت کە هیچ پەیوەندییەکی ئەنتیجینی لە نێوانیاندا نابێت. واتە هەریەکەیان جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ ئەوی تردا هەیە.

ئەم ژمارە زۆرە لەدروست بوونی جۆری ڤایرۆسەکەو جیاوازی لە پێکهاتنی پرۆتینیان بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ دیاردەیەك کە بەسەر پێکهاتنی بەرگی دەرەوەی ڤایرۆسەکەوە دێت بەتایبەتی بەسەر چوکلی (HA)، (NA)دا دێت و بەم دیاردەیەش دەوترێت: (Antigenic changes) ئەم دیاردەیەش دووبەشی سەرەکی دەگرێتەوە:

## یەکەم: (Antigenic Drift)

ئەم دیاردەیە لەئەنجامی گۆڕانێکی کەم (تغيير جزئى) کە بەسەر پرۆتینی (HA)، (NA) دادێت کە دەکەونە سەر بەرگی دەرەوەی ڤایرۆسەکە، ئەمەش دەبێت لەئەنجامی بازدانی بۆماوەیی (Mutation) ڕوودەدات کە بەسەر جینەکاندا دێت و ئەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی ڕیزبەندی ترشە ئەمینییەکان (aminoacid)و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی گۆڕانی پێکهاتەی پرۆتینی چوکلەی (HA)،(NA)، ڤایرۆسەکە بەبەرگێکی نوێوە خۆی پیشان دەدات و کۆئەندامی بەرگری توانای ناسینەوەی ڤایرۆسەکەی نابێت. وە بەپێی لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئەم دیاردەیە زیاتر لە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای جۆری (A) ڕوودەدات کەتووشی مرۆڤ دەبن.

## دووەم: Antigenic Shift

ئەم دیاردەیە زۆر ترسناکترە لە دیاردەی یەکەم چونکە دەبێتە هۆی گۆڕانێکی تەواو بنچینەیی کە بەسەر چوکلەی پرۆتینی (HA)،(NA) دا دێت لە ئەنجامدا وەچەیەکی نوێ لە ڤایرۆسەکە دروست دەبێت.

لەبەر سروشتی پارچەپارچەیی ترشە ناوکی ڤایرۆسەکە (RNA) (لەهەشت پارچە پێکهاتووە) کەخۆی لەخۆیدا ڕێگە خۆشکەرێکە بۆ تێکەڵاوبوون و دووبارە یەکگرتنەوەی جینەکان لەکاتی تووشبوونی خانەی زیندەوەرێك بەدوو جۆری لاوەکی جیاواز لە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای جۆری (A)ولەئەنجامدا جۆرێکی نوێ

(New Strain) دروست دەبێت کە بەهیچ شێوەیەك لە دوو جۆری لاوەکی سەرەکییەکە ناچێت و بەم چالاکییەش دەوترێت:

(Genetic Reassortment) یان (Genetic Recombination) وە لەئەنجامی ئەم چالاکییەشدا نزیکەی (٢٥٦) دووسەدوویەنجاوشەش وەچەی نوێ لە ڤایرۆسەکە کەجیاواز لەیەکتری دروست دەبێت.

ئەم دیاردەیەش زیاتر ڕوودەدات لەکاتی تووشبوونی مرۆڤ بەدوو جۆری جیاواز (جۆری تایبەت بە مرۆڤ جۆرێکی تایبەت بە باڵندە)واتە جۆرەکانی ڤایرۆسی باڵندە رۆڵی سەرەکیان هەیە لەبەرهەم هێنانی جۆری نوێ لە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای مرۆڤ ولەرێگەی دیاردەی ( Genetic Reassortment) هەروەك لەم هێلکارییەی خوارەوەدا روونکراوەتەوە:

ڤایرۆسی مرۆڤ +ڤایرۆسی باڵندە

↓

مرۆڤ

↓

رێکخستنەوەی بۆماوەیی

↓

یەککگرتنەوەی بۆماوەیی

↓

جۆرێکی نوێ (New Strain)

لەڤایرۆسی ئەنفلۆنزای جۆری (B)،(C) چالاکی Genetic Reassortment روونادات چونکە ئەم دووجۆرە تەنها تووشی مرۆڤ دەبن و تووشی باڵندەو ئاژەڵ نابن.

## -ڕێگاکانی گواستنەوەو بڵاوبوونەوەی ئەنفلۆنزای باڵندە:

یەکەم: لەوەرزی کۆچ و ڕەوی باڵندە کێویە ئاوییەکان نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە یان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگوێزرێتەوەو نەخۆشییەکە بڵاو دەبێتەوە.

دووەم:لەبەرئەوەی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای باڵندە توانای هەیە لەناو ئاوی ڕووبارو دەریاچەکان بەچالاکی بمێنێتەوە واتا لەڕێگەی ئاوەوە دەگوێزرێتەوە.

سێیەم: لەڕێگەی کۆئەندامی هەرس (Digestive tract) لەبەرئەوەی پاشەڕۆی باڵندە ژمارەیەکی زۆر ڤایرۆسی تێدایەو لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی پیس بوونی ئاوو خواردن و گوێزانەوەی نەخۆشییەکە.

چوارەم: لەڕێگەی کۆئەندامی هەناسەدان:(Respirtory System) دەردانی ژمارەیەکی زۆر لە ڤایرۆسەکە لەگەڵ ئیفرازاتی کۆئەندامی هەناسەدانی باڵندەکەو گواستنەوەی نەخۆشییەکە لەڕێگەی هەواوە بەشێوەیەکی خێرا.

پێنجەم: نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە زیاتر تووشی ئەو مریشك‌و قەل‌و مراویانە دەبێت کە لە شوێنی داخراودا بەخێوناکرێن‌و بەبەردەوامی تێکەڵ دەبن لەگەڵ باڵندە ئاوییە کێوییەکاندا.

شەشەم:نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە بۆی هەیە کە لە ڕێگەی ئاژەڵە شیردەرەکانەوە (وەکو بەراز) بگوێزرێتەوە بۆ پەلەوەر.

## نیشانەکانی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە: cl i ni cal si gns

## نیشانەکانی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە بەشێوەیەکی گشتی بەندە لەسەر:

- جۆری ڤایرۆسەکە (Strains of Virus)
- جۆری باڵندەی تووشبوو.
- تەمەنی باڵندەی تووشبوو.
- ڕادەی بەرگری لەشی باڵندەی تووشبوو (Immune Status)
- بونی هۆکاری ماندووبوون (Stress factor) لەژینگەی باڵندەی تووشبوو.

## لەنیشانە دیارەکانی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە لە مریشك و قەل دا.

١-بەرزبوونەوەی ڕادەی لەناوچوون بەشێوەیەکی کتوپڕ لە ئەنجامی مرداربوونەوەی کتوپڕ (Sudden Death) و ڕادەی لەناوچوون و تووشبوون Morbidity & Mortality دەگاتە ١٠٠٪ لەکاتی تووشبوونی مریشك و قەل بەجۆری (Highly Pathogenic Viruses).

٢-نزم بوونەوەی بەرهەم هێنانی هێلکە بەڕادەیەك کە دەگاتە ئاستی وەستان.

٣-نزم بوونەوەی ئاستی بەکارهێنانی خواردن و لەئەنجامدا لاواز دەبێت.

٤-لەنیشانەکانی کۆئەندامی هەناسەدان:

- قرخەقرخ و پژمین.
- چاوی باڵندەکە ئاو دەکات.
- گەورەبوون و هەوکردنی گیرفانەکان (sinusitis)

٥- سووربوونەوە و شین هەڵگەڕانی سەرو پۆپنەی باڵندەکە.

٦-دەم و چاوی مریشکەکە دەئاوسێت.

٧-پەڕی باڵندەکە گرژدەبێت.

٨-تووشی سك چوون دەبێت.

٩- شینبونەوەی ئەو ناوچانە لەپێست کە پەڕی پێوەنییە.

## ئەد- ت نیشانکردنی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە: (Diagnosis)

## بۆ ئەم مەبەستە پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە بەئەنجام بگەیەنرێت:

یەکەم: بەهۆی نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکەوە. (Clinical Signs).

دووەم: لەنیشانە دیارەکانی دوای مرداربوونەوەی باڵندەکە. ( Post Mortem Examination) (Gross Lesions ).

سێیەم: جیاکردنەوەو دەست نیشانکردنی هۆکاری نەخۆشییەکە .

( Isolation and Identification of Causative agents

چوارەم: تاقی کردنەوە سیرۆلۆجییەکان: (Serological tests)

1- Hemagglutination Inhibition test (HI).

2- Double Immunodiffusion test.

3- Virus neutralization test.

4- Complement.

Fixation test.

5- Neuraminidase-Inhibition test.

6- ELISA.

## پێنجەم: بەهۆی تەکنیکی ((PCR))

## جیاکردنەوەی نەخۆشیئەنفلۆنزای باڵندە لە هەندێك نەخۆشی دیکە

**Differential Diagnosis**

لەبەر لەیەکچوونی نیشانەی ئەم نەخۆشییە لەگەڵ هەندێ نەخۆشیتر، پێویستە لەگەڵ ئەم نەخۆشیانەی خوارەوەدا جیابکرێتەوە:

١-نەخۆشی نیو کاسل (New castle Disease) جیادەکرێتەوە بەهۆی:

أ- نیشانەکانی بەتایبەتی نیشانەی دوای مرداربوونەوەی باڵندەکە. (P.M.E).

ب-بەهۆی تاقیکردنەوەی (HI).

٢-نەخۆشی کۆلێرا (Acute & Chronic Cholera).

٣-نەخۆشی (Chronic Respiatory Disease)

## چارەسەرکردن ( Treatment )و خۆپاراستن:

هەتاوەکو ئێستا چارەسەرێکی گونجاوی بۆ نەدۆزراوەتەوەو هەروەها ڤاکسینی ئەم نەخۆشییەش نییەو بەڵام پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەبکرێت:

یەکەم: نەهێنانی باڵندەی کێوی لە دەرەوەی وڵات بەتایبەتی لەو وڵاتانەی کەپێشتر نەخۆشییەکی تێدابڵاوبۆتەوە.

دووەم:نەهێشتنی تێکەڵ بوونی باڵندە کێوی یەکان لەگەڵ پەلەوەردا بەتایبەتی لە وەرزی کۆچ و ڕەودا.

سێیەم:بەخێوکردنی پەلەوەر لە شوێنی داخراودا.

چوارەم:بەستنی کۆڕو کۆبوونەوەی زانستی دەربارەی ئەم نەخۆشییە بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ڕادەی هۆشیاری تەندروستی.

پێنجەم: ناردنی لیژنەیەك لە پزیشکانی ڤێترینەری بۆ دەرەوەی وڵات بەمەبەستی مەشق کردن لەسەر نوێترین ڕێگە بۆ دەست نیشانکردن و چارەسەرکرنی ئەم نەخۆشییە.

**پەراوێز:**

١- ترشە ناوكی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا كەترشی (RNA) سیفەتێكی تایبەتی هەیەو ئەویش ئەوەیە كە لە هەشت پارچە پێكهاتووە.

**ئەم سەرچاوانە سوودیان لێ وەرگیراوە:**


1- Clnek, B.W., Barnes,H.J., Beard,C.W, MCDougald,L.R and saif, Y.M.(1997). Diseases of poultry. USA. 10th edition.

2- Jordan,F.T-W.,(1990). poutry Diseases. 3rd edition.England

3-Books,G-F.,Butel, J.s. and ornston, L.N.,(1995). 33Medical Microbiology. 20th edition. UK.

4- The merck Veternary Manual.

٥-مجله دواجن الشرق الأوسط وشمال افريقيا. ١٩٨٨-ژمارە (١٤٢).

٦-التشخيص السريری الأمراض الدجاج:

دكتۆر تحسين علی عبدالعزيز

دكتۆر ماجد احمد العطار

٧)رۆژنامەی هەرێمی كوردستان ژمارە: (٩٢,٩٣) رۆژی ٢٣و ١٩٩٨/٧/٣٠.

# نەخۆشی هاری سەگ
# Rabies

یەکێك لە لقەگرنگەکانی زانستی پزیشکی ڤێترنەری نەخۆشییە وبەشەکانی نێوان مرۆڤو ئاژەڵە کە لە سەرچاوە زانستییەکاندا بەشێوەیەکی گشتی پێیان دەوترێت Zoonoses ، کە بەشێوەیەکی زانستیانە لەو نەخۆشییانە د،کۆڵێتەوە کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەخۆ لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵە جۆربەجۆرەکان دەگوێزرێتەوە.

کەواتە پەیوەندییەکی گرنگ هەیە لەنێوان تەندروستی مرۆڤ وتەندروستی ئاژەڵو نەتوانین بڵێین کە ترسناکی دەردو نەخۆشییە جۆربەجۆرەکانی ئاژەڵ بۆسەر مرۆڤ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیادبوونەو هەڕەشەیەکی بەردەوامیشە بۆ سەر سەرجەم مرۆڤایەتی.

باشترین بەڵگەش بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردنی ئەو نەخۆشیانە بوو کە لە کۆتای ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا ڕوویداو کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنی جیهانی گرنگییەکی تایبەتیان پێ بەخشی لەوانەش:

نەخۆشی شێتبوونی مانگا لەنێوان مانگاکانی بەریتانیاو نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندە لە هۆنگ کۆنگ و مەترسی گواستنەوەی ئەم نەخۆشییانە بۆ مرۆڤ.

بەپێی سەرچاوە پزیشکییەکان: هەتاکو ئەم سەردەمە نزیکەی زیاتر لەدووسەد نەخۆشی هاوبەش دۆزراوەتەوە کە لە ئاژەڵەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بیرکردنەوە لە بنبڕکردن و نەهێشتنی ئەم نەخۆشییانە پێویستە لە ئاژەڵەوە دەست پێبکات چونکە ئەتوانین بڵێین هەتاکو لە ئاژەڵ بنبڕنەکرێت لە مرۆڤدا بنبڕناکرێت. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە هاوکارییەکی زانستیانە هەبێت لەنێوان پزیشکانی ڤێترنەریو پزیشکانی بەشەری لە گۆڕینەوەی زانستییە پزیشکییەکان لەبوارە جیاجیاکانداو کارکردن بەکۆمەڵ لە پێناوی

چارەسەرکردن و لە ئەنجامدا بنبڕکردنی نەخۆشی‌یە هاوبەشەکان لە مرۆڤ و ئاژەڵداو پاراستنی ژینگەی کوردستان لەم دەردونەخۆشییانە.

یەکێك لەو نەخۆشی‌یە هاوبەشانە نەخۆشی (هاری سەگ)ە کە لەکوردستان بەشێوەیەکی سەرەکی لە سەگەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

دیاردەی ڕاگرتن و بەخێوکردنی سەگ بۆ مەبەستە جیاجیاکانی ژیان لەکۆمەڵگای کوردەواری بەتایبەتی لە گوندەکاندا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە و لەم سەردەمەشدا بەخێوکردن و ڕاگرتنی سەگ لە شارەکاندا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوولەزیادبوونەو لەئەنجامدا مەترسی گواستنەوەی نەخۆشیەکانی سەگ بۆ سەر مرۆڤ ڕوولەزیادبوونە. جا لەبەر ئەوە پێویستە هاوولاتی کورد هۆشیار بکرێتەوە بە چەند زانیارییەکی پێویست دەربارەی ئەم نەخۆشی‌یە.

## هاری سەگ Rabies:

نەخۆشـییەکی ڤایرۆسـی تونـدو تیـژەو دەبێتـە هـۆی هـەوکردنی ناوەنـدی کۆئەندامەدەمار (Encephalomyelitis)، یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کە لە ئاژەڵی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ (Anthropozoonoses)

لەزووربەی وولاتانی جیهاندا بلاوەو ژمارەیەکی کەم لە وولاتان توانیویانە ئەم نەخۆشییە بنبڕبکەن . لە زووربەی ناوچەکانی جیهاندا هاری سەگ لەڕێگەی سەگی تووشـبووەوە دەگوێزرێتـەوە بـۆ مـرۆڤ وزەرەرو زیـانێکی گـەورە بەتەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت.

نەخۆشی هاری سـەگ تووشـی زووربـەی ئاژەڵـە خـوێن گەرمـەکان دەبێـت لـە ئاژەڵە گۆشت خۆرەکان و گیاخۆرەکان.

## دووجۆری سەرەکی لەم نەخۆشییە بڵاوە:

**یەکـەم:** هـاری سـەگ لەشـارەکاندا/ ئـەم جۆرەیان تووشـی سـەگەکانی ناوشـارەکان دەبێت و مەترسییەکی گەورە پێك دەهێنن بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ.

**دووەم:** هاری سەگ لە گوندەکاندا/ ئەم جۆرەیان تووشی ئاژەڵە کێوییـەکان دبێت لـە گوندەکانـدا وەکو گورگ و ڕێوی و پڵنگ و کەمتیارو بەرازی کێوی و سـەگ، مانگا و مەڕوبزن و تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن.

هەروەها شەمشەمە کوێرەش بە سەرچاوەیەکی هەمیشەیی دادەنرێت.

هەنـدێك جـاریش بـەم نەخۆشـییە دەوترێـت Hydrophobia واتـە لـەە ئاوترسان .

نەخۆشی هاری سەگ دەبێتە هۆی مرداربوونەوەی ئاژەڵ و مردنی مرۆڤ لە ـە ـی شەلەلی کۆئەندامی هەناسەدان Respiratory paralysis.

## هۆکاری نەخۆشی هاری و چۆنیەتی تووشبوون.

هۆکاری نەخۆشی هاری سەگ لەمرۆڤ و ئاژەڵدا دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسێك پێی ـوترێت Rhabdo virus کە لە جۆری RNA virus ە.

ڤایرۆسی (ڕابدۆ) مەیلێکی زۆری هەیە بۆ دەمارە خانەکان Neurotropic ـکاری نەخۆشخەرانەی خۆی تەنها لەدەمارەخانەکاندا ئەنجام ئەدات بەتایبەتی ـ ئاوەندە کۆئەندامی دەمار و لەئەنجامدا دەبێتە هۆی دروست بوونی Negri bo‌ کە بەنیشانەیەکی گرنگ دادەنرێت بەمەبەستی دیاریکردنی نەخۆشی هاری لە ـ تیکەداو جیاکردنەوەی لەنەخۆشییەکانی دیکە. تیرەی ڤایرۆسی ڕابدۆ نزکەی ـ ـ ٨٠ نانۆمیترە

تووشبوونی مرۆڤ یان ئاژەڵ بەم ڤایرۆسە بەوە دەستپێدەکات کە دوای چوونە ـژوورەوەی ڤایرۆسی ڕابدۆ بۆ ناو لەشی ئاژەڵ یان مرۆڤ لەئەنجامی گازگرتنیان ـلایەن ئاژەڵێکی تووشبووەوە (هارەوە) وەکو سەگی هار، ڤایرۆسی ڕابدۆ مەیلی ـدەمارەخانەکانی هەیەو لەڕێگەی چێوەدەمارەکانەوە Peripheral nerves بەرەو ـێشەوە دەڕوات و تا دەگاتە ئاوەندەکۆئەندامی دەمار بەتایبەتی دەماغ، لەئەنجامدا ـدەست دەکات بەدابەشبوون و زۆربوون و بڵاوەبێتەوە هەر لەڕێگەی خۆنەویستە ـدەمارەکانەوە Autonomic nerves بە لەشدا تەشەنە دەکات و دەگاتە گلاندی لیك ـڕژێنەکان Salivary glands تیایاندا جێگیردەبێت و بە شێوەیەکی بەردەوام لە ـڕێگەی لیکەوە ژمارەیەکی زۆر لە ڤایرۆسەکە دەردەدرێنە ئەو شوێنەی کە سەگی ـاری تووشبوو گازی لێدەگرێت. هەروەها ڤایرۆسی ڕابدۆ دەگاتە گورچیلەو ـسییەکان و جگەرودڵ وماسولکەکان بەگشتی و دەبێتە هۆی شەلەلی ماسولکەکانی کۆئەندامی هەناسەدان و لە ئەنجامدا مردنی مرۆڤەکە، یان مرداربوونەوەی ئاژەڵەکە.

هەندێك سەرچاوەی پزیشكی دەری خستووەكە ڤایرۆسی ڕابدۆ لە مرۆڤێكەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤێكی تر لە ڕێگەی چاندنی كۆرنیای چاوەوە.

## نیشانەكان لە مرۆڤ وئاژەڵی تووشبوودا:

### *لەمرۆڤدا:

یەكەم/ نیشانەكان بەئازارێكی توندوتیژ لە شوێنی گازگرتنەكە دەست پێدەكات و مرۆڤەكە تووشی سەر ئێشە دەبێت.

دووەم/ دوای ماوەیەك ڤایرۆسەكە دەگاتە ناوەندەكۆئەندامی دەمار(دەماغ)، مرۆڤەكە نیشانەی توڕەیی و نائارامی لەسەردەردەكەوێت.

سێیەم/ قۆناغی شەلەل دەست پێدەكات بەوەی:

- -مرۆڤەكە لە ڕووناكی دەترسێت photophobi a
- -مرۆڤەكە لەئاو دەترسێت Hydrophobi a
- -مرۆڤەكە توانای قووتدانی خواردنی نامێنێت و ئازارێكی زۆری دەبێت و لەشی دەست دەكات بەلەرزینێكی زۆرو لەئەنجامدا ڕەق بوونی ماسولكەكانی لەشی.

چوارەم/مرۆڤی تووشبوو دەخنكێنێت و هەروەها دەبێتە هۆی تێكچوونی دەنگی نەخۆشەكە لە ئەنجامی شەلەلی دەنگە ژێكان Vocal cords.

### *لەئاژەڵدا:

### یەكەم/ قۆناغی شێتبوون و توڕەبوونی ئاژەڵی تووشبوو

لەم قۆناغەدا ئاژەڵەكە توڕە دەردەكەوێت و هێرش دەكاتە سەر شتێك كە لە دەوروبەریدا هەبێت و بەشێوەیەكی ناسروشتی هەمووشتێك دەخوات و برێكی زۆرلیك دەرژێنێت كە ژمارەیەكی زۆر زۆر لە ڤایرۆسەكەی تێدایە و هەر لەبەر ئەمەش ئەم

قۆناغە بەترسناکترین قۆناغ دادەنرێت. لەدواییدا ئاژەڵەکە دەست دەکات بەڕاکردن بۆ شوێنێکی دوورو هێرش دەکاتە سەر هەموو کەسێك.

## دووەم/ قۆناغی شەلەل و مرداربوونەوە

لەم قۆناغەدا ئاژەڵی تووشبوون کپ دەبێت و لە شوێنێکدا جێگیردەبێت و لە خواردن و خواردنەوە دەکەوێت و لەئەنجامدا بەشی دواوەی تووشی شەلەل دەبێت و مرداردەبێتەوە لەئەنجامی شەلەلی ماسولکەکانی کۆئەندامی هەناسەدان.

## چۆنێتی خۆپاراستن لەم نەخۆشییە:

یەکەم/بەکارهێنانی ڤاکسینی هاری سەگ لە مرۆڤ و لە ئاژەڵدا، بەتایبەتی ئەوکەسانەی کە سەگ بەخێودەکەن و هەروەها کوتانی سەگەکانیان بەشێوەیەکی بەردەوام لە نەخۆشخانەی ڤێترینەری.

دووەم/دروستکردنی شوێنێکی تایبەت بۆ سەگەکان لەو ماڵانەی کە سەگ بەخێو دەکەن و تێکەڵ نەبوونیان لەگەڵ ئەندامانی ماڵەکان.

سێیەم/لەناوبردنی سەگ و پشیلەی بەرەڵا بەشێوەیەکی بەردەوام و سوتاندنی لاشەکانیان.

چوارەم/بڵاوبوونەوەی هۆشیاری تەندروستی لە کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنەوە و هەروەها بەستنی کۆڕو کۆبوونەوەی بەردەوام و پێکهێنانی تیمی پزیشکی بۆ سەردانی گوندەکان بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی ترسناکی نەخۆشییە هاوبەشەکان و چۆنیەتی خۆپاراستن لێیان.

پێنجەم/لەکاتی بینینی هەر ئاژەڵێك لە گوندەکان یان شارەکان کە ناسروشتیانە دەجوڵێتەوە و هێرش دەکاتەسەر ئاژەڵ و مرۆڤ، پێویستە نەخۆشخانەی ڤێترینەری بەزووترین کات لێ ئاگادار بکرێتەوە.

## سەرچاوەکان:


١-الأمراض المشتركه بين الانسان والحيوان

د.صباح العلوچي، د.عبدالحسين بيرم

2-Braunwald,E.,Isselbacher,K.J., petersdrof, R.G.,Wilson, J-D-, Martin, J-B., and Fauci,A.S., (1998). Harrison's principles of internal Medicine. 11th edition. USA.

3- Rodositis, O.M., Gay, C.G., Blood, D-G., and Hitinchiff, K-W- (2000) Veternary Medicine 9th edition. W-B- Saunders.

٤-گۆڤاری ابقار واغنام الشرق الأوسط افريقيا ژماره ٢٥/٢٠٠٠

# نەخۆشی

## تورەکەی ئاوی

## Hydatid Disease

زانستی پزیشکی ڤێترینەری بایەخێکی تایبەت دەدات بە نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤو ئاژەڵ؛ کە بەشێوەیەکی زانستی پێیان دەوترێت "Zoonoses" کە ئەو نەخۆشیانە دەگرێتەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی سروشتی دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

لەڕاستیدا چەند نەخۆشییەکی هاوبەش هەیە لەنێوان سەگو مرۆڤدا، یەکێك لەو نەخۆشیانە نەخۆشی (تورەکەی ئاوی)یە، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ ولەئەنجامدا زیانێکی گەورە بەتەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت.

لەکوردستاندا ئەم دەردە ترسناکە زۆر بڵاوە چونکە بەخێوکردنو ڕاگرتنی سەگ بەهەموو جۆرەکانیەوە بۆ مەبەستە جیاجیاکانی ژیان لەلایەن خەڵکەوە ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لەزیادبوونە...هەتا گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە لەهەندێك بۆنەو ئاهەنگدا لەلایەن هەندێك کەسەوە سەگ هەروەك دیارییەکی بەنرخ پێشکەشی یەکتری دەکەن، جالەبەر ئەوە بەپێویستم زانی هەر وەك ئەرکێکی نەتەوەیی کە چەند زانیارییەکی پزیشکی گرنگ دەربارەی ئەم نەخۆشییە پێشکەش بکەم بەهیوای بەرزکردنەوەی ڕادەی هۆشیاری تەندروستی لەنێوان گەلەکەماندا.

## هۆكاری تورەكەی ئاوی:

هۆكاری نەخۆشی تورەكەی ئاوی دەگەڕێتەوە بۆ یەكێك لەكرمە شریتیەكان كە ناوەزانستییەكەی بریتیە لە:

"Echinococcus granulosus"

كەبەقەبارە بچوكەو درێژییەكەی نزیكەی "٦ملم"دەبێت.ئاژەڵە گۆشت خۆرەكانی وەكو گورگ و ڕێوی و سەگ و پشیلە بەخانەخوێی هەمیشەیی ئەم كرمە شریتییە دادەنرێن. واتە ئەم كرمە بەشێوەیەكی سروشتی لەریخۆڵە باریكەی ئەو ئاژەڵە گۆشت خۆرانەدا دەژی و بۆ ماوەی شەش مانگێك دەمێنێتەوە. كرمی پێگەیشتوو لەسێ بەش پێك دێت سەرومل و لەش، لەشی كرمەكەش لەسێ پارچە پێك دێت و پارچەی سێیەم ژمارەیەكی زۆر هێلكەی تێدایە "

مرۆڤ ئاژەڵە گیاخۆرەكانی وەكو مەڕو بزن و مانگا و ئەسپ و حوشتر بەخانەخوێی كاتی ئەم كرمە شریتییە دادەنرێن واتە كرمەكە قۆناغێك لەقۆناغەكانی سووڕی ژیانی لەلەشی ئەم گیانەوەرەدا بەسەر دەبات و بەم قۆناغەش دەوترێت تورەكەی ئاوی (Hydatid Cyst).

دروست بوونی تورەكەی ئاوی زیانێكی گەورە بەزوربەی ئەندامەكانی لەش دەگەیەنێت بەگشتی و بەتایبەتی جگەرو سییەكان

## كورتەیەك لەسوڕی ژیانی كرمی:

## Echinococcus granulosus

كرمی پێگەیشتوو لەریخۆڵە باریكەی ئاژەڵە گۆشت خۆرەكانی وەكو سەگ دەژی و نزیكەی ماوەی شەش مانگ تیایدا دەمێنێتەوە و هەندێ جار ژمارەیان دەگاتە (٣٠-٣٦) هەزار كرم. پارچەی سێیەمی لەشی كرمەكە كە ژمارەیەكی زۆر هێلكەی تێدایە لەلەشی كرمەكە جیا دەبێتەوە لەگەڵ پاشەڕۆی ئاژەڵەكەدا دەچێتە دەرەوەی

لەش و هێلکەکان لەسەر گژوگیا بڵاودەبنەوە ئەم هێلکانە بۆ ماوەیەکی درێژ توانای مانەوەیان هەیە لەدەوروبەرداو بەرهەڵستی نالەباری ژینگەش دەکەن. مرۆڤ وئاژەڵی گیاخۆری وەك مەڕو بزن و مانگاش تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن لەڕێگەی خواردنی سەوزەو گژوگیای پیسبوو بەهێلکەی کرمەکەو لەدواییدا هێلکەکان دەگەنە ڕیخۆڵە باریکەی ئەو گیانلەبەرانەو لەئەنجامدا لەڕێگەی خوێنەوە دەگەنە زووربەی ئەندامەکانی لەش بەرەبەرە دەگۆڕێت و دەبێتە هۆی دروست بوونی تورەکەی ئاوی "Hydatid Cyst" کەزیانێکی گەورە بەئەندامی تووشبوو دەگەیەنێت، بەڕێژەی:

-٥٨٪ توشی جگەر دەبێت.

=٢٧٪ تووشی سیەکان دەبێت.

=١٥٪ توشی دڵ وگورچیلەو سپڵ و ماسولکەکان و ئێسقان و مێشك و بۆشایی سك دەبێت.

## چۆنیەتی گواستنەوەی تورەکەی ئاوی بۆمرۆڤ :-

**یەکەم//** لەووڵاتانی جیهانی سێیەمدا نەخۆشی تورەکەی ئاوی زیاتر بڵاوبۆتەوە بەتایبەتی لەناوچە کشتوکاڵییەکاندا چونکە سەگ و پشیلەو هەندێ گۆشت خۆری تر بەشێوەیەکی بەربڵاو هەیە.

**دووە//** زۆربەی ئەوکەسانەی کە توشی ئەم نەخۆشییە دەبن ئەو منداڵانەن کە یاری لەگەڵ سەگ و پشیلەدا دەکەن، نەخۆشییەکە دەگوێزرێتەوە بەهۆی پیس بوونی دەست و جل و بەرگیان بەهێلکەی کرمەکە لەبەر ئەوەی هێلکەی کرمە شریتتیە کەتوانای هەیە بەزوربەی بەشەکانی لەشی سەگەکەوە بلکێت بەتایبەتی کلك و پەلی پێشەوەو پەلی دواوە.

**سێیەم//** مرۆڤ توشی ئەم نەخۆشییە دەبێت لەڕێگەی خواردنی سەوزەی پیسبوو بەهێلکەی ئەم کرمە شریتییە.

**چــوارەم//** لەبەر بڵاووبوونەوەی بێ سنووری سەگو پشیلە لەباخچەو بێستانو کێڵگەکاندا، تورەکەی ئاوی زیاتر توشی ئەو کەسانە دەبێت کە لەم شوێنانەدا ئیش دەکەن.

## چەندئامۆژگاریەکی پێویست

**یەکــــەم//** بایەخــدان بەبڵاوکردنـــەوەی هۆشــیاری تەندروســتی لەڕێگــەی کەناڵــە جیاجیاکــانی ڕاگەیاندنــەوەو بەســتنی کــۆڕو کۆبوونــەوەی زانســتیو بەشــێوەیەکی بەردەوام دەبارەی ئەو نەخۆشیانەی کە لەئاژەڵەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ بەمەبەستی هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگای کوردەواری.

**دووەم//** ڕوونکردنەوەی ترسناکی نەخۆشی تورەکەی ئاوی لەخوێندنگاکانی شارو لادێ بەشێوەیەکی زانستیو باسکردنی ئەو نەخۆشیانەی کە لەسەگو پشیلەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

**سێیەم//** شوشتنەوەی هەمو و جۆرە سەوزەو میوەیەك بەشێوەیەکی بەردەوام پێش

**چــوارەم//** ڕێگەگرتن لەبەردەم بڵاوبونەوەی سەگی بەرەڵا لەشارەکانداو هەروەها لەهەموو بێستانو کێڵگەکانـداو ئاگادارکردنـەوەی ئەوتیمـە تایبەتانـەی هەیـە بـۆ لەناوبردنی سەگی بەرەڵا .

**پێنجــەم//** بـەهیچ شـێوەیەك جگـەرو سـی مـەڕوبزنی تووشـبوو بەتورەکـەی ئـاوی نـەدرێت بەسـەگو پشـیلەی بـەرەڵا بـەڵکو بەپێچـەوانەوە دەسـت بـەجێ ئـەو جگـەرو سییانە بسوتێنرێنو لەناو ببرێن.

**شەشەم//** ئەو سەگانەی کەلەماڵان بەخێودەکرێن، پێویستە لەماڵەکاندا شوێنێکی تایبەتی هەبێت و بەهیچ شێوەیەك بەشداری خواردن و خواردنەوەی مرۆڤ نەکات و بەلایەنی کەمەوە هەفتەی جارێك بشۆرێن و پێدانی ئەودەرمانانەی کەدبێتە هۆی نەهێشتنی کرمەکان بەگشتی و کرمە شریتیەکان بەتایبەتی و کوتانی سەگەکان دژی هەندێك نەخۆشی ترسناك کە هەڕەشەیەکی بەردەوامە لەسەر مرۆڤ.

**حەوتەم//** پێوستە بەبەردەوامی سەردانی پزیشکانی ڤێترینەری بکرێت لەلایەن خاوەن سەگەکانەوە بەمەبەستی وەرگرتنی ئامۆژگاری پێویست

## ئەوسەرچاوە زانستییانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە:-


١-Cecil Text book of Medicine=

=Mcdermott. =Beeson.

=Wyngaarden.

٢-الأمراض المشتركه بين الانسان والحيوان.

-د.صباح العلوچی. -د.عبدالحسين بيرم.

٣-گۆڤاری (الطبيب البيطري)، ژمارە (٣) ١٩٨٦.

# نەخۆشی مافەتە

## Enterotoxaemia

لەم چەند ساڵەی دوایدا زانستی ڤێترینەری کە هەروەك زانستەکانی دیکە گەلێك پێشکەوتنی خێراو فراوانی بە دەست هێناوە لەبوارە جیاجیاکانیدا ئەمەش بێ گومان دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی سامانی ئاژەڵ چونکە لەم سەردەمەدا ئاژەڵ تەنها هەروەك زیندەوەرێك سەیرناکرێت بەڵکو هەروەك یەکەیەکی ئابوری گرنگ مرۆڤ لە چەند روویەکەوە سودی لێ وەردەگرێت بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی یەکانی و هەروەها بۆ دابین کردنی ئاسایشی خۆراك. یەکێك لەو نەخۆشیانەی کەزانستی پزیشکی ڤێترنەری بەفراوانی لێی دەکۆڵێتەوە، نەخۆشی (ئینتیرۆتۆکسیمیا)ە، کەزەرەرو زیانێنێکی گەورە بەئابوری کوردستان دەگەیەنێت چونکە ساڵانە دەبێتە هۆی لەناوچونی ژمارەیەکی زۆر لە ئاژەڵو سەرەڕای ئەمەش هۆکارێکە بۆ پیسبوونی ژینگەی کوردستان. جا لەبەرئەوە روونکردنەوەی لایەنە جیاجیاکانی ئەم نەخۆشییە بۆ خوێنەران کارێکی پێویستە بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ڕادەی هۆشیاری زانستی.

## مافەتە

نەخۆشییەکی زۆر بڵاوە لە کوردستان، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریایەك کەپێی دەوترێت کلۆستردیۆم (Clostridium) توشی زۆربەی جۆرەکانی ئاژەڵ دەبێت و بەتایبەتی تووشی ئاژەڵی سپی دەبێت واتە (مەڕوبەرخ وبەران)، هەروەها مرۆڤیش تووشی چەند نەخۆشی یەك دەکات. ئەم نەخۆشییە زیاتر لە وەرزە ساردەکاندا تەشەنە دەکات و زیان بە تەندروستی ئاژەڵ دەگەیەنێت لەنا و خەڵکدا بەم نەخۆشییە دەوترێت (مافەتە) و لە هەندێك ناوچەی دیکەدا پێی دەوترێت (نەخۆشی کتوپڕ) و لە هەندێك شوێنی دیدا پێی دەوترێت (لەرزە).

هۆکاری نەخۆشی مافەتە هۆکاری نەخۆشی مافەتە. بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لەبەکتریا ناوە زانستییەکەی:-( Clostridium perfringens)

-ئەم بەکتریایە لەژینگەدا بڵاوبۆتەوە لەخاك و خۆڵ و ئاودا هەیە و بەشێوەیەکی سروشتی لەڕیخۆڵەی ئاژەڵە کێوی و ماڵییەکاندا دەژین و گەشە دەکەن و هەروەها لەڕیخۆڵەی مرۆڤیشدا هەن.

-بۆ یەکەم جار لەلایەن زانا (Welchi)وێلشای لەساڵی ١٩٨٢ دا دۆزرایەوە و ناوی نێنرا Clostridium Welchi و لەدوایدا لەلایەن زانایان فیلون و زویر بووبە Clostridium perfringens . ئەم بەکتریایە بەقەبارە گەورەیە و لەناوەندێکی بێ ئۆکسجیندا (anaerobic) گەشە دەکات و زۆر دەبێت و دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی ژەهرێکی بەهێزو ترسناك کەپێی دەوترێت (Exotoxins) کە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی نەخۆشی ئینتیرۆتۆکسیمیا لەمرۆڤیشدا دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی خۆراك و کارێکی خراپ دەکاتە سەر تەندروستی گشتی، کەواتە ئەم بەکتریایە دەبێتە هۆی نەخۆشی لەئاژەڵ و مرۆڤدا.

## -جۆرەکان و نەخۆشیەکان:

هۆکــاری نەخۆشـــی ئینترۆتۆکســـیمیا <u>perfringens</u> <u>Clostridium</u> بەشـێوەیەکی گشـتی چـەند جـۆرێکی هەیـە لەوانـەش (A,B,C,D,E)، نەخۆشـی ئینترۆتۆکسیمیاکۆمەڵێك نەخۆشی دەگرێتەوە، کەهەر نەخۆشیەش جۆرێکی تایبەت دروستی دەکات و لەونەخۆشیانەش:

١-نەخۆشـی "Lamb dysentry" کەبـەهۆی جـۆری "B" تووشـی زیـاتر ئـاژەڵی بچوك دەبێت وەکو بەرخ دەبێتە هۆی سکچوونێکی کوشندە لەئەنجامی ژەهـراوی بوونی خوێن (Toxemia).

٢- نەخۆشی "Struck" کەبەهۆی جۆری "C" تووشی ئاژەڵی گەورە دەبێت وەکو مەڕ دەبێتە هۆی مرداربوونەوەی کتوپڕو لەناکاودا بەبێ هیچ نیشانەیەك.

٣-نەخۆشـی "pulpy Kidney" کەبـەهۆی جـۆری "D" تووشـی ئـاژەڵی گـەورەو بچووك (مەڕوبەرخ) دەبێت.

ژەهــراوی بـوونی خـوێن (Toxemia) یـەکێکـە لەخەسـڵەتە گرنگـەکانی ئـەم نەخۆشـیانە، واتـە نەخۆشـییەکانی سـەربە ئینترۆتۆکسـیمیا لەئـەنجامی ژەهـری (Exotoxin) بـەکتریای کلۆسـتردیۆم دروسـت دەبێـت، ژەهرەکـانی ئـەم بەکتریایـەش جـۆراو جـۆرن لەوانـە: (ژەهـری ئـەلفا، ژەهـری یۆتـا،ژەهری‌بێتـا) وکاریگـەری نەخۆشخەرانەی بەهێزیان هەیە لەسەر تەندروستی ئاژەڵ و دەبنـەهۆی لەکارخستنی زۆربەی ئەندامەکانی لەشیان.

## نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکە:

نەخۆشـی مافەتـە تووشـی زۆربـەی ئاژەڵـەکان دەبێـت، زیـاتر تووشـی ئـاژەڵی سپی دەبێت، لەنیشانە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشیە ئاژەڵی تووشبوو بەشێوەیەکی کتـوپڕ واتـە لـەناکاودا مـردار دەبێتـەوە (Sudden death) بـەبێ ئـەوەی هـیچ نیشـانەیەکی لەسـەر دەرکـەوێت و هـەر لەبـەر ئەمـەش لەهەنـدێ ناوچـەی کوردسـتاندا

## مافەتە

نەخۆشییەکی زۆر بڵاوە لە کوردستان، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریایەك کەپێی دەوترێت کلۆستریدیۆم (Clostridium) تووشی زۆربەی جۆرەکانی ئاژەڵ دەبێت و بەتایبەتی تووشی ئاژەڵی سپی دەبێت واتە (مەڕوبەرخ وبەران)، هەروەها مرۆڤیش تووشی چەند نەخۆشی یەك دەکات. ئەم نەخۆشییە زیاتر لە وەرزە ساردەکاندا تەشەنە دەکات و زیان بە تەندروستی ئاژەڵ دەگەیەنێت لەناو خەڵکدا بەم نەخۆشییە دەوترێت (مافەتە) و لە هەندێك ناوچەی دیکەدا پێی دەوترێت (نەخۆشی کتوپڕ) و لە هەندێك شوێنی دیدا پێی دەوترێت (لەرزە).

هۆکاری نەخۆشی مافەتە هۆکاری نەخۆشی مافەتە. بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لەبەکتریا ناوە زانستییەکەی:-( Clostridium perfringens)

-ئەم بەکتریایە لەژینگەدا بڵاوبۆتەوە لەخاك و خۆڵ و ئاودا هەیە و بەشێوەیەکی سروشتی لەڕیخۆڵەی ئاژەڵە کێوی و ماڵییەکاندا دەژین و گەشە دەکەن و هەروەها لەڕیخۆڵەی مرۆڤیشدا هەن.

-بۆ یەکەم جار لەلایەن زانا (Welchi)وێلشای لەساڵی ١٩٨٢ دا دۆزرایەوە و ناوی لێنرا Clostridium Welchi و لەدوایدا لەلایەن زانایان فیلون و زویر بووبە Clostridium perfringens . ئەم بەکتریایە بەقەبارە گەورەیە و لەناوەندێکی بێ ئۆکسجیندا (anaerobic) گەشە دەکات و زۆر دەبێت و دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی ژەهرێکی بەهێزو ترسناك کەپێی دەوترێت (Exotoxins) کە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی نەخۆشی ئینتیرۆتۆکسیمیا لەمرۆڤیشدا دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی خۆراك و کارێکی خراپ دەکاتە سەر تەندروستی گشتی، کەواتە ئەم بەکتریایە دەبێتە هۆی نەخۆشی لەئاژەڵ و مرۆڤدا.

## -جۆرەکان و نەخۆشیەکان:

هۆکــاری نەخۆشــی ئینترۆتۆکســـیمیا Clostridium perfringens بەشـێوەیەکی گشـتی چـەند جـۆرێکی هەیـە لەوانـەش (A,B,C,D,E)، نەخۆشـی ئینترۆتۆکسیمیاکۆمەڵێك نەخۆشی دەگرێتەوە، کەهەر نەخۆشیەش جۆرێکی تایبەت دروستی دەکات و لەونەخۆشیانەش:

١-نەخۆشـی "Lamb dysentry" کەبـەهۆی جـۆری "B" تووشـی زیـاتر ئـاژەڵی بچوك دەبێت وەکو بەرخ دەبێتە هۆی سکچوونێکی کوشندە لەئەنجامی ژەهـراوی بوونی خوێن (Toxemia).

٢- نەخۆشی "Struck" کەبەهۆی جۆری "C" تووشی ئاژەڵی گەورە دەبێت وەکو مەڕ دەبێتە هۆی مرداربوونەوەی کتوپڕو لەناکاودا بەبێ هیچ نیشانەیەك.

٣-نەخۆشـی "pulpy Kidney" کەبـەهۆی جـۆری "D" تووشـی ئـاژەڵی گـەورەو بچووك (مەڕوبەرخ) دەبێت.

ژەهــراوی بــوونی خــوێن (Toxemia) یەکێکـە لەخەسـڵەتە گرنگـەکانی ئـەم نەخۆشـیانە، واتـە نەخۆشـییەکانی سـەربە ئینترۆتۆکسـیمیا لەئـەنجامی ژەهـری (Exotoxin) بـەکتریای کلۆسـتردیۆم دروسـت دەبێـت، ژەهرەکـانی ئـەم بەکتریایـەش جـۆراو جـۆرن لەوانـە: (ژەهــری ئــەلفا، ژەهــری یۆتــا، ژەهری بێتــا) وکاریگــەری نەخۆشخەرانەی بەهێزیان هەیە لەسـەر تەندروسـتی ئاژەڵ و دەبنـەهۆی لەکارخسـتنی زۆربەی ئەندامەکانی لەشیان.

## نیشانە دیارەکانی نەخۆشیەکە:

نەخۆشـی مافەتـە تووشـی زۆربـەی ئاژەڵـەکان دەبێـت، زیـاتر تووشـی ئـاژەڵی سپی دەبێت، لەنیشانە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشیە ئاژەڵی تووشبوو بەشـێوەیەکی کتـوپڕ واتـە لـەناکاودا مـردار دەبێتـەوە (Sudden death) بـەبێ ئـەوەی هـیچ نیشـانەیەکی لەسـەر دەرکـەوێت و هـەر لەبـەر ئەمـەش لەهەنـدێ ناوچـەی کوردسـتاندا

پێی دەوترێت نەخۆشی کتوپڕو زیاتر لەمانگەکانی پایزو زستاندا دەست پێدەکات. بەڵام ئەو ئاژەڵانەی کەتوانای مانەوەیان هەیە بۆ چەند ڕۆژێك ئەم نیشانانەیان لەسەر دەردەکەوێت:

- ئاژەڵی تووشبوو زۆر دەلەرزێت، هەر لەبەر ئەمەش لەهەندێك ناوچەدا پێی دەوترێت نەخۆشی بەلەرزە.
- بێهێز دەبێت و توانای خواردنی نامێنێت.
- نیشانەی ئازاری سکی پێوە دیارەو توانای نامێنێت بەپێوە بوەستێت.
- تووشی سکچوونێکی توندوتیژ دەبێت و دوای ماوەیەکی کورت مردار دەبێتەوە.
- لەنیشانە دیارەکانی دوای مرداربوونەوەی ئاژەڵی تووشبوو کەبەهۆکارێکی سەرەکی دادەنرێت بۆ دیاریکردنی نەخۆشییەکە لەلایەن پزیشکانی ڤێتێرنەرییەوە:
- ریخۆڵەکانیان بەشێوەیەکی گشتی سوور هەڵدەگەڕێت و زۆر قەبارەیان گەورە دەبێت لەئەنجامی کۆبوونەوەی بڕێکی زۆر لەگاز تیایاندا.
- بوونی بڕێکی زۆر لەشلە لەناو بۆشایی سکدا (ناوبەند).
- بوونی ژمارەیەکی زۆر لەپەڵەی خوێن لەسەر ماسولکەکانی دڵ.
- گورچیلەکانیان زۆر نەرم دەبێت هەروەکو هەویری لێدێت (بەتایبەتی ئەو نەخۆشییەی کەپێی دەوترێت Pulpykidny

## =خۆپاراستن و چارەسەرکردن:

- باشترین رێگەچارە بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی مافەتە بەکارهێنانی ڤاکسینە (Vaccination)، کەسالانە دووجار بەکاردێت ئەم ڤاکسینە لەژەهری بەکتریاکەوە ئامادە دەکرێت پێی دەوترێت "Toxoid" واباشترە کە ڤاکسینەکە ئامادەکرابێت لە هەموو جۆرەکانی بەکتریای کلۆستردیۆم.
- پێدانی دژە ژیانەکانی وەکو (نیومایسن) لەرێگەی دەمەوە.

## سەرچاوەکان


1-Al- Khatib, G, (1985). Colstridium Perfringens and its Diseases in Man and animals.

2-The Merck Veterinary Manual. 1998.

پێی دەوترێت نەخۆشی کتوپڕو زیاتر لەمانگەکانی پایزو زستاندا دەست پێدەکات. بەڵام ئەو ئاژەڵانەی کەتوانای مانەوەیان هەیە بۆ چەند ڕۆژێك ئەم نیشانانەیان لەسەر دەردەکەوێت:

- ئاژەڵی تووشبوو زۆر دەلەرزێت، هەر لەبەر ئەمەش لەهەندێك ناوچەدا پێی دەوترێت نەخۆشی بەلەرزە.
- بێهێز دەبێت و توانای خواردنی نامێنێت.
- نیشانەی ئازاری سکی پێوە دیارەو توانای نامێنێت بەپێوە بوەستێت.
- تووشی سکچوونێکی توندوتیژ دەبێت و دوای ماوەیەکی کورت مردار دەبێتەوە.
- لەنیشانە دیارەکانی دوای مرداربوونەوەی ئاژەڵی تووشبوو کەبەهۆکارێکی سەرەکی دادەنرێت بۆ دیاریکردنی نەخۆشییەکە لەلایەن پزیشکانی ڤێتێرنەرییەوە:
- ریخۆڵەکانیان بەشێوەیەکی گشتی سوور هەڵدەگەڕێت و زۆر قەبارەیان گەورە دەبێت لەئەنجامی کۆبوونەوەی بڕێکی زۆر لەگاز تیایاندا.
- بوونی بڕێکی زۆر لەشلە لەناو بۆشایی سکدا (ئاوبەند).
- بوونی ژمارەیەکی زۆر لەپەڵەی خوێن لەسەر ماسولکەکانی دڵ.
- گورچیلەکانیان زۆر نەرم دەبێت هەروەکو هەویری لێدێت (بەتایبەتی ئەو نەخۆشیەیەی کەپێی دەوترێت **Pulpykidny**

## =خۆپاراستن و چارەسەرکردن:

- باشترین ڕێگەچارە بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی مافەتە بەکارهێنانی ڤاکسینە (Vaccination)، کەسالانە دووجار بەکاردێت ئەم ڤاکسینە لەژەهری بەکتریاکەوە ئامادە دەکرێت پێی دەوترێت "Toxoid" واباشترە کە ڤاکسینەکە ئامادەکرابێت لە هەموو جۆرەکانی بەکتریای کلۆستردیۆم.
- پێدانی دژە ژیانەکانی وەکو (نیومایسن) لەڕێگەی دەمەوە.

## سەرچاوەکان

1-Al- Khatib, G, (1985). Colstridium Perfringens and its Diseases in Man and animals.

2-The Merck Veterinary Manual. 1998.

# نەخۆشی

## کرمی جگەر یان پەپولە

## Hepatic Fascioliasis

زانستی "مشەخۆرزانی parasitology" ئەو زانستەیە کە بەشێوەیەکی فراوان لەمشەخۆرە ناوەکی و دەرەکییەکان دەکۆڵێتەوە لەکرمەکان بەهەموو جۆرەکانییەوەو لەمشەخۆرەکانی خوێن و هەروەها مشەخۆرە جومگەدارەکان. کرمە مشەخۆرەکان (Helminth parasite) لەڕووی پزیشکییەوە گرنگییەکی تایبەتیان هەیەو لەزانستی پزیشکی ڤێتێرنەریدا بەچڕوپڕی لەجۆرەکانی دەکۆڵێتەوەو کاری نەخۆشخەرانەی بۆ سەر تەندروستی ئاژەڵ و مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە. کرمی جگەر...یەکێکە لەو کرمانەی سالآنە زەرەرو زیانێکی گەورە بەتەندروستی ئاژەڵ و خاوەن ئاژەڵ و هەروەها ئابووری وڵاتیش دەگەیەنێت.

### *نەخۆشی کرمی جگەریان پەپولە:

نەخۆشی کرمی جگەر لەکوردەواریدا پێی دەوترێت پەپولەو لەهەندێك ناوچەی دیکەدا پێی دەوترێت (مەیتولە)و لەسەرچاوە زانستییەکانیشدا چەند ناوێکی هەیە لەوانە:

-Liver Fluke.

-Fluke Disease.

- نەخۆشی کرمی جگەر نەخۆشییەکی هاوبەشە لەنێوان مرۆڤ وئاژەڵدا ، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ کرمێك کە پێی دەوترێت فاشیۆلا : "Fasciola hepatica" کە

شێوەکەی لەگەڵای دار دەچێت و فەبارەی گەورەیە و بەچاو دەبینرێت و درێژییەکەی دەگاتە ٢-٣ سم و پانییەکەی نزیکەی ١سم دەبێت.

کرمی جگەر تووشی زۆربەی ئاژەڵەماڵییەکان و کێوییەکان دەبێت و زیاتر مەڕومانگا بەسەرچاوەی نەخۆشییەکە دادەنرێت.

- شوێنی هەڵبژێراوی کرمی فاشیۆلا لەلەشی ئاژەڵدا لەجگەردایە و بەتایبەتی لەجۆگەلەکانی زراودا دەژین و گەشەدەکەن و دەبنە هۆی هەوکردنی جۆگەلەکانی زراو "Cholangitis" و هەروەها گیرانی جۆگەلەکانی زراو "Biliary obstruction" و تێک چوون و تێك شکاندنی شانەکانی جگەر ، ئەمەش وادەکات کە کرمی جگەر زۆر ترسناکتر بێت لەنەخۆشی بەلهارزیا لەئاژەڵ و مرۆڤدا.

## قۆناغەکانی سوڕی ژیانی فاشیۆلا:

زانیاری دەربارەی سوڕی ژیانی فاشیۆلا و شارەزابوون لەقۆناغەکانی بەکارێکی پێویست دەزانرێت و لەلایەن پزیشکانی ڤێتێرنەرییەوە گرنگی پێ دەدرێت و بەمەبەستی بەرهەڵستی کردنی و دژایەتی کردنی کرمی جگەر و کەم کردنەوەی زیانەکانی لەسەر سامانی ئاژەڵ.

سوڕیژیانی فاشیۆلا بەوەدەست پێدەکات کە ئاژەڵی تووشبوو (مەڕومانگا) لەڕێگەی پاشەڕۆوە ژمارەیەکی زۆر لەهێلکە پیتێنراوەکان فڕێ دەدرێنە دەرەوەی لەشی ئاژەڵەکە و دەکەونە سەر گژوگیای لەوەڕگەکان و کەناری ڕووبار و کانیاو و دەریاچەکان، لەدواییدا هێلکەکان دەترووکێن و زیندەوەرێکی سەرەتایی دروست دەبێت کەپێی دەوترێت (Miracidia کۆ) یان (Miracidium تاك)میراسیدیۆم لەدواییدا ئەم زیندەوەرە سەرەتایییە بۆ تەواوکردنی قۆناغەکانی ژیانی دەچێتە ناو لولپێچەوە (بەخانە خوێنی ناوەندی دەژمێرێت) تیایدا گەشەدەکەن و دەگۆڕدرێن بۆ ریدیاو ئەویش دەگۆڕدرێت بۆ سەرکاریا و سەرکاریا لەلەشی هێلکە شەیتانۆکەکەدا دێتە دەرەوە و کە لەسەرو کلك پێکهاتوە و دوای ئەمەش سەرکاریا بەگژو گیاوە دەلکێت و پێی دەوترێت میتا سەرکاریا کە توانای تووشکردنی ئاژەڵ و مرۆڤی هەیە و

دەگاتە ریخۆڵەکان و لەدوایدا لەجگەردا جێگیر دەبێت و پێگەیشتوو دەبێت و جارێکی دی سوڕی ژیانی دووبارە دەبێتەوە.

## -نیشانەکانی نەخۆشیەکە :

- -نیشانەکانی نەخۆشی کرمی جگەر بەشێوەیەکی ڕوونو دیار لەسەر مەڕی تووش بوو دەردەکەوێت .

١-شێوەی توندی نەخۆشی یەکە " Acute Form " مرداربونەوەی کتوپڕی ئاژەڵی تووشبوو "Sudden death" بەبێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی لەسەر دەرکەوێت بەگرنگترین ڕووداوی ئەم شێوە توندە دادەنرێت ،بەلام ئەگەر ئاژەڵەکە مایەوە ئەوا بێ هێزو لاوازو لە لەوەڕ دەکەوێت وئازارێکی توندی پێوەدیارەو لەماوەی ٤٨ کاتژمێردا مردار دەبێتەوە .

٢-شێوەی ژێر توند: Subacute form

کێشی مەڕی تووشبووکەم دەکات و نیشانەی کەم خوێنی پێوە دیارەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەڕو لاواز دەبێت

٣-شێوەی درێژخایەن: " Chronic form "

لەهەموو شێوەکانی دی زیاتر دیارترو باوترە ، کێشی ئاژەڵە کە زۆر کەم دەکات و لەڕو لاوازدەبێت و دروستبونیئاوبەند لەژێر قورگی مەڕەکەدا ( submandibular oedema )کەبەگرنگترین نیشانە دادەنرێت .

- هەندێك جاریش ئاژەڵی تووشبوو تووشی سکچوون دەبێت و هەروەها بەرهەمی شیری زۆر کەم دەکات.
- تووشی کەم خوێنی دەبێت لەئەنجامی ئەوەی کەکرمی جگەر توانای مژینی خوێنی هەیە.
- خوری مەڕی تووشبوو ڕەنگی دەگۆڕێت و هەڵدەوەرێت.

- ئەم شێوەیە٢-٣ مانگێك دەخایەنێت و لەدواییدا ئاژەڵەكە مرداردەبێتەوە.

- لەئەنجامی تێكشكاندنی شانەكانی جگەر لەلایەن كرمی جگەرەوە دەبێتە هۆی ڕێگە خۆشكەرێك بۆ تووشبوون بەنەخۆشی **Infections necrotic hepatitis** (كەهۆكەی بەكتریای **clostridium novyi**

## چارەسەركردن و خۆپاراستن:

- قەڵاچۆكردنی خانە خۆێی ناوەندی واتە لول پێچ ، (هێلكە شەیتانۆكە ) ، بەرێگەی سەرەكی دادەنرێت بۆ خۆپاراستن لەبڵاوبوونەوەی كرمی جگەر.

- بەخێوكردنی ئاژەڵ لەشوێنی پاكوخاوێندا، ئەمەش دەبێت لە ئەنجامی پاك كردنەوەی پاشەرۆی ئاژەڵ بەشێوەیەكی بەردەوام و كۆكردنەوەی لەشوێنی تایبەتدا بۆ ماوەیەكی دیاریكراو بەمەبەستی لەناوبردنی هێلكەی مشەخۆرەكە.

- پاكردنەوەی هەمووسەوزەیەك پێش بەكارهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە بەهۆی بەكارهێنانی مادەیەكی پاكژكەرەوە.

- ئەو دەرمانانەی كە بەكاردەهێنرێت بۆ چارەسەركردنی نەخۆشی كرمی جگەر لەوانە:

" كلۆزانتیل –ڕافۆكسانایدـ ألبندازول –اوكسی كلۆزەنایدـ"

## سەرچاوەکان:


1- **Rodositis, O.M., Gay, C.G., Blood, D-G., and Hitinchiff, K-W- (2000) Veternary Medicine 9th edition. W-B- Saunders.**

"Veterinary Medicin" 1979.

٢-علم الادويه والسموم البيطرية ١٩٨١

د.على عزيز الخياط    د عيسى شحاته

دحنيفه مرسى    د.عبدالرزاق عبداللطيف

٣- علم الطفيليات البيطرية الجزء الاول

د.بهجت الجنابى    د. صباح العباسى

# نەخۆشی لاڕەشە

# Black Leg

سامانی ئاژەڵ لەکوردستان بەسامانێکی نەتەوەیی گرنگ دادەنرێت بەوەی کە پایەیەکی سەرەکی ئابوری کوردستان پێك دەهێنێت و هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کوردستان بەپیشەی ئاژەڵدارییەوە خەریکن بەتایبەتی لە گوندەکاندا. هەر لە دوای ڕاپەڕینە مێژووییەکەی گەلی کوردیش لە ساڵی ۱۹۹۱ و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ئاوەدانکردنەوەی شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستان لە هەموورووییەکەوە، سامانی ئاژەڵیش لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە گەشەکردنێکی لەبەرچاوی بەخۆوەبینی، هاوکات لەگەڵ ئەم گەشەکردنەدا هەمیشە دەردەدو نەخۆشییەکان هەڕەشە لەئاژەڵی بێزمان دەکەن یەکێك لەو نەخۆشیانە نەخۆشی لاڕەشەیە کە تووشی ئاژەڵەکان دەبێت و لاوازو بێهێزیان دەکات و لەئەنجامدا زەروزیانێکی گەورە بەسامانی ئاژەڵ و ئابوری وڵات دەگەیەنێت، بەشێوەیەك کە نەخۆشی "لاڕەشە" سامانی ئاژەڵ بەرەو دواڕۆژێکی ڕەش ئاراستەدەکات...جالەبەرئەوە بڵاوکردنەوەی چەند زانیارییەکی پێویست دەربارەی "لاڕەشە" هەوڵدانێکە بۆدابین کردنی دواڕۆژێکی گەش وڕووناك بۆ ئەو سامانە نەتەوەییە گرنگە.

# نەخۆشی "لاڕەشە" Black leg:

- کوردەواریدا پێی دەوترێت"لاڕەشە"و لە وولاتە عەرەبییەکاندا پێی دەوترێت الجمرة العرضية يان (مرض الساق الاسود) نەخۆشی لاڕەشە تووشی ڕەشە وڵاخ لە گاو مانگاو گوێرەکە دەبێت بەپلەی یەکەم و هەروەها تووشی مەڕومالاّت و وولاّخە بەرزەیش دەبێت، ئاژەڵی تەمەن بچوك زیاتر بەدەستی نەخۆشییەکەوە دەناڵێنێت بەتایبەتی لە تەمەنی شەش مانگ بۆ دووساڵ (٦مانگ-٢ساڵ)

نەخۆشی لاڕەشە تووشی ئەو شوێنانە دەبێت لە لەشی ئاژەڵی توشبوو کە ماسولکەی بەهێزو ئەستوری تێدایە چونکە دەبێتە هۆی هەوکردنی ماسولکەکان (Myositis)و ڕەنگی ماسولکە ڕەش هەڵدەگەڕێت و هەر لەبەر ئەم ڕەش هەڵگەڕانی ماسولکەیەش بەنەخۆشی یەکە دەوترێت لاڕەشە چونکە لەیەکێك لە پەلەکانی ئاژەڵەکەدا دەردەکەوێت. نەخۆشی لاڕەشە لە وەرزەکانی بەهار هاوین و پاییزدا زیاتر لەنێوان ڕەوشەووڵاخدا تەشەنەدەکات و لەمانگە گەرمەکانی ساڵیشدا بڵاودەبێتەوەو ڕادەی لەناوچوون دەگاتە ١٠٠٪

## هۆکاری نەخۆشی لاڕەشە:

نەخۆشی لاڕەشە نەخۆشییەکی بەکتریییە، واتە هۆکاری نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریایەك کە پێی دەوترێت کلۆستردیۆم: clostridium chauvoei (feseri)

- لە خەسڵەتەکانی ئەم بەکتریایە:
- لەجۆری:- Gram Positive

- سپۆر دروست دەکات و بەکتریاکە بەهۆیەوە بۆ چەند ساڵێك توانای مانەوەی هەیە بە چالاکی و بەرگری لەخۆی دەکات لە دژی بارودۆخی نالەباری دەوروبەر.

- بەکتریای کلۆستردیۆم بەشێوەیەکی سروشتی لە خاك و خۆڵدا هەیە لەڕێگەی کۆئەندامی هەرسەوە دەچێتە ناو لەشی ئاژەڵی تووشبووەو لە ئەنجامی دروستبوونی ژینگەیەکی گونجاو گەشە دەکات و زۆر دەبێت ئەویش بەنەمانی گازی ئۆکسجین لەناوەندەکەدا چونکە ئەم بەکتریایە سەربە کۆمەڵەی کلۆستردیایە کە بەبێ بوونی گازی ئۆکسجین گەشە دەکەن و چالاك دەبن، بەتایبەتی لەکاتی بوونی برینێك بەلەشی ئاژەڵەکەوە، بەکتریاکە بەهەل دەزانێت و دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی بڕێکی زۆر لە ژەهرو بڵاوبوونەوەی بە هەموو شانەو خانەکانی لەشیداو کە هەندێك جار دەبێتە هۆی مرداربونەوەی لەناکاوی ئاژەڵی توشبوو لەئەنجامی هەوکردنی توندی ماسولکەی دڵ. Cardiac myositis

## -چۆنیەتی گواستنەوەی نەخۆشی لاڕەشە:

- بەکتریای نەخۆشی لاڕەشە بەشێوەیەکی سروشتی لە ژینگەی ئاژەڵدا هەیەو بەهۆی سپۆرەکەیەوە بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەچالاکی دەمێنێتەوەو لەڕەشە وولاخدا بەهۆی کۆئەندامی هەرسەوە تووش دەبێت و نەخۆشییەکە بڵاودەبێتەوە، لە مەڕومالات دا بەهۆی برینەوە نەخۆشییەکە دەگوێزرێتەوە بەتایبەتی لەکاتی خوری برینەوەو کلك بڕین هەروەها لەکاتی زایینی ئاژەڵی ئاوسدا، یاخود لەکاتی شەڕکردنی بەرانەکانداو هەندێك جاریش نەخۆشی لاڕەشە بڵاودەبێتەوە لە ئەنجامی کوتانی مەڕومالات بەڤاکسینی نەخۆشی مافەتە ( Enterotoxamia

## نیشانەکانی نەخۆشی لارەشە

### یەکەم/لەرەشەوولاخدا:

- نەخۆشییەکە لەناکاودا بەوە دەست پێدەکات کە ئاژەڵی تووشبوو بێ هێزولاواز دەبێت و لە لەوەڕ دەکەوێت و کاوێژ ناکات
- پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵەکە بەرزدەبێتەوەو دەگاتە (٤١ پ•س)و ڕێژەی لێدانی دڵ لەخولەکێکدا دەگاتە (١٠٠-١٢٠) جار
- ئاژەڵی تووشبوو بەشیوەیەکی دیار دەشەلێت.
- پەلی تووشبوو لە ئاژەڵەکەدا بەشێوەیەکی دیار دەئاوسێت، لەسەرەتادا ئاوساوییەکە گەرمو بەئازارەو لەدواییدا بەرە بەرە شوێنەکە سارد دەبێت و ئازاری نامێنێت لەکاتی دەست لێداندا و ڕەنگی پێستەکە دەگۆڕێت و ووشك دەبێتەوە.
- نەخۆشی لارەشە بەشێوەیەکی کتوپڕ دەردەکەوێت و لەدوای (١٢-٣٦) کاتژمێر لە دەرکەوتنی نیشانەکان ئاژەڵی تووشبوو مردار دەبێتەوەو هەندێك جار ئاژەڵەکە مردار دەبێتەوە بەبێ دەرکەوتنی هیچ نیشانەیەك.

### دووەم/ لەمەروماڵاتدا:

- مەڕی تووشبوودەشەلێت و لە ڕۆیشتندا هاوسەنگی تێك دەچێت و بەملاو ئەولادا دەکەوێت.
- پەلی توشبوو لەمەڕدا ئاوساوی پێوە دیارنییە بەڵام ڕەنگی پێستەکەی دەگۆڕێت.
- لە لەوەڕو کاوێژکردن دەکەوێت و پلەی گەرمی لەشی بەرزدەبێتەوە.
- لە کاتی بوونی بریندا ئەو شوێنە هەودەکات و دەئاوسێت.

## سێیەم/ لەووڵاخەبەرزدا:

نیشانەکان لە ئەسپی تووشبوودا زۆر بەئاشکرا دەرناکەون هەندێك جار ئاژەڵەکە دەشەلێت و ڕۆیشتنەکەی ناهاوسەنگ ای پێوەدیارە.

## -نیشانەکانی دوای مرداربوونەوەی ئاژەڵی توشبوو:

لەگرنگترین نیشانەکانی دوای مرداربونەوە ئەوەیە پەلی توشبوولەکاتی برینیدا ماسولکەکەی ئاوساوەو ڕەش هەڵگەڕاوە بۆنێکی ناخۆشی لێدێت و شلەیەکی تێدایە کە بڵقی گازی پێوە دیارە کە بەشێوەیەك کەف دەکات.

(Emphys sema)

هەروەها بۆشایی سنگی ئاژەڵەکە بڕێکی زۆر لەشلەی خوێناوی تێدایەو دەمو لوتی ئاژەڵکە شلەیەکی کەفاوی لێدێتە خوارەوە.

## -چارەسەرکردن و کۆنترۆڵ کردنی:

یەکەم/ ئاژەڵی تووشبوو چارەسەر دکرێت بەبەکارهێنانی دەرمانی ( Penicillin antibiotic)و هەروەها مامەڵەیەکیً ئەشتەرگەرییانە دەکرێت لەگەڵ پەلی توشبوو.

دووەم/ئاژەڵی مردارەوەبوو بەنەخۆشی "لاڕەشە" پێویستە بسوتێنرێت و بەیەکجاری لەناو ببرێت.

سێیەم/بۆ کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی "لاڕەشە" پێویستە ساڵانە پرۆسەی کوتان Vaccination لەلایەن تیمەکانی ڤێتێرنەریەوە ئەنجام بدرێت بەم شێوەیە:

- لەڕەشەووڵاخ دا: لەتەمەنی (٣-٦) مانگ هەموو ئاژەڵەکان بکوترێن و دوای مانگێك دووبارە بکرێتەوە.

- لەمەڕومالاّتدا: پێش زایینی ئاژەڵەکان بەمانگێک بگوترێن و لەدواییدا سالاّنە دووبارە بکرێتەوە، هەروەها پێش خوری برینەوەی ئاژەڵەکان بکوترێن کارێکی باشە.

## سەرچاوەکان:


1- Rodositis, O.M., Gay, C.G., Blood, D-G., and Hitinchiff, K-W- (2000) Veternary Medicine 9th edition. W-B- Saunders.

2-صحة الحيوان ١٩٨٢

- -الدكتور محمود عبالرحمن متولي

- - الدكتور عبدالمعز احمد اسماعيل

3-The Merck Veterinary Manual.

# نەخۆشی

# کۆلێرای باڵندە

# Fowl Cholera

هەروەك چۆن نەخۆشی کۆلێرا لە مرۆڤدا زەرەرو زیانێکی گەورە بەتەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت کە تووشی سکچوونێکی بەردەوامو لەش ووشك بوونەوەی دەکات. بەهەمان شێوەش نەخۆشی کۆلێرای باڵندە یەکێکە لەونەخۆشییانەی کە زەرەوزیانێکی گەورە بەسامانی پەلەوەرو باڵندە دەگەیەنێتو لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کەم بونەوەی گۆشتی سپی لەبازاڕەکاندا چونکە باڵەندە بەشێوەیەکی گشتی لە مریشكو قەلوقازومراوی بە سەرچاوەیەکی گرنگی گۆشتی سپی دەژمێرێت کە رێژەیەکی باش پرۆتینی تێدایە..لەبەرئەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە کارێکی پێویستە.

نەخۆشی کۆلێرای باڵندە نەخۆشییەکی زۆر بڵاوەو لە هەموو وولاتێکی جیهاندا هەیە و تووشی باڵندەی ماڵی دەبێت لە مریشكو قەلوقازومراویوهەروەها تووشی باڵندەی کێویش دەبێتو دەبێتە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆر لێیان، لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری چەند ناوێکی دیکەی هەیە لەوانە:

1-Avian Cholera

2-Avian Pasteurellosis

3-Avian Hemorrhagic SeptiCaemia

بەپێی سەرچاوەکان نەخۆشی کۆلێرای باڵندە زیاتر لە کۆتایی وەرزی هاوینو پاییزو زستان لەناو باڵندەدا بڵاو دەبێتەوەو تەشەنە دەکاتو سەلمێنراوە کە قەل

وەك باڵندەیەكی ماڵی لە باڵندەكانی دی زیاتر هەستیارترە بۆنەخۆشییەكەو مریشكی پێگەیشتووش لە مریشكی تەمەن پچوكیش هەستیارترە.

## كورتەیەكی مێژوویی:

بۆیەكەم جار لەوڵاتی فەرەنسا لەلایەن زانا (Chabert) لەساڵی (١٧٨٢ز)و زانا(Mailet) لەساڵی (١٨٣٦)ئەم نەخۆشییە ناوبرا (كۆلێرای باڵندە)و زانا Huppe لەساڵی ١٨٨٦ز ناوی نا (Hemmorragic septicemia) و لەساڵی ١٩٠٠ز (Lignieres) ناوی نا (Avian pasteurellosis). لەساڵی ١٨٥١ (Benjamin) وەسفێكی زانستیانەی باشی نەخۆشی كۆلێرای باڵندەی كرد.

- لەساڵەكانی ١٨٧٧و١٨٧٨ز هەردوو زانایان Perroncito و Semmer لەڕوسیا توانیان تێبینی هۆكاری نەخۆشییەكە بكەن كە بەكتریایەكەو سەلماندیان كە شێوەی خڕی هەیە.
- پاستۆریش توانی هۆكاری نەخۆشی كۆلێرای باڵندە دیاری بكاتو هۆكارەكەی بەكاربهێنێت لە تاقیكردنەوەكانیدا بەمەبەستی پرۆسەی كوتاندنو دروستبوونی بەرگری.

## هۆكاری نەخۆشی كۆلێرای باڵندە:

هۆكاری نەخۆشی كۆلێرای باڵندە دەگەڕێتەوە بۆ بەكتریایەك كە پێی دەوترێت Pasteurella multocida لە سیفەتە گرنگەكانی ئەم بەكتریایە:

- لەكۆمەڵەی (G-) بەكتریای نەگەتیڤی ڕەنگی گرام.
- توانای جوڵەی نییە.
- توانای دروستكردنی سپۆری نییە.

- –تواناى گەشەكردنى هەيە بەبون و نەبوونى ئۆكسجين.
- –تواناى گەشەكردنى هەيە لە (٣٧پ.س)
- –بۆ دەرمانى دژە ژيانى كۆمەڵەى پەنسلين زۆر هەستيارە.
- –تواناى دروستكردنى كەپسولى هەيە.
- –توندوتيژى (Virulence) بەكترياكە بەندە لەسەر جۆرى بەكترياكە (Strain) و جۆرى خانەخوێكەو بارودۆخى بڵاوبونەوەى نەخۆشييەكە.
- –تواناى بەرهەم هێنانى ژەهرى هەيە لەجۆرى (Endotoxin) كە ڕۆڵێكى سەرەكى هەيە لەتوندوتيژى نەخۆشييەكە لە باڵندەدا، كە لە ڕووى كيمياييە وە پێكهاتووەلە (Phosphorylated lipo-polysaccharide).

## خانەخوێى نەخۆشى كۆلێراى باڵندەو چۆنيەتى نەخۆشبوون (pathogenesis):

نەخۆشى كۆلێراى باڵندە هەروەك شۆڕشى نەخۆشى لە جيهاندا بڵاودەبێتەوە بەتايبەتى لە نيوەى دووەمى سەدەى هەژدەيەم دا لە ئەوروپا زيانێكى زۆر گەورەى بەباڵندەوپەلەوەرى ئو كيشوەرە گەياند. نەخۆشى كۆلێراى باڵندە تووشى باڵندەى وەكو قەل و مريشك و قازومراوى دەبيت و هەروەها تووشى جۆرەكانى ديكەى باڵندەش دەبيت وەكو باڵندەى نێچيرو باڵندە يارەكان و باڵندە كێوييە جۆربەجۆرەكان.

پەلەوەڕ بەشێوەيەكى گشتى تووشى نەخۆشى كۆلێراى باڵندە دەبن و لە پێشى هەموويانەوە قەل بە هەموو تەمەنەكانەوە لە جۆرەكانى ديكەى پەلەوەڕ هەستيارترە بۆ نەخۆشييەكەو تاقيكردنەوەكان سەلماندويانە كە بەكترياى نەخۆشى كۆلێراى باڵندە دەبێتە هۆى لەناوچوونى ٩٠–١٠٠٪ى قەل پێكەيشتوو لەماوەى (٤٨) كاتژمێردا.

لەمریشکدا نەخۆشییەکە زیاتر تووشی تەمەنە گەورەکان دەبێت وەك لەتەمەن پچە کەکان و مریشکی خوار تەمەنی شازدە هەفتە زیاتر بەرهەڵستی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە دەکات و کەمتر هەستیارترە بۆ بەکتریای نەخۆشییەکە.

قازومراویش لەو باڵندانەن کە زۆر هەستیارن بۆ نەخۆشی کۆلێرای باڵندەو دەبێتە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆر لەو باڵندانەو هەندێك جار دەگاتە (٥٠٪).

باڵندە ئاوییەکان و باڵندەکانی باخچەکانی ئاژەڵیش هەستیارن بۆ نەخۆشی کۆلێرای باڵندەو سالآنە زەرەروو زیانێکی گەورەیان پێدەگات بەتایبەتی لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

گەلێك فاکتەر رۆڵی گرنگی هەیە لە بڵاوبونەوەو تەشەنەکردنی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە لەنێوباڵندەکاندا:

١-فاکتەری ژینگە هەروەك گۆرانی کتوپڕ لە ئاووهەوای دەوروبەردا.

٢-خۆراك: کەمی خۆراك هۆکارێکی رێگە خۆشکەرە بۆ بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە.

٣-جۆری خانەخوێ کە (جۆری باڵندەی تووشبوو).

٤-جۆری بەکتریاکە (ئاستی توندوتیژی بەکتریاکە).

٥-ئاستی بەرگری لەشی باڵندەکە.بەکتریای نەخۆشی کۆلێرای باڵندە لە کۆئەندامی هەناسەی باڵندەکەوە تووشی باڵندە دەبێت و زیاتر لە لینجە پەردەی گەرووەوە یان بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسەوە دەچێتە لەشی باڵندەکەوە یان هەندێك جار لە رێگەی پەردەی پیلووی چاوی باڵندەکەوە یان لە رێگەی پێستی برینداروە دەچێتە لەشی باڵندەکەوەو لەدواییدا بەرەبەرە بەهەموو لەشدا بڵاودەبێتەوەو دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی هێندێکی زۆر لە ژەهری (Endotoxin) کە کاردەکاتە سەر هەموو کۆئەندامەکانی لەشی باڵندەکەو مردنی شانەو خانەکانی لەش و مرداربونەوەی باڵندەکە.

# نیشانەکان (Signs):

نەخۆشی کۆلێرای باڵندە بەشێوەیکی سەرەکی دووشێوە نەخۆشی هەیە :

## یەکەم/شێوەی تیژ (Acute form)

زۆرجار باڵندەی توشبوو لەم شێوەیەدا بە مردارەوەبوی دەبینرێت واتە لە نیشانە سەرەکییەکانی شێوەی تیژی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە، باڵندەکە کتوپڕ مرداردەبێتەوە،بەلاّم هەندێك جار چەند نیشانەیەك لەسەر باڵندەی توشبوو دەبینرێت پێش مرداربونەوەی بەچەند کاتژمێرێك لەوانەش:

- پلەی گەرمی لەشی باڵندەی تووشبوو بەرزدەبیتەوە.
- لەخواردن دەکەوێت و کێشی کەم دەکات.
- پەڕەکانی زۆر گرژ دەبێت و کزدەبێت.
- ئاو لەدەمی باڵندەکە دێتەخوارەوە.
- تووشی سکچون دبێت و ڕیقنەی شل دەبێت و ڕەنگی سەوزبا و دەبێت.
- بەخێرایی هەناسە دەدات.
- پێش مرداربونەوەی باڵندەکە سەری باڵندەکە بە تایبەتی پۆپنە و گوارەی باڵندەکەشین هەڵدەگەڕێت (Cyanosis).
- ئەو باڵندانەی توانای بەرهەڵستی کردنیان هەیە بەلاوازی دەمێننەوەو لەشیان ووشك دەبێتەوە.

## دووەم/شێوەی درێژخایەن Chronic form:

ئەم شێوەیەی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە لە دوای شێوەی تیژی نەخۆشیەکەوە دەست پێدەکات یان بەهۆی تووشبوونی باڵندەکە بە جۆرێك لە بەکتریاکە کەمتر توندوتیژبێت (Low virulence).

نیشانەکانی ئەم شێوەیەی نەخۆشییەکە زیاتر جێگەییە واتە تووشی بەشێك لەلەشی باڵندەکە دەبێت وەکو ئەوەی دەبێتە هۆی ئاوسانی گوارەی باڵندەکە یان لاقەکانی یاخود جومگەی باڵەکانی یان ژێر پێی باڵندەکە.

- هەندێك جار تووشی هەناسە توندی دەبێت.
- پەردەی پیلوی چاوی باڵندەکە هەودەکات.
- سەری باڵندەکە دەسوڕێت ( Torti Collis ).
- لە نیشانە دیارەکانی دوای مرداربونەوەی باڵندەی توشبوو، بەشێوەیەکی گشتی ئەندامەکانی لەشی سوور هەڵدەگەڕێت ( Hyperima )و جگەری باڵندەکە بە قەبارە گەورە دەبێت.

## گواستنەوەی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە:

باڵندەی توشبوو لەنەخۆشی کۆلێرای باڵندە لە شێوەی درێژخایەن (Chronically infected birds) بەسەرەکیترین سەرچاوەی گواستنەوەی نەخۆشییەکە دادەنرێت لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی، و بەپێی سەرچاوەکان هەڵگری نەخۆشییەکە لەباڵندەی بەتەمەن توانای هەڵگرتنی بەکتریای نەخۆشییەکەی هەیە بۆ ماوەی ساڵێك کە ئەمەش بێگومان بە سەرچاوەی بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە دادەنرێت.

- هەندێك لە ئاژەڵەکانی وەك مانگاو مەڕو بەراز دەبێتە هۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە چونکە توانای هەڵگرتنی میکرۆبەکەیان هەیە.

- بەهۆی مێش و مەگەزەوە دەگوێزرێتەوە.
- بەهۆی مرۆڤەوە نەخۆشییەکە دەگوێزرێتەوە.
- بەهۆی ئاوی پیس بووە دەگوێزرێتەوە.

دیاریکردنی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە:

دیاریکردنی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە بەندە لەسەر:

- مێژووی نەخۆشییەکە.
- نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکە.
- بەهۆی تاقیگەوە.

## چارەسەرکردن و کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشیەکە:

نەخۆشی کۆلێرای باڵندە بەهۆی بەکارهێنانی دژە ژیانەکان (Antibiotics) وە چارەسەر دەکرێت وەکو سیتریتۆماسین یان پەنسلین یان کلۆرتتراسایکلین، هەروەها بەکارهێنانی (Antibacterial Chemotherapy) وەکو سلفۆنەماید (Sulfonamides)، و زۆر بکارهێنانی ئەم دەرمانانە بەبەردەوامی دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەکتریای نەخۆشییەکە توانای بەرگریکردنی (Resistance) لەلا دروست دەبێت.

مەبەستی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی کۆلێرای باڵندە پێویستە رێوشوێنێکی زانستیانە بگیرێتە بەر بۆ بەخێوکردنی پەلەوەر لەبەرێوەبردن و پاك و خاوێن راگرتنی پێویستییەکانی هۆڵی بەخێوکردن و جیاکردنەوەی ئەو پەلەوەرانەی کەتووشی نەخۆشییەکە بوون.

لەهەندێك وولاتــی جیهانـدا پەلــەوەرەكان دەكـوترێن بـە ڤاكسـینی نەخۆشــی كۆلێرای باڵندە.

## سەرچاوەكان:

1-Calnek,B.W, Barnes, H.j, Beard, C.W, Mcdougald, L.R, and [1]Saif, Y.M (1997.) .

Diseases of poultry. 10th editicn. USA

2- التشخيص السريري لامراض الدجاج

- -د. تحسين على عبدالعزيز

- -د.ماجد احمد العطار

- Jordan, F.T.W, (1990) poulty Diseases. 3rd edition. England

# نەخۆشی سپڵ

# Anthrax

دۆزینـەوەی هۆکـارە نەخۆشـخەرەکان لـە سـەردەمە جیاجیاکـانی مێـژوودا بـەقۆناغێکی گـرنگ دادەنرێـت لـە مێـژووی پێشـکەوتنی زانسـتی پزیشـکیدا ، ئـەم کارەش بێگومـان بەشـێوەیەکی گشـتی لەخزمـەتی مرۆڤایـەتی دابـووە کـە بۆتـە هـۆی درێژبوونـەوەی تەمـەنی مـرۆڤ لەسـەر ڕووی ئـەم سـەرزەمینە، بـەڵام لـەم سـەردەمەدا هەنـدێك لەتیرۆریسـتان ئـەم پێشـکەوتنەی کـە بەدەسـت هـاتووە لـەبواری زانسـتی پزیشـکی و مایکرۆبـایۆلۆژی دا دەقۆزنـەوەو هۆکـارە نەخۆشـخەرەکان هـەروەك چەکێکی بایۆلۆژی لە دژی مرۆڤایەتی و ئاوەدانی بە کاری دەهێنن و هـەوڵ دەدەن کە تەمـەنی مـرۆڤ کـورت بکەنـەوە لەبەرئـەوەی چـاویان بەپێشـکەوتن و شارسـتانیەت و کۆمەڵگای مەدەنی هەڵنایەت.

یـەکێك لـەو هۆکـارە نەخۆشـخەرانە، هۆکـاری نەخۆشـی ئەنسراکسـە کـە لـە بەرنامـەی هەنـدێك ڕژێـم و لایـەنی تیرۆریسـتدایە وەك چـەکێکی بـایۆلۆژی گەشـەی پێبـدەن و ئامـادەی بکـەن و لەئەنجامـدا بـەکاری بهێـنن لـەدژی مرۆڤایـەتی، چـونکە نەخۆشـی ئەنسـراکس نەخۆشـییەکی ترسـناك و کوشـندەیە و تووشـی مـرۆڤ وئـاژەڵ دەبێـت و زەرەرو زیـانێکی گـەورە بەتەندروسـتی ئـاژەڵ و مـرۆڤ و ئـابووری وڵات و ژینگـە دەگەیـەنێت... لەبەرئـەوە بڵاوکردنـەوەی زانیـاری دەربـارەی نەخۆشـی ئەنسراکس لە کۆمەڵگای کوردەواری بەکارێکی پێویست دادەنرێت چونکە دوژمنانی کورد هەمیشە لە بەرنامەیاندا بووەکە چەکی بایۆلۆژی لەدژی بەکاربهێنن.

# نەخۆشی ئەنسراکس Anthrax:

نەخۆشی ئەنسراکس نەخۆشییەکی بەکتیرییە کە لە هەموو وولاّتانی جیهاندا بەشێوەیەکی گشتی هەیەو لە کوردستانیشدا بەتایبەتی، ئەم نەخۆشییە تووشی ئاژەڵی ماڵیو ئاژەڵی کێوی دەبێت بەتایبەتی ئاژەڵە گیاخۆرەکان وەکو مانگاو مەڕو ئەسپو بزنو ئێسترو بەرازو هەروەها لە ئاژەڵی تووشبووە بەڕێگەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ .

نەخۆشی ئەنسراکس لە کۆمەڵگەی کوردەواری پێی دەوترێت ((نەخۆشی سپڵ))و لە هەندێك ناوچەی دیکەدا پێی دەوترێت نەخۆشی ((ئەسکەڵەپیسە یان ئاگرەی زمان))و عەرەبیش پێی دەڵێن (( الجمرة الخبيثة))و لەهەندێك سەرچاوەی پزیشکیدا بە (Splenic Fever) ناودەبرێت.

هۆکاری نەخۆشی ئەنسراکس دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێکی بەکتریا کە پێی دەوترێت Bacillus anthracis لە ساڵی ١٨٧٧ز بۆیەکەم جار ڕۆبرت کوخ کاری لەسەرکردووەو گەشەی پێ کردووە، ئەم بەکتریایە چەند خەسڵەتێکی تایبەتیو گرنگی هەیە لەوانەش:

- لەکۆمەڵەی ($G^+$) بەکتریایە.
- بەقەبارە گەورەیەو درێژییەکەی نزیکەی (3-5Mm)و پانییەکەی نزیکەی (1-1.2 Mm) دەبێت
- توانای دروست کردنی سپۆری (Spores) هەیە کە بەهۆیەوە بۆماوەیەکی دوورودرێژ لەژینگەدا بەچالاکی دەمێنێتەوە کە بەرهەڵستی هەموبارێکی ناهەموار دەکاتو لەهەموو بارو دۆخێکدا توانای تووشکردنی هەیە.

- توانای گەشەکردنی هەیە بە بوونو نەبوونی گازی ئۆکسجین.
- لەشێوەدا زۆر لە بەکتریای (Bacillus Cereus) دەچێت کە لە خاكو خۆڵدا هەیە کە پەیوەندی بەژەهراوی بوونی خۆراکەوە هەیە.
- توانای دروستکردنی کەپسولی (Capsul e)ی هەیەو پێکهاتووە لەمادەی:
- (poly-Deglutamate polyptide) و فەرمانەکەی بریتییە لە پارێزگاریکردنی بەکتریاکەیە لە خوێنی خانەخوێ لەدژی بەرگرییە خانەکانی لەش، و ئەم کەپسولە لە تاقیگەدا بەهۆی تاقیکردنەوەی: (Mcfadyean reaction)ەوە دەست نیشان دەکرێت.
- بەکتریای ئەنسراکس توانای بەرهەم هێنانی ژەهری هەیە (Anthrax) کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسێ جۆر پێکهاتووە:

## یەکەم: فاکتەری یەکەم کە پێی دەوترێت:

(Edema Factor= EF)

پێکهاتووەلە (Inherent adenylate cyclase) ئەم ژەهرە دەبێتە هۆی دروست بونی ئاوبەند لەلەشدا.

## دووەم: فاکتەری دووەم کە پێی دەوترێت:

(Protective Antigen=PA)

دەبێتە هۆی پاراستنی بەکتریاکە.

## سێیەم: فاکتەری سێیەم پێی دەوترێت:

(Lethal Factor=LF)

ئەمە ژەهرێکی ترسناك و کاری گەرییەکی کوشندەی هەیە.

- دوای دەرچوونی بەکتریاکە لەگەڵ خوێنی ئاژەڵی تووشبوو یان کردنەوەی لاشەی ئاژەڵی مرداربوو، بەکتریاکە یەکسەر سپۆر دروست دەکات بەمەبەستی بەرهەڵستیکردنی بارودۆخی ناهەمواری ژینگە.

## -چۆنیەتی دروستبونی نەخۆشی Anthrax Pathogenesis

ئاژەڵە گیاخۆرەکانی وەکو مانگا و مەڕو ووڵاخە بەرزە تووشی نەخۆشی ئەنسراکس دەبن بەهۆی لەوەڕاندنیان لەو لەوەڕگایانەی کە سپۆری بەکتریای نەخۆشییەکەی تێدابڵاوبۆتەوە بەتایبەتی ئەو لەوەڕگایانەی کە ساڵانی پێشووتر بوەتەهۆی تووشبونی ئاژەڵەکان و مرداربونەوەیان.

توندوتیژی و کاری نەخۆشخەرانەی (Pathogenecity) بەکتریای ئەنسراکس دەگەڕێتەوە بۆ سێ لایەن لەپێکهاتەی بەکتریاکە:

یەکەم:کەپسولی بەکتریاکە.

دووەم: ژەهری (Edema Factor).

سێیەم: ژەهری(Lethal Factor).

یەککگرتنی ئەم سێ لایەنە ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە لە دروست بوونی نەخۆشییەکە لەکاتی توشبووندا بەتایبەتی لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا کە کار دەکاتە سەر بەرگری یەخانەکانی ئاژەڵی تووشبوو کە کەپسولەکەی دەی پارێزێت ت لە پرۆسەی (Phagocytosis) بەمەش بەکتریاکە لەشوێنی تووشبوندا گەشە دەکات و دابەش دەبێت ژمارەکەی زیاد دەکات و لەڕێگەی بەرگرییە خانەکانەوە (Phagocytes) دەگوێزرێتەوە بۆ بەشەکانی دیکەی کە بەهۆی ژەهرەکانییەوە دەبێتە هۆی پەك کەوتنی بەرگری خانەکان و بڵاوبونەوەی خێرای بەکتریاکە لەڕێگەی خوێنەوە بەهەموو لەشدا لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی بڕێکی زۆر لە

ژەهـرو نەخۆشخسـتن و توشـبوونی ئەندامـە زینـدووەکانی لـەش و لەناوچـوونی نەخۆشەکە.

## چۆنیەتی گواستنەوەی نەخۆشی ئەنسراکس:

بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشی ئەنسراکس دەگوازرێتەوە بەهۆی:

یەکـەم/ لـەوەرگای تووشـبوو بەسـپۆری بەکتریاکـە بـە خـاك و خۆڵ وگـژوگیا وئاوی پیسبوو بەسپۆری بەکتریا نەخۆشییەکە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاژەڵ و تووشی نەخۆشی دەکات.

دووەم/ کۆئەندامی هەناسـەدانەوە: بەهۆی تۆزو خۆڵـەوە سپۆرەکان هەڵدەمژرێن و لەم رێگەیەوە مرۆڤ و ئاژەڵ تووشی نەخۆشی ئەنسراکس دەبن.

سێیەم/ بەهۆی مێش و مەگەزەوە دەگوێزرێتەوە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە.

## نیشانەکانی نەخۆشی ئەنسراکس:

مـاوەی تووشـبوونی ئـاژەڵ بەنەخۆشـییەکەو هـەتاکو دەرکـەوتنی نیشـانەکان نزیکەی (١-٢)هەفتە دەخایەنێت.

## نەخۆشی ئەنسراکس لە مانگا و مەڕدا دووشێوەی هەیە:

### یەکەم: شێوەی سەروتیژ Peracute

- ئەم شێوەیەی نەخۆشـییەکە زۆر توندوتیـژەو زۆر بـڵاوە بەتایبـەتی لـە سـەرەتای تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە زۆربەی ئاژەڵەکان بەمردارەوەبویی دەبینرێن بەبێ هیچ نیشانەیەك کەماوەی (١-٢) کاتژمێر دەخایەنێت.

دوای ماوەیـەك ئاژەڵـە مرداربووەکـە خـوێنێکی ڕەنـگ ڕەشـی قـیری نەمـەیوی (UnCoagulated,dark,tarry) لـــــە هـــــــەموو دەرچــــــەکانی لەشــــــەوە (دەم ولوت وکۆم وزێ)وەدێتە دەرەوە کە ئەمە بەنیشانەیەکی تەشخیسی دادەنرێت.

## دووەم:شێوەی تیژ Acute

- ئەم شێوەیەی نەخۆشییەکە نزیکەی (٤٨) کاتژمێر دەخایەنێت.
- پلەی گەرمی لەشی بەرزدەبێتەوە کە دەگاتە (٤٢پ.س)و ئاژەڵەکە تووشی هەناسە بڕکێ و هەناوەکوتێ دەبێت و بێهێزو لاواز دەبێت و لە لەوەڕدەکەوێت.
- ئاژەڵی ئاوس بەردەخات.
- بەرهەمی شیر کەم دەکات و هەندێك جار شیرەکە تێکەڵ بەخوێن دەبێت.
- تووشی سکچوونی خوێناوی دەبێت.

## -نەخۆشی ئەنسراکس لەووڵاخە بەرزەدا (ئەسپ):

نیشانەکانی نەخۆشی ئەنسراکس لەووڵاخە بەرزەدا جیاوازە وەك لەنیشانەکانی لە مانگا و مەڕدا، لە ئەسپدا زیاتر دەبێتە هۆی دروست بوونی ئاوبەندی ژێر پێست.

(Edematous, Subcutaneous Swelling) لەناوچەی قوڕگ و گەرووی ئاژەڵەکەو هەروەها لەژێر چەناگەو کەبێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئاژەڵەکە نەتوانێت خواردن قوت بدات و بەرەبەرە لە ڕولاواز دەبێت.

هەندێك جار ژێرسکی ئاژەڵەکە دەئاوسێت و بە ئازاردەبێ پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵەکەش بەرزدەبێتەوە. لەسالانی ڕابردوودا ئەم نەخۆشییە لە کوردستاندا تێبینی کراوە کە بڵاوبۆتەوەو تەشەنەی کردووەو ئەم نیشانانەی باسکران بینراون لەناوچەی قەڵادزێ-ڕانیە-سەیدسادق-پێنجوێن-..هتد لە ئەنجامدا بۆتە هۆی گەیاندنی زەرو زیانێکی گەورە بەسامانی ئاژەڵی ناوچەکە.

## -نیشانەکانی دوای مرداربونەوەی ئاژەڵی تووشبوو:

لەکاتی دیاریکردنی نەخۆشی ئەنسراکس لەسەر لاشەی ئاژەڵی مردارەوەبوو، واباشترە کە لاشەی ئاژەڵەکە دەستکاری نەکرێت و بەهیچ شێوەیەك نەکرێتەوە.

- هەروەك باسکرا کە خوێنێکی نەمەیوی ڕەنگ ڕەشی قیری لەدەم و لوت و کۆم وزێی ئاژەڵەکەوە دێتە دەرەوە.
- قەبارەی سپڵی ئاژەڵەکە زۆر گەورە دەبێت و دەئاوسێت و نەرم دەبێت (Splenomegaly) کە ئەمەش بە نیشانەیەکی دیاری دوای مرداربەنەوە دادەنرێت و هەر لەبەر ئەمەش لەهەندێك ناوچەی کوردستاندا بەم نەخۆشییە دەڵێن. نەخۆشی (سپڵ)
- زۆربەی ئەندامەکانی لەش لەدڵ و گورچیلە و جگەر و سییەکان سوورهەڵدەگەڕێن و دەئاوسێن و نەرم دەبن.
- دیاردەی ماسولکەگرژە (Rigor mortis) لەسەر لاشەی ئاژەڵی تووشبوویە ئەنسراکس نابینرێت.
- -لاشەکە بەشێوەیەکی گشتی دەئاوسێت.

## -نەخۆشیی ئەنسرا کس لەمرۆڤدا :

نەخۆشی ئەنسراکس نەخۆشیەکی هاوبەشە لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا (Zoonosis) واتە نەخۆشییەکە لە ئاژەڵەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە.

## -نەخۆشی ئەنسراكس لە مرۆڤدا سێ شێوەی هەیە:

### یەکەم/شێوەی پێست (Cutaneous Anthrax).

- بڵاوترین شێوەیانە کە زیاتر لە مرۆڤدا دەردەکەوێت و لەئەنجامی برینداربون و ڕووشانی پێستی مرۆڤ و تووشبونی بەسپۆری بەکتریای نەخۆشییەکە لە خاك و خۆڵ یان لەلاشەی ئاژەڵی تووشبووە دەچێتە لەشی مرۆڤەوە و لەسەر پێستی برینێك دروست دەبێت کە لەشێوەی بڵقدایە لەدوای (١٢-٣٦) کاتژمێر بەمەش دەوترێت (Malignant Pustule) واتە برینێکی پیس هەر لەبەر ئەمەشە بە نەخۆشییەکە دەڵێن (ئەسکەڵە پیسە).

دوای چەند ڕۆژێك گرێ لیمفاوییەکانی لەش بەگشتی گەورەدەبن و لە تۆناغەکانی کۆتایدا بەکتریاکە لە ڕێگەی خوێنەوە بە هەموو لەشدا بڵاودەبێتەوە و لەئەنجامدا دەبێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە.

- -ئەم شێوەی نەخۆشییە کە زیاتر تووشی پزیشکانی ڤێترینەری و قەساب و خاوەن ئاژەڵەکان دەبێت.

### دووەم/ شێوەی هەناسە (Inhalation Anthrax)

هەربەهۆی ئەم شێوەی نەخۆشییە کە پێشی دەوترێت:

(Wool Sorter's disease) واتە زیاتر تووشی ئەوکەسانە دەبێت کە پێستە خۆش دەکەن و خوری ئەشۆنەوە کە بەهۆی سورشتی کارەکەیانەوە لەڕێگەی هەڵمژینی سپۆری بەکتریاکەوە تووش دەبن و بەرە بەرە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش و ئازارێکی توندیش لەسنگ دا پەیدادەبێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش نەخۆشییەکە زیاتر پەرەدەسێنێت وهەموو لەش دەگرێتەوە و دەبێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە.

## سێیەم/شێوەی گەدەوریخۆڵە: (Gastrointestinl Anthrax)

ئەم شێوەیەی نەخۆشییەکە زیاتر تووشی ریخۆڵەی مرۆڤ دەبێت لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی نەکولاوی ئاژەڵی توشبووە پەیدا دەبێت و زیاتر لەوولاتە هەژارەکاندا بلاوەو لە وولاتە پێشکەوتووەکاندا بەدەگمەن هەیە.

## -دیاریکردنی نەخۆشی ئەنسراکس (Diagnosis)

لەکاتی دیاریکردنی تەواوی نەخۆشی ئەنسراکس بەهۆی مێژووی نەخۆشییەکەو نیشانە دیارەکانی لەسەر ئاژەڵی تووشبووی مردارەوەبوو واباشترە کە لاشەی ئاژەڵەکە نەکرێتەوە چونکە لەکاتی کردنەوەی دا بەکتریای نەخۆشییەکە بەهەوادا بلاودەبێتەوەو یەکسەر سپۆر دروست دەکەن و بەرهەڵستی ژینگە دەکەن و لەئەنجامدا دەبێتە هۆی سەرچاوەی نەخۆشییەکەو ناوچەی بلاوبونەوەی فراوانتر دەبێت.

- بەکتریاکە دەستنیشان دەکرێت بەهۆی تاقیکردنەوەی تاقیگەییەوە.

## چارەسەرکردن و کۆنترۆڵکردنی ئەنسراکس:

چارەسەرکردنی ئاژەڵی تووشبوو بەنەخۆشی ئەنسراکس کارێکی ئاسان نییە، بەلام لەقۆناغە سەرەتاییەکانی نەخۆشییەکە کاتێك پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵەکە بەرز دەبێتەوە دەتوانرێت بەهۆی بەکارهێنانی دەرمانەکانی دژە ژیانەکان (Antibiotics) وەکو کۆمەڵەی پنسلین و ستریپتۆمایسن ونۆکس تتراسایکلین زیانەکان کەم بکرێتەوە، بەهەمان شێوە لە مرۆڤی تووشبوودا دەتوانرێت بە بەکارهێنانی دژە ژیانەکانی پەنسلین و تتراسایکلین و (Fluoroquinolones) فلۆروکواینۆلین کە توندوتیژی نەخۆشییەکە کەم بکرێتەوە بەتایبەتی شێوەی پێستی نەخۆشییەکە لەمرۆڤدا بەلام لەشێوەی هەناسەی نەخۆشییەکە ئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت.

بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشییەکە پێویستە رەچاوی ئەم خالانەی خوارەوە بکرێت:

یەکەم/پێویستە ساڵانە بەپێی پرۆگرامێکی داڕێژراو لەلایەن نەخۆشخانەی ڤێتێرنەرییەوە ئاژەڵەکانی ناوچەکە ڤاکسین بکرێن و بکوترێن بەڤاکسین نەخۆشی ئەنسراکس و هەروەها کوتانی ئەوکەسانەی کە ئاژەڵ بەخێودەکەن و قەساب و ئەوانەی پێستە خۆش دەکەن و خوری ئەشۆرنەوە لەگەڵ پزیشکانی ڤێتێرینەری و پزیشکانی بەشەری و ئەو کارمەندانەی لەتاقیگەکاندا کاردەکەن.

دووەم/ لەکاتی بڵاوبونەوەی نەخۆشی ئەنسراکس پێویستە یەکسەر ئاژەڵە نەخۆش و تووشبووەکان جیابکرێنەوە و بخرێنە شوێنێکی تایبەتەوە و هەوڵ بدرێت بە دژە ژیانەکان چارەسەربکرێن.

سێیەم/ کەمکردنەوەی هاتوچۆی بازرگانی و قەدەغەکردنی گواستنەوەی ئاژەڵ لەسەر سنورەکان لەکاتی بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە.

چوارەم/ دانانی شوێنی دابڕینی پزیشکی (quarantne) لەسەر سنورەکان و کارپێکردنیان بەشێوەیەکی توندوتۆڵ.

پێنجەم/قەلاچۆکردنی مێش و مەگەز بەبەردەوامی.

شەشەم/سوتان ولەناوبردنی لاشەی ئاژەڵی تووشبووبە یەکجاری و خستنە ناوچاڵی قوڵەوە و داپۆشینی.

حەوتەم/پەیوەندیکردن بە بەووڵاتانی دراوسێ وە بە مەبەستی گۆڕینەوەی زانیاری پێویست لەسەربڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە.

هەشتەم/ بەکارهێنانی مادەی پاکژکەرەوە لە گەوڕەکانی ئاژەڵ و پاککردنەوەو ڕاگرتنی پاکوخاوێنی شوێنی ئاژەڵەکان بەبەردەوامی.

نۆیەم/بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی نەخۆشی ئەنسراکس لە کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنەوە و ڕوونکردنەوەی مەترسییەکانی نەخۆشییەکە لەسەر تەندروستی مرۆڤ وئاژەڵ و ژینگە.

دەیەم/پێکهێنانی لیژنەی هاوبەش لەنێوان پزیشکانی ڤێترینەری و پزیشکانی بەشەری و کارمەندانی تەندروستی و هەڵسان بەگەڕان بەنێوگوندنشینەکاندا بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی مەترسی وترسناکی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ بەگشتی و نەخۆشی ئەنسراکس بە تایبەتی لەسەر تەندروستی گشتی و ژینگە.

## -نەخۆشی ئەنسراکس و چەکی بایۆلۆژی:

لەم ماوەی دواییدا کەناڵە جیاجیاکانی جیهانی بەگرنگییەوە باسی چەکی کۆکوژ دەکەن بەتایبەتی لەکاتی هەڵمەتی سەربازی لە پێناو ڕزگارکردنی گەلی عیراق لە چنگ ڕژێمی بەعس لەعیراقدا، بەپێی هەندێك سەرچاوە دەرکەوتووە ڕژێمی بەعسی عێراق یەکێکە لەو ڕژێمە دڕندانەبووە کە هەوڵی داوە چەکی کۆکوژ و بەتایبەتی چەکی بایۆلۆژی گەشەی پێبدات و ئامادەی بکات و لەئەنجامدا لەدژی نەیارانی بەکاری بهێنێت هەروەك چۆن چەکی کیمیاوی بەکارهێنا لەکوردستان و بەتایبەتی لەشاری هەڵەبجە.

هۆکاری نەخۆشی ئەنسراکس (Bacillus anthracis) یەکێکە لەسەرەکیترین چەکی بایۆلۆژی کە ڕژێمی بەعسی عیراق پارەیەکی زۆری بۆتەرخان کردبوو بەمەبەستی ئامادەکردن و بەکارهێنانی ئەویش بەهەڵگرتنی سپۆری بەکتریاکە بەهۆی ڕۆکێتەوەیان فڕۆکەوە و بڵاوکردنەوەی لەهەر ناوچەیەکدا کە مەبەستی بێت.

سپۆری بەکتریای ئەنسراکس دەتوانرێت ئامادە بکرێت و بەرهەم بهێنرێت و هەڵبگیرێت لەشێوەی ووشکدا (Dry Form) و لەگەڵ پارێزگاریکردن لەسەرچالاکی و زیندوویی بەکتریا کەدوای هەڵگرتنی بۆماوەیەکی دووروودرێژ، کە ئەمەش وادەکات هەروەك چەکێکی بایۆلۆژی لەلایەن تیرۆرستانەوە (Bioterrorism) بەکاربهێنرێت.

- یـان بڵاوکردنـەوەی سـپۆری بەکتریاکـە لـەنێوان ئاژەڵـەکان و تووشـکردنیان و لەئەنجامدا گواستنەوەی نەخۆشییەکە لە ئاژەڵەوە بۆ مرۆڤ، ئەمەش ڕێگەیەکە کە تیرۆریستان دەیگرنە بەر وەك چەکی بایۆلۆژی.
- بـەڵام سـەرکەوتنی هاوپـەیمانان بەسـەرکردایەتی وولاتـە یـەککگرتووەکانی ئەمەریکا و گەلی عیراق بەسەر ڕژێمی بەعس عیراق ئەگەری بەکارهێنانی چەکی بایۆلۆژیش لە گۆڕنرا.

## سەرچاوەکان:


1-Bacillus anthracis and Anthrax

2-Radostits, O.M, Gay, C-C Blood D-C and hinchcliff, K-W Veterinary Medicine, 2000 qthedition.

3-گۆڤاری بژوێن ژمارە (٦،٧)

نەخۆشی سپڵ لەلایەن د.توانا خوارەحم.

4-الأمراض المشترکه بين الانسان والحيوان

د.صباح العلوجي.

-د.عبدالحسين بيرم.

5-Bigger, J.W, Hand Book of Bactriology (1939)

6 – زانیاری دەربارەی نەخۆشی ئەنسراکس

لەلایەن بەڕێز/ د. ئیسماعیل ئەمین. پزیشکی ڤێتێرنەری شاردزا

# نەخۆشی

## سکچوونی خوێناوی (ڕیقنەی خوێناوی)

## Coccidiosis

پیشەسازی بەخێوکردنی پەلەوەر، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزۆر بوون و گەشەکردندایە بەمەبەستی بەرهەم هێنانی گۆشت و هێلکە، کەبەسەرچاوەیەکی گرنگی پرۆتینی مرۆڤ دەژمێرێت. لەجیهاندا بەگشتی و لەکوردستاندا بەتایبەتی، نەخۆشی کۆکسدیۆسز بەترسناکترین بەربەست دادەنرێت لەبەردەم پێش کەوتن و گەشەکردنی پیشەسازی بەخێوکردنی پەلەوەردا چونکە زەروو زیانێکی گەورە دەگەیەنێت بە ئابووری وولات و هەروەها کارێکی خراپیش دەکاتە سەر تەندروستی گشتی، جا لەبەر ئەوە پێویستە خەڵکی کوردستان بەتایبەتی خاوەن کێڵگەکانی پەلەوەر هۆشیاربکرێتەوە بەچەند زانیارییەکی پێویست دەربارەی ئەم نەخۆشییە.

### کۆکسدیۆسز چی دەگەیەنێت؟

کۆکسدیۆسز (Coccidiosis) ئەو نەخۆشییە یە کە تووشی کۆئەندامی هەرسی باڵندەی ماڵی دەبێت وەکومریشک و قەل، هەروەها تووشی کۆئەندامی هەرسی مرۆڤ و مانگا ومەڕوبزن وبەرازوسەگ وپشیلە وکروێشک و ڕێوی دەبێت، لەئەنجامی هێرشی مشەخۆرێکی سەرەتایی کەپێی دەوترێت کۆکسدیا (coccidia) بۆسەر خانەکانی ڕیخۆڵە و لەئەنجامدا زیندەوەرەکە تووشی سکچوونی خوێناوی دەکات.

### هۆکاری نەخۆشی کۆکسدیۆسز:

هۆکاری نەخشی کۆکسدیۆسز کە پێی دەوترێت کۆکسدیا (coccidia) لەجنسی ئایمیریا (Eimeria)یەو سەر بەخێزانی (Eimeriidae).

## کۆکسدیا مشەخۆرێکی سەرتایی یە:

لەناوخانەکانی ڕیخۆڵەدا (کەشوێنی هەڵبژێراوی (Porto Zoan Parasite)، مشەخۆرەکەیە) گەشە دەکات و زۆر دەبن.

## جۆرەکانی ئایمێریا (Eimeria):

نۆ جۆری سەرەکی لە ئایمێریا هەیە کە تووشی بەشە جیاوەزەکانی ڕیخۆڵە دەبن لەمریشکدا، بەڵام گرنگترینیان بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

### یەکەم/ جۆری Eimeria tenella

ئەم جۆرە لەکوردستاندا زۆر بڵاوە و زەرەرێکی گەورە دەگەیەنێت بەخاوەن کێڵگەکانی پەلەوەرو تووشی هەردوو ڕیخۆڵە کوێرە دەبێت و لەمریشکدا دەبێتە هۆی نەخۆشی (Cecal Coccidiosis) کە یەکێك لەنیشانە سەرەکییەکانی ڕیقنەی خوێناوییە (Bloody Droppings).

### دووەم/ جۆری Eimeria necatrix

تووشی بەشی ناوەڕاستی ڕیخۆڵە دەبێت و دەبێتە هۆی نەخۆشی Intestinal ( Coccidiosis)

### سێیەم/ جۆری Eimeria acervulina

تووشی بەشی سەرەوەی (بەشی یەکەمی) ڕیخۆڵە دەبێت

### چوارەم/ جۆری Eimeria maxima

تووشی بەشی ناوەڕاست و خواروی ڕیخۆڵە دەبێت

## سوڕی ژیانی کۆکسیدیا ( Life Cycle of the Coccidia):

ســووڕی ژیــانی کۆکســیدیا بەشــێوەیەکی گشــتی دەکرێتــە دووقۆنــاغی سەرەکی‌یەوە:

### یەکەم/ قۆناغەکانی گەشەکردن لەناوەوەی لەشی خانە خوێ:

### (Endogenous stages):

ئـەم قۆناغانـە گەشـەکردن و زۆربـوونی مشـەخۆری ئایمێریـا دەگرێتـەوە لـەناو لەشـی مریشـکی تووشـبوودا، هـەروەها بـەم قۆناغـەش دەوترێـت: ( "Shizogony" Asexual reproduction) ئەم قۆناغە دەست پێدەکات بەخواردنی ژمارەیـەکی زۆر لـە هێلکـەی کۆکسـدیا لەلایـەن مریشـکەوە، بـەم هێلکانـەش دەوترێـت "Oocyst" ئۆئۆسست، چوار سپۆرۆسست هـەر ooyst یَك (Sporocysts)ی تێدایـەو لەهـەمان کاتدا هەرل سپۆرۆسستێك دوو سپۆرۆزۆیتی (Sporozoite) تێدایەو گەیشتنی ئـەم هێلکانەبـە کۆئەنـدامی هـەرس و لەئەنجامـدا هـەرس کردنیـان و دەرچـوونی ژمـارەیکی زۆر لە سپۆرۆزۆیت و هێرش کردنیان بۆسەر خانەکانی ریخۆڵە باریکە.

لەدواییـدا سـپۆرۆزۆیتەکان دەگـۆڕین و شـێوەیەکی خـڕ وەردەگـرن و پێیـان دەوترێـت ترۆفۆزۆیـت (Trophozoite) و ئـەمانیش گەشـەدەکەن و لەقـەبارەدا گـەورە دەبن هەتاکو دەگەنە قۆناغی: "First Generation Schizont" هەر شایزۆنتیك چـەند ژمارەیـەك لـەمێرۆزۆیتی (Merozoite) ی تێدایـە، بەشـێك لەمیرۆزۆیتـەکان دەبنە هۆی تێکشکاندنی ژمارەیەکی زۆر لەخانەکانی ریخۆڵەو هەروەها هێـرش بردنە سـەر خانـەی نوێ و بەم قۆناغەش دەوترێت: "Second Generation Shizont" دوای ئەم قۆناغەش بەشێکی تر لەمیرۆزۆتیەکان گەشە دەکەن و دەگۆڕدرێن بۆ خانـەی نێـر (Microgametocyte) و خانـەی مـێ (Macrogametocyte) و لەئەنجامـدا

خانەیەکی نێروخانەیەکی مێیەك دەگرن و هێلکە (Oocyst) دروست دەبێت و بەم بۆ بونەش دەگوترێت: Sexual reproduction (Gametogony) ئەم قۆناغی گەشەکردنانە لەنا وەوەی لەشی خانەخوێ دا نزیکەی شەش ڕۆژێك دەخایەنێت.

## دووەم/ قۆناغەکانی گەشەکردن لەدەرەوەی لەشی خانە خوێ:

## (Exogenous Stages)

لەم قۆناغەدا هێلکەی کۆکسدیا پێویستی بە ژینگەیەکی لەبارو گونجاو هەیە بۆ ئەوەی پێ بگات و ئامادەبێت بۆ تووشبوون، ئەو ژینگە لەبارەش بریتیە لە:

- ڕادەی شێ بەرزبێت.
- بوونی ئۆکسجینی پێویست.
- پلەی گەرمی لەنیوان (٢٦-٢٨) پ.س بێت . بەم قۆناغەش دوترێت Sporulation کەنزیکەی دووڕۆژێك دەخایەنێت.

## -چۆنیەتی بڵاوبونەوەی کۆکسدیۆسز:

مشەخۆری کۆکسدیا لەهەموو جیهاندا بڵاوەو بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە مریشکی تێدا بەخێو دەکرێت، هێلکەی مشەخۆری کۆکسدیا توانای مانەوەی هەیە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ چونکە توانای بەرگری کردنی هەیە لە بارودۆخی ناسروشتیدا. هەندیك مریشك بەشێوەیەکی سروشتی هەڵگری ئەم مشەخۆرن و بەسەرچاوەیەکی سەرەکی بڵاوبونەوەی ئەم نەخۆشییە دادەنرێن.

لەکاتی ڕوودانی هەر کەمتەر خەمیەك لەبەڕێوەبردنی کێڵگەکانی بەخێوکردنی مریشکدا وەکو بەرزبونەوەی ڕادەی شێ لەهۆڵەکانی بەخێوکرندا دەبێتە فاکتەرێکی ڕێگەخۆشکەر بۆ پێگەیشتنی هێلکەی کۆکسدیا (Sporulation) و لە ئەنجامدا بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی خێرا.

- نەخۆشی کۆکسیدیۆسز زیاتر لەوەرزکانی پایزو زستان و بەهاردا بڵاودەبێتەوە چونکە ڕادەی شێ لەو وەرزانەدا زۆربەرزە.

## -نیشانە دیارەکانی کۆکسدیۆسز:

- بەشێویەکی گشتی نەخۆشی کۆکسدیۆسز تووشی مریشك دەبێت لە تەمەنی سێ هەفتەوە هەتاکو تەمەنی گەورەتر. نیشانەکانی نەخۆشییەکە بەوەدەست پێدەکات کە چالاکی باڵندەکە کەم دەکات و کزدەبێت.
- تووشی باڵە شۆڕە دەبێت.
- باڵندەکە لەخواردن دەکەوێت و ڕۆژلەدوای ڕۆژ لاواز دەبێت و زۆر بەناشکرا کێشی کەم دکات.
- لەنیشانە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشییە ئەوەیە کە باڵندەی تووشبوو تووشی سکچوونی خوێناوی دەبێت (واتەڕیقنەی خوێناوی) لەئەنجامدا کەم خوێنی و بەرەبەر لەناو دەچێت، لەنیشانە دیارەکانی دوای مردار بوونەوەی باڵندەکە ( Post- Mortem examination ) بەتایبەتی لەکاتی تووشبوون بەجۆری: Eimeria tenella ئەوەیە کە هەردوو ڕیخۆڵە کوێرە پڕدەبێت لەخوێن و دیوارەکانی ئەستور دەبن.
- ڕادەی لەناوچوون لە کێڵگەکەدا دەگاتە ٤٠٪.

## -دەست نیشان کردنی نەخۆشی کۆکسدیۆسز:

بۆ گەیشتن بەدەست نیشان کردنێکی تەواو نەخۆشی کۆکسدیۆسز پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

یەکەم/بەهۆی نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکەوە.

دووەم/ بەهۆی نیشانە دیارەکانی دوای مردار بوونەوەی باڵندەکە.

سۆیەم/ لە تاقیگەدا:پشکنینی ڕقنەی مریشکەکە بەهۆی مایکرۆسکۆپەوە بۆ تێبینی کرنی هێلکەی مشەخۆرەکە (Oocyst).

## -خۆپاراستن:

جەنگ لەدژی نەخۆشی کۆتایی نایەت بەلام هەمووکاتێك خۆپاراستن چاکترە لەچارەسەرکردن و بەمەبەستی ڕوونەدانی نەخۆشی کۆکسدیۆسز پێویستە کۆنترۆڵێکی تەواوی ڕادەی شێ بکرێت لەهۆڵەکانی بەخێوکردنی مریشکدا بەتایبەتی لەوەرزەکانی پایزو زستاندا.

هەروەها پێویستە ژمارەی مریشکەکان لە هۆڵەکاندا بگونجێت لەگەڵ ڕووبەری هۆڵەکاندا.

هەرلەبەر ئەمەشە بەم نەخۆشیەش دەوترێت (هەڵەی بەخێوکەر) چونکە لەکاتی ڕوودانی هەر هەڵەیەك یان کەمتەر خەمیەك لەبەرێوەبردن و بەخێوکردنی مریشکدا نەخۆشیەکە بلاودەبێتەوە.

## چارەسەرکردن:

چەند دەرمانێك هەیە بەکار دەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کۆکسدیۆسز لەو دەرمانانەش:

- ئەمپرۆلیۆم Amprolium
- فیوڕازۆڵیدۆن Furazolidone
- دیکۆکس BayCox or Decox
- کلینا کۆکس "Clinacox"

## ئەوسەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە:


1-Coccidiosis and the Role of Medication and Management.

٢-دكتور تحسين عبدالعزيزو دكتور ماجد احمد العطار ١٩٨٩ "التشخيص السريدي الأمراض الدجاج"

٣-دكتور فؤاد الشيخلي ١٩٨٢ "أمراض الدواجن"

٤- مجله: دواجن الشرق الأوسط وشمال افريقا. ژماره: ١٤٧-١٩٩٩.

5- F.T.W. J0rdan "Poultry Diseases".

# نەخۆشی شێت بوونی مانگا

# "Mad Cow Disease"

## ئایا مانگا شێت دەبێت ؟؟!

ئەم پرسیارە لای زووربەی کەس دروست بووە بەتایبەتی دوای شێت بوونی مانگاکانی بەریتانیا، ئێمەش لەوەلامدا دەڵێین شێت بوونی مانگا یەکێکە لەنەخۆشیانەی لەوخۆشیانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا وەکو دیاردەیەکی ترسناك لەنێوان مانگاکانی وڵاتی بەریتانیا سەری هەڵداو لەلایەن زووربەی کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنی جیهانی گرنگی یەکی تایبەتی پێدراو هەر لەبەرئەوەشە کەپێویستە خوێندەواری کورد ئاگاداربێت لەسەر چەند زانیاریەکی گرنگ دەربارەی ئەم نەخۆشییە.. هەرچەندە زانیاری دەربارەی ئەم نەخۆشییە جێگیرنەبووەو لێکۆڵینەوە هەر بەردەوامە.

چیرۆکی سەرهەڵدانی نەخۆشی شێت بوون لەنێوان مانگاکانی بەریتانیادا:-

بۆیەکەم جار ئەم نەخۆشییە لەناوەڕاستی هەشتاکانی ئەم سەدەیەدا لەووڵاتی بەریتانیا سەری هەڵداو زیانێکی گەورەی بەئابووری ئەو ووڵاتە گەیاند. شێت بوونی مانگا ناوێکی گشتی یە لەنێوان خەڵکی بەریتانیادا بڵاوەو ناوە زانستییەکەی بریتیە لە "BSE" {Bovine Spongiform EnCephalopathy} کەلێك ڕاوبۆچوونی جیاواز جیاواز هەیە سەبارەت بەچۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەم دەردە ترسناکە لەنێوان مانگای بەرتانیادا بەڵام نزیکترین بۆچوون لەڕاستیەوە ئەوەیە کەسەرچاوەی شێت بوونی مانگاکانی بەریتانیا دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشییەکی ناسراو لەبەریتانیا کەپێی دەوترێت سکرەیپی {Scrapie} کە بەشێوەیەکی سروشتی لەنێوان مەڕە بەتەمەنەکانی بەریتانیادا هەیەو لە لەوەڕگاکانی ئەو ووڵاتەدا بڵاوە، وبەپێی سەرچاوە پزیشکییەکان هۆکاری نەخۆشی سکرەیپی هەمان هۆکاری

نەخۆشی شێت بوونی مانگای بەریتانیایە، چیرۆکی بلاّوبونەوەی نەخۆشی شێت بوون لەو وولاّتەدا بەوە دەستپێدەکات کە لەبەریتانیادا ژمارەیەکی زۆر مەڕو مالاّت هیەو زۆربەی مەڕە بەتەمەنەکان هەڵگری هۆکاری نەخۆشی سکرەیپین. خەڵکی بەریتانیا گۆشتی مەڕیان زۆر لاپەسەندنییەو لەکارگەی تایبەتدا ئەو مەڕە پیرە لاوازە نەخۆشانە سەردەبڕێن و زانستیانە لەژێر کاری گەری گەرمی بەرزدا پرۆتینی ئاژەڵیان لێ دروست دەکرێت و لەئەنجامدا هەروەك سەرچاوەیەکی پرۆتینی بەشێکی زۆر لەئالیکی مانگاکانی ئەو وولاّتە پێکدەهێنێت.

بەلاّم لەحەفتاکان و هەشتاکانی ئەم سەدەیەدا چەند گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر چۆنیەتی دروستکردنی پرۆتینی ئاژەڵی لەبەریتانیادا هات، ئەویش بەبەکارهێنانی پلەیەکی گەرمی نزمتر لەو پلە گەرمییەی کە پێویستە بۆ لەناوبردنی هۆکاری نەخۆشی سکرەیپی و هۆکارەکە بەزیندویێتی و چالاکی دەمێنێتەوەولەئەنجامیشدا بەم شێوەیە پێشکەش بەمانگاکانی ئەو وولاّتە دەکرێت لەڕێگەی سەرچاوە پرۆتینییەکەوە کە لەگۆشتی مەڕەکان دروست دەکرێت.

- لەساڵی ١٩٨٦ لەبەریتانیا نزیکەی (١٦٠,٠٠٠) سەرمانگا هەڵگری هۆکاری ئەم نەخۆشیەن و لەساڵی ١٩٩٠ لەوولاّتی (میرنشینەکانی عمان) نیشانەکانی نەخۆشی شێت بوون لەسەر ئەو مانگایانە دەرکەوت کە لەساڵی ١٩٨٥ لەبەریتانیاوە هێنرابوون.

## -كۆمەڵێك نەخۆشی لەمرۆڤو ئاژەڵ:

نەخۆشی: { Spongiform Encephalopathy in Man and Animals}

کۆمەڵێك نەخۆشی دەگرێتەوە لەمرۆڤ وئاژەڵدا کەنیشانەکانیان زۆر لەیەك دەچن چونکە نەخۆشییەکان بەشێوەیەکی گشتی تایبەتن بەناوەندە کۆئەندامی دەماری مرۆڤو ئاژەڵی توشبوو: لەو نەخۆشیانەش:-

## لەمرۆڤدا:-

### یەکەم/ نەخۆشی کورۆ {Kuru}:

ئەم نەخۆشییە هەبووە بەتایبەتی لەنێوان هەندێك لەخێڵەکانی وولاتی غینیای نوێ، کەیەکێك لەنەریتە باوەکانیان بریتی بوە لەخواردنی گۆشتی لاشەی مردووەکانیان و ئەمەش گرنگترین سەرچاوەی بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە بووە لەنێوان ئەندامانی ئەو خێڵانەدا، وەیەکێك لەنیشانە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشییە بریتیە لە لەرزینی لەشی مرۆڤە تووشبووەکەو ناوی کورۆ لەلەرزینەوە هاتووە بەلام لەسەرەتای حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا، بەهۆی بڵاوبونەوەی خوێندەواری لەنێوان ئەو خێڵانەدا بووە هۆی نەهێشتنی ئەو نەریتە کوشندەیەو لەئەنجامیشدا نەخۆشییەکە کۆتایی پێ هات.

### دووەم/ نەخۆشی: جاکۆب-کروتزفیلد: { Creutzfeldt- Jacob Disease}

ئەم نەخۆشییە بەرێژەیەکی زۆر کەم لەجیهاندا بڵاوەو زیاتر لەنێوان جولەکە لیبییەکاندا لە ئیسرائیل دا هەیەو هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوی کە خواردنی سەرەکیان بریتی بووە لەسەرو چاوی مەڕی پڕ.

دوای سەرهەڵدانی نەخۆشی شێت بوون لەمانگای بەریتانیادا لەهەمان کاتدا نەخۆشی جاکۆب لەمرۆڤدا لەبەریتانیا زیادی کرد، وەبەپێی سەرچاوە زانستییەکان هەتاکو ئێستا هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوان نەخۆشی جاکۆب لەمرۆڤداو شێت بوون لەمانگادا.

- نەخۆشی جاکوب لەمرۆڤێکی تووش بووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤێکی ساغ لەرێگەی کاری نەشتەرگەرییەوە.

## سێیەم/نەخۆشی: {Gerstmann - Straussler - Scheinker disease}

- لەرێگای بۆماوەوە دەگوێزرێتەوە.

## چوارەم/نەخۆشی:- {Fatal Familial Insomnia}

- لەرێگەی بۆماوەوە دەگوێزرێتەوە.

## لەئاژەڵدا:-

### یەکەم/ لەمەڕوبزندا:

نەخۆشی سکرەیپی {Scrapie} ئەم نەخۆشیە پێش (٢٠٠) دووسەدساڵ لەئەوروپا بەگشتیو بەریتانیا بەتایبەتی دۆزراوەتەوە؛ زیاتر تووشی ئەو مەڕوبزنانە دەبێت کە تەمەنیان لە (١٨) مانگ زیاترە.

لەنیشانە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشییە کەپێستی ئاژەڵی تووشبوو تووشی هەستدارێتیەکی زۆر توند دەبێتو ئاژەڵەکە خۆی دەخورێنێتو ناوی (Scrapie) لەخوراندنەوە هاتووە.

- ئەم نەخۆشییە لەفەڕەنسا پێی دەوترێت (Tremblante) وەلەئەڵمانیا پێی دەوترێت (Traber Krankheit)

**-دووەم/ لـــــەمانگادا: "BSE" {Bovine Spongiform Encephalopathy}**

**سـێیەم/ لەئاسـكو ئێسـتر: نەخۆشـی {Chronic Wasting Disease}**

## هۆكاری نەخۆشییەكە : "Causative agent"

**هۆكـاری ئـەم نەخۆشـییە چـەند سـیفاتێكی تایبـەتی گرنگـی هـەیـە كـە بـەهیچ شـێوەیك لـە سـیفاتەكانی هۆكـارە بایۆلۆژیـە تەقلیدیـە نەخۆشـخەرەكانی تـری وەك {بەكتریا-ڤایرەس} ناچێت.. ئەمەش خۆی لەخۆیدا شۆڕشێكە لەزانستی بایۆلۆژیو مایكرۆبایۆلۆژیدا.**

**لەبـەر نـەبوونی زانیـاری پێویسـت ناوەنـدە زانسـتییەكان لەسـەرەتادا گـەلێك ناوی جۆراوجۆریان لەهۆكاری ئەم نەخۆشییە ناوە، لەوانەش:-**

- ڤایرەسە سستەكان (Slow Virus)
- هۆكاری نائاسایی (Un Conventional agent)
- پرۆتینێكی نائاسایی (Abnormal protien)
- هۆكارێك لەڤایرس دەچێت (Virus like agent)
- لەسـاڵی (١٩٨٢) بـەدواوە ناوەنـدە زانسـتییە پزیشـكییەكان هۆكـاری ئـەم نەخۆشیەیان ناونا پریۆن (Prion)

كەكورت كراوەی:

{Proteinaceous Infectious Particles}

واتە "تەنۆچکەیەکی پرۆتینی نەخۆشخەر"

## -وەلەسیفاتە تایبەتەکانی پریۆن:-

یەکەم/ پریۆن پێکهاتووە لە پرۆتنێکی تایبەت کەپێی دوترێت پرۆتینی پریۆن (Prion Protein) کە کورت دەکرێتەوە بۆ {PrP}

- لەناوەڕاستی هەشتاکاندا زاناکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە لەلەشی ئاژەڵ ومرۆڤدا جینێك هەیە کەلێپرسراوە لەدروستکردنی پرۆتینی پریۆن و لەمرۆڤدا ئەم جینە دەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی (٢٠) بیست، هەروەها زاناکان بۆیان دەرکەوت کەدوو جۆر پرۆتینی پریۆن هەیە:

١- پرۆتینی پریۆنی سروشتی کەنەخۆشخەر نیە کەپێی دەوترێت Cellular Prion Protein}وە کورت ددکرێتەوە بۆ{PrPC}.

٢- پرۆتینی پریۆنی ناسروشتی کەنەخۆشخەرە کەپێی دەوترێت Scrapie Prion Protein }وە کورت دەکرێتەوە بۆ: {PrPc}

کەهەروەها ئەم جۆرەیان بەلێپرسراوی یەکەم دادەنرێت بەتووشبوون و سەرهەڵدانی شێت بوونی مانگا.

دووەم/بەهیچ شێوەیەك تێبینی ترشەناوك نەکراوە لەپرۆتینی پریۆن و تیرەکەی نزکەی (٧--٢٠) نانۆمیترەو کێشەکەی نزیکەی (٢٧--٣٠) کیلۆدالتۆنەو بەهۆی مایکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنییەوە نەبینراوە.

سێیەم/ پرۆتینی پریۆن لەلایەن کۆئەندامی بەرگری لەشی مرۆڤو ئاژەڵەوە تێبینی ناکرێت و وەك تەنۆچکەیەکی پرۆتینی بێگانە بەلەش وەڵام نادرێتەوە.

- واتە:- دژەپەیداکەر نیە. Non-antigenic

-- No Immune response وەڵامدانەوەی بەرگری نیە.

ومنابێته هۆی هەوکردن:- No Inflammation-

چوارەم/ ماوەی چوونەژوورەوەی پریۆن بۆ ناو لەشی مرۆڤ یان ئاژەڵ وەهەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییەکە لەسەریان نزیکەی {٥مانگ بۆ٥ساڵ} درێژە دەکێشێت شوێنی هەڵبژێراوی کاری پریۆن بریتیە لەناوەندە کۆئەندامی دەمار بەگشتیو مێشك بەتایبەتی کەکاری تێکدەرانەی خۆی تێدا ئەنجام دەدات کە ئەویش بریتیە لەدروستکردنی بۆشایی {Vacuolation} لەدەمارەخانەکانو شانەکانی مێشکداو لەئەنجامدا شانەکانی مێشك شێوەیان لەشێوەی ئیسفەنج دەچێت.

پێنجەم/پرۆتینی پریۆن:-

أ- لەژینگەی دەرەوەدا توانای مانەوەی هەیە بەچالاکی بۆ ماوەی چەند مانگێك.

ب- لەپلەی (٨٠س°) توانای مانەوەی هەیە بۆ ماوەی نیوکاتژمێر.

ج- بەهیچ جۆرێك ماددەی ترش و تفت کاری تێناکات

و- ئەم ئەنزیمانە (Nuclease-Protease-Lipease) کار لەپریۆن ناکات

ه- تیشکی سەرو بنەوشەی کار لەپریۆن ناکات

و- باشترین رێگە بۆ لەناوبردنی پریۆن لەبەروبومی ئاژەڵان تعقیم کردنە بە (ئۆتۆکلاف) لە پلەی ١٣٤-١٣٨س بۆ ماوەی یەك کاتژمێر

## -نیشانەکانی شێت بوون لەمانگادا:

ئەم نیشانانەی خوارەوە دوای ماوەیەکی درێژ بەشێوەیەکی کتوپڕ دەدەکەوێت:

١- پلەی گەرمی لەشی توشبوو بەرزنابێتەوە

٢- پێستی ئاژەڵ توشی خواردن و ئاوسان و سوربونەوە دەبێت و هەوڵی خواردنی دەدات بەهۆی دیواریان هەر شتێکی رەق ترەوە یاخود گازی لێدەگرێت.

٣- بەشەکانی لەشی ئاژەڵەکە بەشێوەیەکی ناسروشتی دەجوڵێتەوە

٤- دوای مرداربونەوەی ئاژەڵەکە مێشکی شێوەی ئیسفەنجی وەردەگرێت (spongy) کەمەش بەگرنگترین رێگە دادەنرێت بۆتەشخیص کردنی نەخۆشی یەکە.

## -چارەسەرکردن/ ئەم نەخۆشییە هەتاکو ئێستا هیچ چارەسەرێکی بۆ نەدۆزراوەتەوە.

## چۆنەتی پاراستنی کوردستان لەم نەخۆشی یە:-

**یەکەم**/قەدەغەکردنی هێنانی ئاژەڵ { مانگا-مەڕ-بزن} لە وولاتانەی کە نەخۆشیەکەیان تێدا بلاوبۆتەوە.

**دووەم**/قەدەغەکردنی هێنانی پرۆتینی ئاژەڵ لەو وولاتانەی کە نەخۆشیەکەیان تێدا بلاوبۆتەوە.

**سێیەم**/ ناردنی تیمێك لەپزیشکانی ڤێترینەری بۆ دەرەوەی وولات بەمەبەستی راهێنانو مەشق کردن لەسەر تازەترین رێگاکانی دیاریکردنی ئەم نەخۆشییە لە ئاژەڵو مرۆڤدا.

**چوارەم**/ ئەم نەخۆشییە لەرێگەی بەرهەمی ئاژەڵەوە وەك {ماست-پەنیر-کەرە} ناگوێزرێتەوەو خواردنی ئەم بەرهەمەی ئاژەڵانە هیچ مەترسییەکی لەسەرنییە.

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێوەرگیراوە:-

1-Control of Communicable diseases in man.

-Abram S. Benenson.

2-Thomsons special veterinary pathology.

-William W. Carlton.

-M. Donald MCGavin.

3-New Som 's sheep diseases "1973".

-Hadleigh Marsh.

4-Veterinary Medicine.

-D.C.Blood.

-J.A.Henderson.

-Medical Micro biology.

-Murray. –Drew.

-Kobayashi. –Thompson.

6-Disease's of live stock

-T.G.Hungerford.

7-مذكرة معلومات صادرة عن منظمة الأغذية والزراعة- (FAO)

8-مجلة الطبيب البيطري:ژمارة: ١-٤/١٩٩٦

"نقابة الأطباء البيطرين الأردنيين"

9-علم المناعة وعلم الأمراض المناعي في الحيوانات الأليفة

- أولسن وكداكوكا.

ترجمة:- دكتور خليفة احمد خليفة.

- **دكتۆر سعد خالد حسن.**

10· رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (١٢٤٩) لە ١٩٩٦/٣/٢٩: مانگا شێتەکانی **بەریتانیا.**

- **د.کەریم خۆشناو.**

11-**مجله (ابقار واغنام): العلاقة بين مرض الأستحالة الدماغية الأسفنجية البقرية والأمراض الدماغية الأخرى.- دكتۆر ياسين الياسينو (سوريا).**

## کێشەکانی زاووزێ

## لەمانگای ناوچەی سلێمانی

لەڕۆژی ۲۰۰۱/۸/۱۸ لەهۆڵی ڕووناکیی زانکۆی سلێمانی گفتوگۆی لەسەرکراو ، ئەمە یەکەمین ماستەرنامەیە لە زانستی پزیشکیی ڤێترینەری لە کۆلێژی پزیشکی ڤێترینەری/ زانکۆی سلێمانی.

کۆئەندامی زاووزێی مانگا بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لە جوتێك هێلکەدان (ڕاست و چەپ) چووتێك جۆگەلەی هێلکە و گوێرەکەدان و ملی گوێرەکەدان و زێ.

یەکێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی ماناگا سوڕی مانگانەیە، کەپێی دەوترێت هاتنەکەڵ (Costrus Cycle) بەشێوەیەك، کە هەموو "۲۱" ڕۆژجارێك دێتە کەڵ

**-لەنیشانە دیارەکانی هاتنە کەڵی مانگا بریتیە لە:**

مانگای بەکەڵ زۆر جوڵە دەکات و دەبۆڕێنێت و کۆنترۆڵ کردنی زەحمەتە.

- شلەیەکی ساف و خاوێن و لینج بەزێیدا دێتە خوارەوە.
- مانگای بەکەڵ دەوەستێت و کلك بەرزدەکاتەوە، بۆ ئەوەی لەڕێگەی گایەکەوە کەڵ بدرێت.
- بەرهەمی شیری کەم دەکات.

## -ئەم توێژینەوەیە دوولایەن دەگرێتەوە:

یەکەم:توێژینەوەیەکی کلینیکی، کە (539) مانگای خۆماڵی لەخۆنەگرێت و کۆئەندامی زاوزێیان توشی چەند کێشەیەك بوون بەم شێوەی خوارەوە:

### ١-هێلکەدانی ناچالاك (ovaries): Inactive

١٢٠ مانگای خۆماڵی توشی هێلکەدانی ناچالاك بوون بەرێژەی ٢٢,٢٦٪ لەکاتی پشکنیندا دەرکەوت هێلکەدانەکانیان بەقەبارە بچوکەو هیچ پێکهاتەیەکی، وەکو: تەنەزەردەو چیکڵدانەی لەسەر دەرناکەوێت.

هۆی سەرەکی زیادبوونی رێژەی ئەم کێشەیە لەنێوان مانگای ناوچەی سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆکەمی خۆراك و هەژاری لەوەڕگاکان، بەشێوەیەکی گشتی ئەمەش بەتایبەتی لەم سالانەی دواییدا لە بەرکەمی رێژەی باران بارین لەم ناوچەیەداو پێدانی ئالیك بەمانگاکان، کەزیاتر پێکهاتووە لە جۆرێکی خراپ لەکاو نانەڕەقە کە ئەمەش بێگومان هیچ سودێکی ئەوتۆی نییەو دەبێتە هۆی گەشەنەکردنی چیکڵدانەکانی هێلکەدان و قەبارەکەی بەبچوکی دەمێنێتەوەو لەئەنجامدا مانگای توشبوو سوڕی مانگانەی لەسەر دەرناکەوێت و نایەتە کەڵ، بۆ پاڵپشتی کردنی ئەم ڕاستیەش لەبەشی دووەمی توێژینەوەکەدا کە لە قەسابخانەی ناوەندی سلێمانی ئەنجام درا دەرکەوت کە رێژەی هێلکەدانی ناچالاك گەیشتۆتە ١٦,٩٣٪.

٦٠ مانگا کە توشی هێلکەدانی ناچالاك بوون چارەسەرکران بە هۆرمۆنی فۆلیگۆن (Folligon) بەمەبەستی هاندانی گەشەکردنی چیکڵدانەکانی هێلکەدان و چالاککردنی کە لەئەنجامدا ٤١ مانگا بەرێژەی ٦٨,٣٣٪ هاتنەوە کەڵ لەماوەی نێوان(٢–٦) رۆژدا.

## ٢-دووبارە هاتنەوە کەڵ (Repeat breeder Cow):

٩٥ مانگای خۆماڵی توشی دووبارە هاتنەوە کەڵ بوون بەرێژەی ١٧,٦٢٪:مەبەست لەدووبارەهاتنەوە کەڵ ئەو مانگایانە دەگرێتەوە، کە سوڕی مانگانەیان ڕێك‌وپێکە واتە هەموو "٢١" ڕۆژ جارێك دێتەوە کەڵ بەشێوەیەکی دیارو هەریەکەیان (٣-٤) جار کەڵ دراون، بەڵام بەبێ ئەوەی کەڵ بگرن‌و ئاوس بن. هۆکاری دووبارە هاتنەوە کەڵ لە مانگاکاندا زۆرن‌و لە ئەنجامی پشکنینی کلینیکی دا دەرکەوت:

٣٠ مانگا بەرێژەی ٣١,٥٧٪ کۆئەندامی زاوزێیان سروشتییە.

٤٨ مانگا بەرێژەی ٥٠,٥٢٪ توشی هەوکردنی گوێرەکەدان بوون.

١٢ مانگا بەرێژەی ١٢,٦٣٪ توشی هەوکردنی ملی گوێرەکەدان بوون.

٥مانگا بەرێژەی ٥,٢٦٪ توشی هەوکردنی گوێرەکەدانی دوای زایین بوون.

ئەو ٣٠ مانگایەی کە کۆئەندامی زاووزێیان سروشتی بوون چارەسەرکران بەهۆرمۆنی 0.5mg (GnRH)و لە ئەنجامدا ٢٤ مانگا بەرێژەی ٨٠٪ سودیان لێ وەرگرت.

## ٣- مانەوەی تەنەزەردە (persistan Ce of Corpus Luteum):

٧٠ مانگا توشی مانەوەی تەنەزەردە بوون بەرێژەی ١٢,٩٨٪ تەنەزەردە (Corpus Luteum) بە بەردەوامی لەسەر هێلکەدان دەمێنێتەوە لە ئەنجامی تێکشکاندنی خانەکانی بەشی ناوەوەی گوێرەکەدان (Endometrium) بەهەرهۆیەك بێت، کە دەبێتە هۆی بەرهەم نەهێنان‌و دروست نەبوونی هۆرمۆنی پرۆستاگلاندین ($PGF_2$)، کە فەرمانی سەرەکی بریتییە لە توانەوەی تەنەزەرد (Luteolysis) بەمەش لە ئەنجامدا مانگاکان نایەن کەڵ‌و سوڕی مانگانەیان لەسەر دەرناکەوێت.

٤٥ مانگـای خۆمـاڵی کـە توشـی مانـەوەی تەنـەزەردە بـوون چارەسـەرکران بەدووجۆری جیاواز لەهۆرمۆنی پرۆستاگلاندین $F_2$ ، ٢٠ مانگا چارەسەرکران بە ٢٥ ملغم لە (Dinoprost) لـە ئەنجامـدا ١٢ مانگـا بەرێـژەی ٦٠٪ هاتنـەوە کـەڵ لـەماوەی نێـوان (٤-١٤) ڕۆژدا،و ٢٥ مانگـا چارەسـەر کـران بـە ٥٢٦ مـایکۆگرام (chloprostenol) لـە ئەنجامـدا ١٧ مانگـا بەرێـژەی ٦٨٪ هاتنـەوە کـەڵ لـەماوەی نێوان (٥-٨) ڕۆژدا.

## ٤- گیربوونی پزدان (Retained Fetal membranes):

٧٠ مانگـا توشـی گیربـوونی پـزدان بـوون بەرێـژەی ١٢,٩٨٪ پـزدان (وێڵاش)بەشێوەیکی سروشتی ەماوەی (٢) کاتژمێر لـەدوای پرۆسـەی زایینـدا دێتـە دەرەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە گەرنەهاتە دەرەوە لەکاتی دیاری کراودا ئەوا گیردەبێت و پێویستە چارەسەربکرێت.

٧٠مانگا بەسێ شێوە چارەسەرکران:

- ٢٥ مانگـا چارەسـەرکران بەبـەکارهێنانی دەسـت و لەگـەڵ بـەکارهێنانی ٢٠ ملغـم/کغـم ئوکسـی تتراسـایکلین و لـە ئەنجامـدا ١٦ مانگـا بەرێـژەی ٦٤٪ پزدانەکانیان فڕێدرانە دەرەوە.

٢٢- مانگا چارەسەرکران بەبەکارهێنانی ١٠ ملغم (Estradiol Benzoate) لەگەڵ I.u.50 "oxytocin" و لـە ئەنجامـدا ١٥ مانگـا بەرێـژەی ٦٥,٢١٪ پزدانـەکانیان فڕێدرانە دەرەوە.

- ٢٢ مانگا چارەسەرکران بەبەکارهێنانی ٢٦ مـایکۆگرام ( Chl opr ost enol )و لەئەنجامـدا ٢٠ مانگـا بەرێـژەی ٩٠,٩٠٪ پزدانـەکانین فڕێدرانـە دەرەوە، کەبێگومان ئەم ڕێگەیە لە هەموو ڕێگەکانی دیکە باشترو سەرکەوتووتربوون.

## د-هەوکردنی گوێرەکەدان Metritis and (Endometritis

- ٥٥ مانگا توشی هەوکردنی گوێرەکەدان بوون بەرێژەی ١٠,٢٠٪و بەسێ شێوە چارەسەرکران :
- ١٥مانگا خۆماڵی چارەسەرکران بەبەکارهێنانی ٢٠ ملغم/کغم ئۆکسی تتراسایکلین و لەئەنجامدا ٨مانگا بەرێژەی ٥٣,٣٣٪ چاك بوونەوە.
- ٢٠مانگا چارەسەرکران بەبەکارهێنانی ٢٠/ملغم/کغم ئۆکسی تتراسایکلین لەگەڵ ١٠ ملغم (Est r adi ol Benzoat e) لەئەنجامدا ١٢ مانگا بەرێژەی ٦٠٪ چاکبوونەوە.
- ٢٠ مانگا چارەسەرکران بە بەکارهێنانی ٢٠ ملغم/کغم ئۆکسی تتراسایکلین لەگەڵ ٥٢٦ مایکۆگرام ( Chl opr ost enol) وە لەئەنجامدا ١٨ مانگا بەرێژەی ٩٠٪ چاکبوونەوە.

## ٦- کۆمەڵ بوونی کێم لە گوێرەکەدان pyometra:

٣٥ مانگا تووشی pyometra بوون بەرێژەی ٦,٤٩٪ ە pyometra بریتیە لە کۆمەڵ بوونی کێم وپیسی ناو گوێرەکەدان لەئەنجامی هەوکردنێکی درێژخایەنی گوێرەکەدان، کە بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی مانەوەی تەنەزەردە لەسەر هێلکەدان و بەرهەم هێنانی بڕێکی زۆر لە هۆرمۆنی پرۆجیسترۆن بەبەردەوامی، کە دەبێتە هۆی ئەوەی سوڕی مانگانەی دەوەستێت و مانگاکان نایەن کەڵ.

٣٠ مانگا چارەسەرکران بەدووجۆری هۆرمۆنی ($PGF_2$):

- ١٥ مانگا چارەسەرکران بە ٢٥ ملغم ( Di nopr ost) لە ئەنجامدا ٩مانگا بەرێژەی ٦٠٪ هاتنەوە کەڵ.
- ١٥مانگا چارەسەرکران بە ٥٢٦ مایکۆگرام ( chl opr ost enol)و لەئەنجامدا ١٢ مانگا بەرێژەی ٨٠٪ هاتنەوە کەڵ.

٧- هاتنەکەڵی بێدەنگ :Silent heat

٤٠ مانگـای خۆمـاڵی توشـی هاتنەکـەڵی بێـدەنگ بـون بەرێـژەی ٧,٤٢٪ هاتنەکەڵی بێدەنگ بریتیە لەوەی، کە مانگاکان بەشێوەیەکی سروشتی دێنەکەڵ، بەڵام هیچ نیشانەیکی دەرەکی پێوە دیارنییەو خاوەن ئاژەڵەکان توانای دەست نیشانکردنیان نییە.

٣٠ مانگا چارەسەرکران بەهۆرمۆنی ٥٢٦ مایکرۆگرام (Chloprostenol)و لەئەنجامدا ١٨ مانگا بەرێژەی ٦٠٪ هاتنەوە کەڵ لەماوەی نێوان (٢-٧) رۆژدا.

٨- هەوکردنی ملی گوێرەکەدان درێژخایەن (Chronic Cervicitis):

-٥٤ مانگا توشـی هـەوکردنی ملـی گوێرەکـەدان بـوون بەرێـژەی ١٠,٠١٪و چارەسەرکردنیان هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو.

دووەم/ توێژینەوەیـەکی توێکـاری ئەنجامـدرا لـە قەسـابخانەی شـاری سـلێمانیو لەئەنجامدا (١٢٠٠) کۆئەندامی زاوزێی مانگا کۆکرایەوە بۆ دەستنیشـان کردنی ئەو گۆڕانکارییە ناسروشـتیانەی، کـە بەسـەریاندا هـاتووە، لەئـەنجامی توێژینەوەکـەدا دەرکەوت، کە ٦١٥ کۆئەندامی زاووزێ بەرێژەی ٥٤,٥٢٪ گۆڕانکاری ناسروشتیانەی تێدابوو کەبریتیبوون لە : بەشێوەی سەرەکی:

- ٢٥- توشی Ovar o- bur saladhesi on بەرێژەی ٢٢,٥١٪.
- ١٩١ توشی هێلکەدانی ناچالاك بەرێژەی ١٦,٩٣٪.
- ٣٩توشی Par a-Ovar ian cyst بەرێژەی ٣,٤٥٪.
- ١١٩ توشی Salpingitis بەرێژەی ١٠,٥٤٪.
- ١٠توشی Hydrosal pinx برێژەی ٠,٨٨٪.
- ٢٥٠ توشی Endometritis بەرێژەی ٢٢,١٦٪.
- ٩٤ توشی Metritis بەرێژەی ٨,٣٣٪.
- ٤٥ توشی pyometr a بەرێژەی ٣,٩٨٪.
- ٦٢ توشی Cervicitis بەرێژەی ٥,٤٩٪.

# {دیاردەی پەڕوەرین لە مریشکی هێلکە} FORCE MOLTING

## ١-دیاردەی پەڕوەرین چی دەگەیەنێت؟

پەڕی باڵندە بەشێوەیەکی سەرەکی لە ماددەیەکی پرۆتینی پێك هاتووە کە پێی دەوترێت کیراتین Keratine .

باڵندە بەگشتی بەشێوەیەکی سروشتی هەڵدەستێت بەگۆڕینی پەڕەکەی {بەلایەنی کەمەوە یەك جار لە ساڵێکدا} هەروەکو هەوڵێك بۆتازەکردنەوەی پەڕەکەی بەتایبەتی پێش کاتی کۆچ وپەڕەووسەرماوسۆڵەو هەروەها پێش ئەوەی کە رۆژ کورتبێت.

## ٢- پەڕوەرینی دەستکرد چی دەگەیەنێت؟

دیاردەی پەڕوەرین بەشێوەیەکی سروشتی پێویستی بەچوار مانگێك هەیە، ئەم ماوەیەش زۆر درێژە لەبەر ئەوە پێویستە ئەم دیاردەی پەڕوەرینە لەمریشکی هێلکە کەرداو لەرێگەی بەرنامەیەکی زانستی داڕێژراوەوە خێراتر بکرێت واتە ماوەکەی کەم بکرێتەوە بەمەبەستی وەرینی پەڕی مریشکەکەو هاندانی جارێکیتر بۆ هێلکە کردن، بەم رێگەیەش دەوترێت (پەڕوەرینی دەستکرد) ماوەی پەڕوەرینی دەستکرد نزیکەی ٦-٨ هەفتە دەخایەنێت.

## ٣-سوودی دیاردەی پەڕوەرین چی‌یە؟

سوودی دیاردەی پەڕوەرین بۆ مریشکی هێلکەکەر لەوەدایە کەماوەی پەڕوەرین هەروەکو ماوەیەکی پشوودان وایە، واتە ماوەی پەڕوەرین پشوویەك

دەبەخشێت بەکۆئەندامەکانی لەشی مریشکی هێلکەکەر بەتایبەتی لە کۆتایی قۆناغەدرێژەکانی هێلکە کردندا، چونکە دوای ئەم ماوەیە مریشکی هێلکەکەر توانایەکی بالآی دەبێت بۆ هێلکەکردن بەشێوەیەکی رێکوپێک.

## ٤-بنەماسەرەکیەکانی پرۆسەی پەروەرینی دستکرد:

چەند پێویستیەکی گرنگ هەیە بۆسەرخستنی پرۆگرامی پرۆسەی پەروەرینی دەستکرد، ئەم پێویستیانەش هەروەکوهۆکاری ماندوکەر Stress factor کاردەکەن بەمەبەستی وەرینی پەڕی مریشکەکە، وەپرۆسەی پەروەرینی دەستکردی سەرکەوتوو ئەوپرۆگرامەیە کە بە بەکارهێنانی کەمترین ئەرك Stress factor دەبێت و لەئەنجامدا پەردەوەرێت لە دواییدا مریشکەکە بەخێرایی دەگەڕێتەوە بۆ بەرهەم هێنانی هێلکە.

ئەمەش سێ فاکتەری گرنگ دەگرێتەوە کە بەم ڕێگایانە ئەنجام دەدرێت:

## A. کەم کردنەوی ئاوی خواردنەوە:

زۆربەی بەرنامەکانی پەروەرینی دەست کرد دەڵێن کە دیاری کردن و کەم کردنەوەی ئاوی خواردنەوە یەکێکە لەوفاکتەرە گرنگانەی کەوەکو Stress factor بەکاردەهێنرێت بۆ هاندانی دیاردەی پەروەرین لەمریشکی هێلکەکەردا.

هەندێك لەوبەرنامانە بەم شێوەیەیەو دەبێ مریشکەکە:

- دووڕۆژئاوی نەدرێتێ.
- دووڕۆژئاوی بدرێتێ.
- دووڕۆژئاوی نەدرێتێ.

چەند بەڵگەیەکیش هەیە بەوەی کە کەم کردنەوەی ئاو دەبێتە هۆی گەورە بونی قەبارەی هێلکەی بەرهەم هاتوو لەلایەن مریشکی هێلکەکەر، لەدوای دیاردەی پەروەرین.

## B.کەم کردنەوەی خۆراك:

بەشێوەیەکی گشتی هەموو بەرنامەکانی پەروەرینی دەست کرد لەگەڵ ئەوەدان کە دیاری کردن و کەم کردنەوەی خۆراکی مریشك بۆ چەند رۆژێك فاکتەرێکی گرنگە، ئەمەش یەکێکە لەوفاکتەرانەی وەك Sterss factor بەکاردەهێنرێن بۆهاندانی دیاردەی پەروەرین لە مریشکی هێلکەکەردا.

## C.کەم کردنەوەی رووناکی:

زووربەی بەرنامەکانی پەروەرینی دەستکرد داوای کەم کردنەوەی رووناکی دەکەن بەمەبەستی ئەوەی کە وەك Sterss factor بەکاری بهێنن.

وەیەکێك لەوبەرنامانە لەگەڵ ئەمەدایە کە رووناکی لە رۆژێکدا کەم بکرێتەوە بۆ ١١-١٢کات ژمێر لە هۆڵی بەخێوکردنی مریشك.

## ٥-چەند رێگەیەکی تر بۆهاندانی پەروەرین:

I.زیادکردنی ماددەی زینك Zn بۆ خۆراك:

بەکارهێنانی رێژەیەکی زۆر لە ماددەی Zn بۆ خۆراکی مریشك دەبێتە هۆی هاندانی وەرینی پەری مریشکەکە، ئەمەش دەبێت بەوەی کە زینك Zn چالاکی ناوەندێکی دەماغی مریشکەکە ناهێڵێت کە پێی دەوترێت Appetite center وە لە ئەنجامدا مریشکەکە خۆراك کەم دەخوات و بەرە بەرە پەری دەوەرێت.

II.کەم کردنەوەی ماددەی سۆدیۆم خۆراك:

کەم کردنەوەی رێژەی سۆدیۆم Na بۆ 0.04% لە خۆراکداو هەروەها پێدانی ٦کاتژمێر رووناکی لە رۆژێکدا، هاندەرێکی باشە بۆ روودانی پەروەرین.

III. بەکارهێنانی هەندێك دەرمانی وەکو -progesterone Iodine cholermodione

## ٦-جۆرەکانی پرۆگرامی پەڕوەرین:-

مریشکی هێلکەکەر بۆ ماوەی یەك جاریاخود دووجار، پەڕی دەوەرێت، ئەمەش دەبێتە بنەمایەك بۆ ئەوەی کە دووجۆری سەرەکی پەڕودرین هەبێت:

## A.پرۆگرامی پەڕوەرینی دووسوڕی Two-cycle molting program

ئەم پرۆگرامە یەك جار پەڕوەرین و دووسوڕی بەرهەم هێنانی هێلکە دەگرێتەوە، لەم پرۆگرامەدا مریشکی هێلکەکەر دەست دەکات بە پەڕوەرین دوای {١٠-١٢} مانگ لە هێلکە کردن دوای ئەوە بەردەوام دەبێت لە هێلکەکردن بۆ ماوەی شەش مانگێك و دوای ئەوە دەفرۆشرێت.

واتە هێلکەکردن {١٠-١٢} ←—— پەڕوەرین ←—— هێلکەکردن بۆماوەی شەش مانگ ← فرۆشتن.

## B.پرۆگرامی پەڕوەرینی سێ سوڕی Three-cycle molting program

ئەم پرۆگرامە دووجار پەڕوەرین وسێ سوڕی بەرهەم هێنانی هێلکە دەگرێتەوە، لەم پرۆگرامەدا مریشکی هێلکەکەر دەست دەکات بە پەڕوەرین دوای نۆمانگ لە هێلکەکردن بۆماوەیەکی کورت دوای ئەمە جارێکی تر پەڕی دەوەرێت و بۆماوەیەکی کورت تر هێلکە دەکات و لەئەنجامدا دەفرۆشرێت.

نۆمانگ هێلکەکردن ←—— پەڕوەرین ←—— هێلکەکردن بۆماوەیەکی کەمتر لەنۆمانگ ← پەڕوەرین ←—— هێلکەکردن بۆماوەیەکی کورت تر ←—— فرۆشتن.

## ٧-بەراوردێك لەنێوان سوڕی یەكەم‌ودووەمی هێلكەكردندا :

لەمریشكی هێلكەكەرداو دوای دیاردەی پەروەرین بەرهەم هێنانی هێلكە لە سوڕی دووەمی هێلكەكردندا بە هیچ شێوەیەك لە سوڕی یەكەمی هێلكەكردن ناچێت واتە چەند تەنگ‌وچەڵەمەیەكی ئابوری دێتە پێشەوە كە پەیوەندی هەیە بەنرخی بەرهەم هێنانی هێلكەوە وەپێویستە لەڕووی ئابوریەوە لێك بدرێتەوە وەلەم خاڵانەی خوارەوەدا ڕەچاوبكرێت:

## یەكەم: مەسروفی مریشكێك بۆ بەرهەم هێنانی هێلكە :-

مەسروفی مریشكێك لەدوای دیاردەی پەروەرینەوە دەست بكات بەبەرهەم هێنانی هێلكە، كەمترە لەوەی كە جوجكێك بەخێوبكرێت لەتەمەنی یەك ڕۆژەیەوە تا تەمەنی هێلكەكردن، ئەم ڕاستیەش ئەوە دەردەخات كە پەروەرینی مریشكی هێلكەكەر لە ڕووی ئابوریەوە سودمەندە.

## دووەم :ژمارەی هێلكەی بەرهەم هێنراو:-

ژمارەی هێلكە بەرهەم هاتوو لەلایەن مریشكی هێلكە كەرەوە لە سوڕی یەكەمی هێلكەكردندا زیاترە وەك لەسوڕی‌دووەمی هێلكەكردن،بەڕێژەی نزیكەی ٥٪.

## سێیەم :ڕێژەی لەناوچوون {واتە ڕێژەی مردنی مریشك} :-

ڕێژەی لەناوچوون لە مانگێكدا لەسوڕی یەكەمی هێلكەكردندا كەمێك زیاترە وەك لەسوڕی دووەمی هێلكەكردندا {بەڕێژەی لە ٢٪ زیاترە}.

## چوارەم: بەكارهێنانی خۆراك:-

بەشێوەیەكی سروشتی بەكارهێنانی خۆراك لەلایەن مریشكی هێلكە كەرەوە لە سوڕی دووەمی هێلكەكردندا زیاترە وەك لەسوڕی یەكەمی هێلكەكردن بەڵام ئەمە

زیاتر پابەندە بەوەی کە کێشی مریشکەکە تا چەند کەم دەکات لەکاتی پەروەریندا ئەگەر کێشی مریشکەکە زۆر کەم بکات ئەوا بەکارهێنانی خۆراك لەلایەن مریشکەکەوە کەم دەکات.

## پێنجەم :درێژی ماوەی هێلکەکردن :-

ماوە هێلکەکردن لەسوڕی یەکەمی هێلکەکردندا درێژترە لە ماوەی هێلکەکردن لەسوڕی دووەمی هێلکەکردن، ماوەی هێلکە کردن لەسوڕی دووەمدا نزیکەی {٧-٩} مانگ دەبێت.

## شەشەم :قەبارەی هێلکەی بەرهەم هێنراو :-

قەبارەی هێلکەی بەرهەم هاتوو لەسوڕی دووەمی هێلکەکردندا گەورەترە وەك لە سوڕی یەکەم ئەمەش قازانجێکی باشی دەبێت لە بازاڕدا بەوەی نرخی فرۆشتنی زیاتردەبێت.

## حەوتەم :چۆنیەتی توێکڵی هێلکە :-

بەشێوەیەکی گشتی جۆری توێکڵی هێلکەی بەرهەم هاتوو لەسوڕی یەکەمی هێلکەکردندا باشترە وەك لە سوڕی دووەمی هێلکەکردندا دوای پەروەرین، هەروەها توێکڵی هێلکە لەکاتی هێلکەکردندا بەرەبەرە بەرەو خراپ بوون دەچێت بەڵام لەکاتی پەروەریندا کە ماوەی پشوی مریشکی هێلکەکەرە، توێکڵی هێلکە دەگەڕێتەوە سەردۆخی جارانی بەشێوەیەکی باش.

توێکڵی هێلکەی مریشکی هێلکەکەر لەسوڕی دووەمی هێلکەکردندا خێراترو زووتر بەرەو خراپ بوون دەچێت وەك سوڕی یەکەمی هێلکەکردن و بەرزبونەوەی پلەی گەرمی ژینگەش ڕێگەخۆشکەرێکی چاکە.

## هەشتەم:چۆنیەتی پێکهاتەی ناوەوەی هێلکە:-

لەسوڕی دووەمی هێلکەکردندا پێکهاتەی ناوەوەی هێلکە لە ڕووی چۆنیەتی وە خراپترە لە هێلکەی سوڕی یەکەمی هێلکەکردن.بەهرە

## A.پرۆگرامی پەروەرینی دووسوڕی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:-

-{١٠-١٢} مانگ بەرهەم هێنانی هێلکە

-{٦-٨} هەفتە پەروەرین

-{٦-٧}مانگ بەرهەم هێنانی هێلکە

---

{١٨-٢١} مانگ کۆی گشتی

## B. پرۆگرامی پەروەرینی سێ سوڕی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:-

-{٨-٩} مانگ بەرهەم هێنانی هێلکە

-{٦-٨}هەفتە پەروەرین

-{٦-٧} مانگ بەرهەم هێنانی هێلکە

-{٦-٨}هەفتەپەروەرین

-{٥-٦} مانگ بەرهەم هێنانی هێلکە

---

{٢٢-٢٦} مانگ کۆی گشتی

## نمونەیەك لە پرۆگرامی پەروەردنی دەستکرد

## تێبینی/+ئاوی دەدرێتێ- ئاوو خۆراکی نادرێتێ

| ڕووناکی | ئاو | خۆراك | | ڕۆژ |
|---|---|---|---|---|
| ٨کاتژمێر | | - | - | ١<br>٢ |
| | + | مریشکی<br>هێلکە بۆ گۆشت<br>٦،٨کغم<br>بۆ ١٠٠مریشك | مریشکی<br>هێلکە بۆهێلکە ٥،٤<br>بۆ ١٠٠ مریشك | ٣ |
| | - | - | | ٤ |
| | + | هەروەکو ڕۆژی سێیەم | | ٥ |
| | - | - | | ٦ |
| | + | هەروەکو ڕۆژی سێیەم | | ٧ |
| | - | - | | ٨ |
| | + | هەروەکو ڕۆژی سێیەم | | ٩ |
| ١٤-١٦<br>کاتژمێر | + | بەڕێژەی ٧٥٪ خۆراك بدرێت | | ١٠<br>لەماوەی ٥٥-<br>٦٠ |
| | | خۆراکی<br>تەواو بدرێت | خۆراکی<br>تەواو بدرێت | ٦١ |

سەرچاوە: Commerical Chicken production manual

# نەخۆشی گەمبۆرۆ

# Gumboro

# "Infectious Bursal Disease" "IBD"

بەرهەم هێنانی گۆشتی سپی لە پەلەوەردا، یەکێکە لە پیشەسازی یە سەرەکی یەکانی کە لەم دواییەدا لە وولاتی ئێمەدا گرنگی یەکی تایبەتی پێ دراوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە سەرچاوەیەکی گرنگی پرۆتین دادەنرێت و لە ئەنجامیشدا بۆشاییەك لە پێداویستی یە خۆراکی یەکان پڕدەکاتەوە، گۆشتی سپی (مریشك) چەند خەسڵەتێکی تایبەتی هەیە کە وای کردووە مرۆڤ زیاتر سوودی لێوەربگرێت وەك لە گۆشتی سوور هەروەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا روون کراوەتەوە:-

| | پرۆتین٪ | چەوری٪ | ئاو٪ |
|---|---|---|---|
| ١- گۆشتی سپی (مریشك) | ٢٨,٤٥ | ٤,٣٠ | ٦٦,٥ |
| ٢- گۆشتی سوور (ئاژەڵ) | ٢١,٥ | ٣١ | ٤٦,٥ |

لەبەر ئەوە پێویستە کێڵگەکانی بەخێوکردنی پەلەوەر بپارێزرێت لە نەخۆشی یە کوشندەکان و لە ئەنجامدا پیشەسازی پەلەوەر گەشە بکات، یەکێك لەو نەخۆشیە ترسناکانەی مریشك نەخۆشی گومبۆرۆیە کە زەرەرو زیانێکی گەورە بە خاوەن کێڵگەکان و ئابووری وڵات دەگەیەنێت.

## نەخۆشی گەمبۆرۆ "Gumboro Disease" :-

نەخۆشیی یەکی ڤایرۆسی توندو تیژەو کار دەکاتە سەر کۆئەندامی بەرگری لەشی مریشك و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی نەمانی بەرگری و رێگە خۆش دەکات بە

تووش بوون بە نەخۆشیيە جۆر بەجۆرەکانی دیکەی مریشك‌و دەتوانین بلێین کە نەخۆشی گەمبۆرۆ نەخۆشی ئایدزە (AIDS) لە مریشکدا.

هۆکاری ئەم نەخۆشیيە تووشی گلاندی بۆرسا (Bursa of fabricius) دەبێت‌و هەر لەبەر ئەوەشە پێی دەوترێت "Infectious Bursal Disease"

هەروەها کار دەکاتە سەر گورچیلەکانی مریشك‌و لە ئەنجامدا پێی دەوترێت (Avian Nephrosis).

هۆکاری نەخۆشی گەمبۆرۆ تووشی مرۆڤ نابێت‌و هیچ مەترسیەکی لەسەر تەندروستی مرۆڤ نییە.

## کورتەيەکی مێژوویی :-

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦٢ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دۆزرایەوە لە لایەن کۆسگرۆڤ "Cosgrove" و ناوی لێنا: (Avian Nepheosis) . چونکە نیشانەکانی لەسەر گورچیلەی مریشك بە ئاشکرا دیاریبوو، و یەکەم شۆڕشی نەخۆشی گەمبۆرۆ لە جیهاندا لە ناوچەی گەمبۆرۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەری هەڵداو هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو ناوی لێنرا نەخۆشی گەمبۆرۆ.

لە دوایشدا هچنر (Hitchner) پێشنیاری ئەمەی کرد کە بەم نەخۆشیيە بوترێت "Infectious Bursal Disease " چونکە هۆکاری ئەم نەخۆشیيە بە شێوەیەکی سەرەکی کاردەکاتە سەر گلاندنی بۆرساو لە ئەنجامدا هەوکردنی‌و گەورە بوونی.

و لە ساڵی ١٩٧٢دا Allan سەلماندی کە ڤایرۆسی ئەم نەخۆشیيە دەبێتە هۆی نەمانی بەرگری لە مریشکدا بە تایبەتی لە تەمەنی بچووکدا.

## هۆكاری نەخۆشی گەمبۆرۆ "Causative agent"

هۆكاری نەخۆشی گەمبۆرۆ ڤایرۆسە لە جۆری "RNA"و سەر بە خێزانی "Birna Viridae" لە توخمی "Birna Virus".

- تیرەکەی لە نێوان ٥٥-٦٥ نانومیترە.
- لە پێکهاتنیدا چوار جۆر پرۆتین هەیە: VP4, VP3, VP2, VP1.
- ڤایرۆسی نەخۆشی گەمبۆرۆ (Birna Virus) زۆر جێگیرە لە پێکهاتنیدا کە ئەمە وای کردووە خۆڕاگربێت لە دژی ماددە کیمیاوییەکانی وەك ئیپەرو کلۆرۆفۆرمو توانای بەرهەڵستی کردنی هەیە لە ناوەندێك دا کە PH و بەڵام ناچالاك دەبێت لە ناوەندێك دا کە "PH12" بێت.
- لە پلەی گەرمی ٥٦ پلەی سەدی توانای مانەوەی هەیە بۆ ماوەی پێنج کات ژمێر.
- توانای مانەوەی هەیە بە چالاکی لە ناوندێك دا کە ٠,٥٪ ڤینۆڵی تێدا بێت بۆ ماوەی یەك کات ژمێر لە پلەی ٣٠ پ.س.
- ناچالاك دەبێت لەکاتی بەکارهێنانی لە ٠,٥٪ فۆرمالین بۆ ماوەی شەش کاتژمێر.

لەبەر سروشتی جێگیریو رەقی (Birna Virus) وای کردووە کە بە بەردەوامی لە کێڵگەکانی بە خێوکردنی پەلەوەردا بمێنێتەوە سەرەڕای بەکار هێنانی ماددە کیمیاوییە پاکژ کەرەوەکان بە بەردەوامیو هەمیشە هەڕەشەیەکی بەردەوامە بۆ سەر گەشەکردنو پێش کەوتنی پیشەسازی پەلەوەر.

## چۆنیەتی کاری ڤایرۆسی گەمبۆرۆ لە لەشی مریشکدا:-

لە راستیدا ئەم نەخۆشی گەمبۆرۆیە بە نەخۆشی ئایدزی مریشك دادەنرێت، چونکە ڤایرۆسەکە بە شێوەیەکی سەرەکی کاردەکاتە سەر ئەو ئەندامو رژێنانەی کە فەرمانیان بریتیە لە بەرگری کردن لە لەشی مریشكو لە ئەنجامدا کاری تێکدارانەی

خۆی تێدا دەکات و دەبێتە هۆی نەمانی بەرگری و نەمانی بەرهەڵستی سروشتی لە دژی نەخۆشی‌یە جۆربەجۆرەکانی دیکە (Immuno suppression) .

ڤایرۆسی Birna Virus تووشی خانەی لیمفۆسایتی ئەمانەی خوارەوە دەبێت:-

- **بۆرسا ( Bursa of fabricious )؛ کە بە گرنگترین و سەرەکی ترین رژێنی کۆئەندامی بەرگری لەشی باڵندە (مریشك) دادەنرێت.**
- **رژێنی هاردێریەن ( Harderian gland )**
- **دەکەوێتە بەشی سەرووی کۆئەندامی هەناسەی مریشك و بەرگری دەکات لە کۆئەندامی هەناسەدان.**
- **رژێنی زایمس** "Thymus gland"
- " Caecal Tonsils "
- **سپڵ** "Spleen"

ڤایرۆسەکە لە خانەی لیمفۆسایت بە تایبەتی جۆری B Iymphocyte دابەش دەبن و زۆر دەبن و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ژمارەی خانەی لیمفۆسایت لە لەشی مریشکداو بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی پەك خستنی کۆئەندامی بەرگری لەش.

## ئەنجامەکانی پەك کەوتنی کۆئەندامی بەرگری لەش:

پەك کەوتنی کۆئەندامی بەرگری لەش (Immuno suppression) یەکێکە لە دیاردە دیارەکانی نەخۆشی گەمبۆرۆ لە ئەنجامدا گەلێك دیاردەی ترسناکی لێدەکەوێتەوە، لەوانە:

یەکەم// ڕێگە خۆشکەرێك دەبێت بۆ تووش بوون بە گەلێك نەخۆشی کوشندەی جۆراوجۆری وەکو:

Inclusion body Hepatitis لەم دوو سێ ساڵەی دواییدا لە هۆڵەکانی پەلەوەردا گەلێك زەرەرو زیانی گەیاندووە مریشکەکە تووشی زەردوویی دەکات و هەر لەبەر ئەمەش پێی دەوترێت کەم خوێنی درمی (Infectious anemia)

- ریقنەی خوێناوی " Coccidiosis "
- Gengrenous Dermatitis
-

دووەم// کەم بوونەوەی بەرهەڵستی سروشتی لەش بەرامبەر هەندێك ڤایرۆس و بەکتریا و مایکۆپلازما وەکو E.Coil و My coplasma کە دەبنە هۆی نەخۆشی هەوکردنی توورەکە هەوایی‌یەکان (air sacculitis) .

سێیەم// پرۆسەی کوتان (Vaccination) لە دوای ڕوودانی نەخۆشی گەمبۆرۆ هیچ کاریگەری‌یەکی نابێت، بە تایبەتی بەکار هێنانی ڤاکسینی نەخۆشی نیوکاسڵ و IB، بەڵکو بە پێچەوانەوە کوتانی مریشك لە دژی ئەو نەخۆشیانە دەبێتە هۆی تووش بوون و سەرهەڵدانی ئەو نەخۆشیانە.

چوارەم// زیادبوونی ژمارەی لەناوچوون و کەم کردنەوەی خواردن و گەشە نەکردنی باڵندە.

## نیشانەکانی نەخۆشی گەمبۆرۆ:-

**یەکەم// لە تەمەنی (یەك رۆژ ---- سێ هەفتە):-**

هیچ نیشانەیەك لەسەر جوجکەکە دەرناکەوێت (Subclinical) بەلام خانەکانی لیمفۆسایت لەم تەمەنەدا زۆر هەستیارن بۆ ڤایرۆسی گەمبۆرۆ لە ئەنجامدا تێك دانی خانەکان و کەم بوونەوەی ژمارەیان و پەککەستنی کۆئەندامی بەرگری لەش.

**دووەم// لە تەمەنی سێ هەفتە بە دواوە:-**

1 -لەناکاو دەردەکەوێت و باڵندەی توشبوو لە خواردن دەکەوێت.
2 - توشی سکچون دەبێت (ریقنەی شل) .
3 -رێژەی توشبوون دەگاتە 100%
4 -رێژەی لەناو چوون دەگاتە 20-30%
5 -لەسێ رۆژی یەکەم لەدوای توشبون ژمارەی مریشکە لەناوچووەکان بەرەبەرە ژمارەی کەم دەکات

## <u>تووشبوون به گەمبۆرۆ لەم هێڵکاری‌یەدا پیشان دراوە :-</u>

**(تووش بوون به ڤایرۆسی گەمبۆرۆ)**

**یەك رۆژ ← ٣ هەفتە**

Subcliical

**دەرنەکەوتنی نیشانە**

↓

**پەککەوتنی کۆئەندامی بەرگری**

(Immuno suppression)

↓

- **کەم خۆراکی**
- **سك چوون**
- **رادەی لە ناوچوون ٣٠٪**

**٣ هەفتە بەدواوە**

clinical

↓

**پەککەوتنی کۆئەندامی بەرگری**

↓

**تووش بوون به نەخۆشی دی**
وەك نیوکاسل + IB

## له نیشانه دیارەکانی دوای مرداربوونەوە:-"Gross Lesions"

یەکـەم// مریشـکەکە ووشـك بونـەوەی پێـوە دیـارە لـە ئـەنجامی سك چوونێکی زۆر درێژخایەن.

دووەم// دەرکـەوتنی پەڵـەی سـوری خوێنـاوی لەسـەر ماسـولکەکانی سـنگ‌و ڕان‌و هـەروەها لەسـەر هێڵـی نێوان سیقەتۆرەو گەدەی ڕاستەقینە (Proventri Culus).

سێیەم// گلاندی بۆرسا قەبارەکـەی گـەورە دەبێت‌و هـەو دەکات بە تایبـەتی دوای ۳ رۆژ لە تووش بوون‌و بوونی مادەیەکی سپی (پەنیری) لە ناویدا، لە دوای ٥-٦ رۆژ بەرە بەرە قەبارەکەی بچووك دەبێتەوە.

چوارەم// گورچیلەکان گەورە دەبن‌و سوور دەبنەوە.

پێنجەم// گەورە بوونی جگەرو سپڵ.

شەشەم// لەبەر کەم بوونەوەی خواردن کیسی زراو گەورە دەبێت.

## دەس نیشان کردنی نەخۆشی گەمبۆرۆ:

بۆ ئەم مەبەستە پشت دەبەسترێت بە:

یەکەم/ مێژووی سەرهەڵدانی نەخۆشییەکە.

دووەم/ نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکە.

سێیەم/ نیشانەکانی دوای مرداربوونەوە.

چوارەم/ جیاکردنەوەو دەسنیشان کردنی هۆکاری نەخۆشییەکە.

پێنجەم/ تاقی کردنەوەی سیرۆلۆجی:-

گرنگترینیان تاقیکردنەوەی(ELISA) ە .

## چارەسەرکردن //

هەتاکو ئێستا هیچ چارەسەرێکی بۆ نەدۆزراوەتەوە.

## خۆپاراستن /

باشترین رێگە بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەم نەخۆشیە پرۆسەی کوتان (Vaccination) دژی نەخۆشی گەمبۆرۆ، پرۆگرامی کوتان لە دژی گەمبۆرۆ لە وڵاتی ئێمە بەم شێوەیەیە کە لە رێگەی ئاوی خواردنەوەوە بەکاردەهێنرێت:

یەکەم/ کوتان لە تەمەنی دوازدە رۆژ.

دووەم/ کوتان لە تەمەنی بیست و چوار رۆژ.

سێیەم/ کوتان لە تەمەنی سی و چوار رۆژ.

## ئەو سەرچاوانەی سوودم لێ وەرگرتووە:


Gumboro Vaccine-1

Nobilis R

Strain D78-

Calnek, B-w, Bannes, H.J., Beard,C.w., Msdougald, L.R.,and Saif, Y.M (1997). Diseases of poultry. 10th edition-USA- .-2

3-گۆڤاری دواجن الشرق الاوسط وشمال افريقيا.

ژمارە ١٤٧- ١٩٩٩

4-شارەزایی لە سەرپەرشتی کردنی هۆڵەکانی بەخێوکردنی پەلەوەر

# نەخۆشی (خوێن میزکە)
# Babesiosis

زانستی پزیشکی ڤێتەرنەری ئەو زانستە گرنگەیە کە بە شێوەیەکی فراوان لەو دەردو نەخۆشییانە دەکۆڵێتەوە کە تووشی ئاژەڵ و باڵندە دەبێت و هەروەها بایەخێکی تایبەتیش بە نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ (Zoonoses) دەدات، واتە ئەو دەردو نەخۆشیانەی کە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بە شێوەیەکی سروشتی دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

یەکێك لەو نەخۆشیانەی کە تووشی ئاژەڵ دەبێت و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ (لە ڕێگەی گەنەوە) دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ، نەخۆشی بابیبزیۆسزە "Babesiosis" کە لە ناو خەڵکدا بە نەخۆشی ( خوێن میزکە) ناسراوەو هەندێك جار پێشی دەوترێت نەخۆشی (زەردوویی)، لە وەرزە گەرمەکاندا بڵاودەبێتەوەو لە ئەنجامدا زەرەرو زیانێکی گەورە بە ئابووری وڵات و تەندروستی ئاژەڵ و هەروەها تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت جا لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی کە چەند زانیارییەکی پێویست دەربارەی ئەم نەخۆشییە بخەمە پێش چاوی خوێنەران بە هیوای بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تەندروستی.

## بابیزیۆسز (خوێن میزکە) چییە؟

- لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەریئەم نەخۆشییە چەند ناوێکی دیکەی هەیە لەوانەش:-
- - نەخۆشی پایرۆپلازمۆسز " Piroplasmosis"
- - نەخۆشی تای تێکساس " Texas Fever"

- - نەخۆشی " Redwater Fever "

- لەناو خەڵکداو بە تایبەتی لە نێوان گوند نشینەکاندا پێی دەوترێت خوێن میزکە چونکە یەکێك لە نیشانە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشییە کەلەسەر ئاژەڵی تووش بوو دەردەکەوێت ئەوەیە کە میزەکەی رەنگی رەش دەبێت و هەندێك جاریش لە هەندێك ناوچەی کوردستاندا پێی دەوترێت نەخۆشی زەردوویی چونکە لاشەی ئاژەڵی مردارەوە بوو زەرد هەڵدەگەڕێت.

نەخۆشی بابیزیۆسز لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا بڵاوە بەتایبەتی لەناوچە گەرمەکانداو لە کوردستانیشدا لە وەرزەکانی بەهارو هاویندا تەشەنە دەکات چونکە لەم وەرزانەدا گەنە بە شێوەیەکی خێرا نەش و نما دەکەن و زۆر دەبن لە لەوەڕگەکاندا، گەنە هەروەك گوێزەرەوەیەکی بایۆلۆژی هۆکاری ئەم نەخۆشییە لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی دیکەو هەروەها لە ئاژەڵەوە بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە هەر لەبەر ئەمەشە بەم نەخۆشییە دەوترێت تای گەنە (Tick Fever) .

- -نەخۆشی بابیزیۆسز تووشی مەڕو بزن و گا و مانگا و ئەسپ و سەگ و پشیلەو بەرازو مرۆڤ دەبێت و کارێکی خراپ دەکاتە سەر تەندروستیان چونکە هۆکاری ئەم نەخۆشییەدەگەڕێتەوە بۆ مشەخۆرێکی خوێن Blood Parasite » کە پێی دەوترێت بابیزیا "Babesi a"و دەبێتە هۆی شیبوونەوەو تێك شکاندنی ژمارەیەکی زۆر لە خڕۆکە سوورەکانی خوێن.

- دیاردەی زەردوویی چی دەگەیەنێت:

- دیاردەی زەردوویی لە ئەنجامی کۆمەڵ بوونی بڕێکی زۆر لە مادەیەکی رەنگ زەرد کە پێی دەوترێت بلیرۆبین (Bilirubin) لە خوێندا دروست دەبێت و لە هەمان کاتدا لە رێگەی خوێنەوە دەگاتە هەموو خانەو شانەکانی لەش و لە ئەنجامدا زەرد هەڵگەڕانیان .

- بیلیرۆبین ( Bilirubin ) مادەیەکی ڕەنگ زەردەو بە شێوەیەکی سروشتی لە ئەنجامی شیبوونەوەی خڕۆکە سوورەکانی خوێن بە تایبەتی هیم(Haem) پەیدا دەبێت و نابێتە هۆی زەرد هەڵگەڕانی شانەکانی لەش، بەڵام لە کاتی شیبوونەوەو تێک شکاندنی خڕۆکە سوورەکانی خوێن بە شێوەیەکی ناسروشتی لەژێر کاریگەری هۆکارێکدا، بیلیرۆبین بڕەکەی لە خوێندا زیاد دەکات لە ئەنجامدا لە ڕێگەی خوێنەوە بە هەموو لەشدا بڵاو دەبێتەوەو زەرد هەڵدەگەڕێت.

- بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆر بیلیرۆبین هەیە:-
- یەکەم/ بیلیرۆبینی یەککگرتوو: Conjugated Bilirubin
- ئەم جۆرە لە دوای گەیشتنی بیلیرۆبین لە ڕێگەی خوێنەوە بە خانەکانی جگەرەوە دروست دەبێت ( Hepato Cyto ) و لە ئەنجامدا یەککگرتنی لە گەڵ ترشی گلوکۆرۆنیک ( Glucuronic ) بە یارمەتی ئەنزیمێك کە پێی دەوترێت: ( Glucuronyl transferases ).
- دووەم/ بیلیرۆبینی یەکنەگرتوو ( UnConjugated Bilirubin ):
- ئەم جۆرە هێشتا نەگەیشتۆتە خانەکانی جگەرو یەکی نەگرتووە لە گەڵ ترشی گلوکۆرۆنیك.
- کەواتە دەتوانین بڵێین کە دیاردەی زەردوویی لە ئەنجامی هۆکارێکی نەخۆشخەرەوە کە تووشی خڕۆکە سورەکانی خوێن دەبێت پەیدا دەبێت و پزیشکان بە گشتی هەروەك نیشانەیەکی گرنگ سوودی لێوەردەگرن بۆ دیاری کردنی نەخۆشییە سەرەکییەکە.

- یە کێك لە نیشانە سەرەکییەکانی نەخۆشی بابیزیۆسز دیاردەی زەردوویییە، ئەمەش کەمشەخۆری خوێن بابیزیا ( Babesi a ) هێرش دەباتە سەر خڕۆکە سورەکانی خوێن پەیدا دەبێت و لە ئەنجامدا شیبوونەوەو تێك شکاندنیان بە

شێوەیەکی ناسروشتی و زیاد بوونی بڕی بیلیرۆبین لە خوێندا زەردهەڵگەڕانی شانەکانی لەش. کەواتە (زەردوویی نەخۆشی نییە، بەڵکو نیشانەیە).

- هۆکاری نەخۆشی بابیزیۆسز "Babesi osi s" :

- بۆ یەکەم جار زانای ڕۆمانی ( Babes ) لە ساڵی ١٨٨٨ز هۆکاری ئەم نەخۆشییەی دۆزییەوە لە خوێنی چەند منداڵێکی تووش بوو بە میزی خوێناوی و ناوی لێنرا بابیزیا "Babesia"

- وە لە ساڵی ١٨٩٣ز هەردو زانای ئەمریکی: ( Kilborne . Smith ) لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەلماندیان کە بابیزیا، بەکتریا نییەو بەڵکو مشەخۆرێکی خوێنەو لە خڕۆکە سورەکانی خوێندا، گەشە دەکەن و زۆر دەبن و دەبنە هۆی خوێن میزکە لە مانگاداو هەروەها بەم نەخۆشییەیان دەگوت: تای تێکساس ( Texas Fever ).

- بابیزیا لە زیندەوەرە سەرەتاییەکانەو سەر بە خێزانی "Babesi dae"ە، هەروەها لە مشەخۆرەکانی خوێنەو ( i nt r aer yt hr ocyt i c Pr ot ozoan Par asi t es ) واتە هێرش دەباتە سەر خڕۆکە سورەکانی خوێن و تێیدا نیشتەجێ دەبێت و گەشە دەکەن و زۆر دەبن و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی شیبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خڕۆکە سورەکانی خوێن. بابیزیا چەند شێوەیەکی جیاواز جیاوازی هەیە لەوانەش (هێلکەیی – هەرمێیی – خڕ...هتد).

- سوڕی ژیانی مشەخۆری بابیزیا بەشێکی لە خانە خوێی بڕبڕەدارەکاندا (ئاژەڵ یان مرۆڤ) بەسەر دەبات و بەشەکەی دیکەی لەلەشی گەنەدا بەسەر دەبات، واتە گەنە هەروەک گوێزەرەوەیەکی بایۆلۆژی لەم نەخۆشییەدا ڕۆڵی هەیە.

- مشـەخۆری بابیزیـا چـەند جـۆرێکی هەیـەو هـەر جـۆرەش تایبەتـە بەخانـە خوێیەك، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم/ جۆری:

Babesia divergens

Babesia bigemina تووشی مانگا دەبێت

Babesia bovis

دووەم/ جۆری:

Babesia motasi تووشی مەڕو بزن دەبێت

Babesia ovis

سێیەم/ جۆری:

Babesia equi تووشی ئەسپ دەبێت

Babesia caballi

چوارەم/ جۆری:

Babesia canis

Babesia felis تووشی سەگو پشیلە دەبێت

## -کاریگەری نەخۆشخەرانەی مشەخۆری بابیزیا "Babesia"

- دوای تـووش بـوون بە مشـەخۆری بابیزیـا و گەیشـتنی بـە خـوێنو بە تایبـەتی خڕۆکـە سـورەکانی خـوێن، دەسـت دەکـەن بـە دابـەش بـوونو لـە ئەنجامـدا ژمارەیـان لـە نـاو خڕۆکـە سـورەکانی خـوێن زیـاد دەکـاتو دەبنـە هـۆی تێـك شـکاندنو شـیبوونەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـە خڕۆکـە سـورەکانو ڕوودانـی ئەمانەی خوارەوە:

هەشتەم/ دوای مرداربوونەوەی ئاژەڵی تووشبوو:

- قەبارەی جگەر گەورە دەبێت.
- قەبارەی سپڵ گەورە ا ــ "heamolobinuria"
- قەبارەی تورەکەی زراو گەورە دەبێت.
- زەردبوونی ئەندامەکانی ناوەوەی لەشی ئاژەڵەکە.
- لاشەکە بە گشتی زەرد هەڵدەگەڕێت.
- خوێنی ئاژەڵەکە روون دەبێتەوە واتە ئاوی دەبێت.

## نەخۆشی بابیزیۆسز لەمرۆڤدا :-

- هەروەك لە نامیلکەی (Hand book of Anemia) دا کەلەساڵی ١٩٩١ لە وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا چاپ کراوە، ئەوە پیشان دراوە کە بابیزیا بە یەکێك لەمشەخۆرەکانی خڕۆکە سورەکانی خوێنی مرۆڤ دادەنرێت.

نەخۆشی بابیزیۆسز بە رێژەیەکی کەم تووشی مرۆڤ دەبێت بەلام لە مرۆڤدا نەخۆشییەکی کوشندەیەو لە نیشانە سەرەکی‌یەکانی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش (تا)و بێ هێزی‌یەکی زۆرو کەم خوێنی لە ئەنجامی شی‌بوونەوەی خڕۆکە سورەکانی خوێن. هۆی سەرەکی بابیزیۆسز لە مرۆڤدا دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك مشەخۆر کە پێی دەوترێت (Babesia microti) کە لە وەرزەکانی هاویندا لە رێگەی گەنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ کەبەشێوەیەکی سروشتی ئەم مشەخۆرە لە مشکدا هەیەو زیاتر لە هەندێك لە ناوچەکانی ئەمریکای باکوردا بلاوە.

## خۆپاراستن و چارەسەرکردن:

- لە هەموو کات و سەردەمێکدا خۆپاراستن باشترە لە چارەسەرکردن و ئەم ووتەیە زۆر گونجاوە لە گەڵ نەخۆشی بابیزیۆسز چونکە خۆپاراستن لەم نەخۆشی‌یە بە ئاسانترین و هەرزانترین رێگە چارە دادەنرێت ئەویش بە قەلاچۆ کردنی گەنە لە وەرزەکانی بەهارو هاویندا و نەهێشتنی گەیشتنی گەنە بە ئاژەڵەکانمان بە

تایبەتی لە ناوچە گوند نشینەکاندا ئەمەش دەبێت بە دانانی بەرنامەیەکی داڕێژراو بە مەبەستی شۆردنەوەی ئاژەڵ بە شێوەیەکی بەردەوام بەبەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کە دەبنە هۆی لەناوبردنی گەنەو هەموو مشەخۆرە دەرەکییەکان وەکو دەرمانی (Diazinon %٦٠).

- ئەو دەرمانانەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بابیزیۆسز:

١- Diaminzine

٢- Imizol

٣- Piroplasminl

٤- Oxytetracycline

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێوەرگیراوە:

1-G.David Roodman and Jerry L.spivak "Hand book of Anemia" 1991

2-Abram S.Benen Son "Control of Communicable Disease in man" 1980

3-D.C.Blood and J.A.Hender Son "Veterinary Medicine" 1979

4-The Merck Veterinary Manual. 1998

٥- گۆڤاری ئەکادیمی ژمارە (١) ساڵی ١٩٩٩ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی (The Mechanism of Intoxication by Piroplasmin)

- دکتۆر فەرەیدون عبدالستار محمد ئەمین

٦- علم الطفيليات البيطرية الجزء الثاني) (مفصليه الارجل والاوالي الحيوانيه) د. بهاو محمد عبداللطيف

٧- Vinogradov, "Differentail Diagnosis of Internal Diseases"

٨- گۆڤاری بژوێن ژمارە (٤) ١٩٩٩ ووتاری:

(نەخۆشی هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ)

# نەخۆشی تەبەق

## Foot – and – Mouth Disease

یەکێك لە دوژمنە سەرسەختەکانی سامانی ئاژەڵ نەخۆشی تەبەقە "F.M.D" کە بەبەردەوامی هەڕەشەی نەمان لە ئاژەڵی بێ زمان دەکاتو ساڵانە زیان دەگەیەنێت بە ئابوری وڵاتانی جیهان. لەم چەند مانگەی دواییدا کەناڵە جیاجیاکانی راگەیاندنی جیهانی زۆر بە گەرمییەوە دەنگوباسی بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردنی نەخۆشی تەبەقیان بڵاوکردەوە لە نێوان ئاژەڵەکانی وڵاتانی بەریتانیاو وڵاتانی دیکەی جیهان بە شێوەیەك کە لێپرسراوان لەو وڵاتانەدا بڕیاری سوتاندنو لەناوبردنی ئەو ئاژەڵانەیان داوە کە تووشی نەخۆشی تەبەق بوونو بەمەش مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی ترسی لێنیشتووە چونکە نەخۆشییەکە لە ئاژەڵی دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ، و هەروەها دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگەو تا ئێستاش زیانەکان لە بەریتانیا گەیشتۆتە (٤٠٠) ملیۆن دۆلار.

## نەخۆشی تەبەق "F.M.D" چی دەگەیەنێت:

لە کوردەواریدا پێی دەوترێت تەبەقو لە وڵاتانی عەرەبیشدا پێی دەوترێت "الحمى القلاعيه" کە نەخۆشییەکی ڤایرۆسی تونذو تیژەو تووشی زۆربەی ئاژەڵەکان دەبێت بە تایبەتی ئاژەڵە دوو سمەکان "Cloven footed animals" وەکو گاو مانگاو گامێشو بەرازو مەڕو بزنو هەروەها ئاژەڵە کاوێژکەرە کێوییەکانو لە ئاژەڵیشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ. نیشانە دیارەکانی نەخۆشی تەبەق زیاتر لە دەمو سمەکانیاندا دەردەکەوێت هەر لەبەر ئەمەشە ناونراوە: "Foot and Mouth Disease".

نەخۆشی تەبەق لە زووربەی وڵاتانی جیهاندا هەیە بە درێژایی سەدەو نیوێك چەندەها جار لە شێوەی شۆڕشی نەخۆشی تەشەنەی كردووە لە وڵاتەكانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستو كیشوەری ئەفەریقیاو ئاسیاو ئەوروپاو ئەمەریكاو ئوسترالیاو یابانو لەم دوایشدا زەبری گورچكبڕی وەشاند لە دژی خاوەن ئاژەڵەكانی بەریتانیاو لە ئەنجامدا زیانی گەورەی پێگەیاندن.

نەخۆشی تەبەق زۆر بە توندی تووشی گاو مانگاو گوێرەكە دەبێتو ئاژەڵی تەمەن بچوك بە هیچ شێوەیەك بەرگەی نەخۆشییەكە ناگرنو ڕێژەی لەناوچوونو تووشبوون زۆر بەرزە تیایاندا، بەڵام ئەوەی شایانی باسە پلەی توندوتیژی نەخۆشییەكە لە مەڕو بزندا زۆر كەمترە لە پلەی توندوتیژی لە گاو مانگاداو بە شێوەیەك كە كەمتر نیشانەكانی پێوە دیار دەبێتو زیاتر مەڕو بزن هەروەكو هەڵگرێكی ڤایرۆسەكە"Carriers" دەبنو بە پێی سەرچاوە پزیشكییەكانی ڤێترینەری بۆ ماوەی نۆ مانگ دەمێننەوەو لە ئەنجامدا لە بارودۆخی تایبەتدا دەبێتە هۆی سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەكە.

نەخۆشی تەبەق یەكێكە لە نەخۆشییە هاوبەشەكانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ (دەردە مرۆژەڵییەكان)، نەخۆشییەكە لە ئاژەڵی تووشبووەوە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و خۆشبەختانە كاریگەرییەكی نەخۆشخەرانەی ئەوتۆی نییە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ چونكە مرۆڤ خانەخوێیەكی هەستیار نییە بۆ ڤایرۆسی نەخۆشییەكە.

## نەخۆشی تەبەق چەند زەرەرو زیانێکی ئابوری دەگەیەنێت لەوانەش:

- ڕێژەی تووشبوون و لەناوچوون لە نێوان ئاژەڵەکاندا زۆر بەرزە.
- کەم بوونەوەی بەرهەمی شیرو گۆشت بە شێوەیەکی بەرچاو.
- بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ئاژەڵی تووشبوویی بەرهەم دەمێننەوەو سوودی لێ وەرناگیرێت.

نەخۆشی تەبەق هەر لە ساڵی ۱۸۹۷ز هۆکارەکەی دۆزراوەتەوەو هەر لەو ساوە هەتاکو ئەم سەردەمە بوونی هەیەو کۆتایی نەهاتووەو نەتوانراوە کۆنترۆڵ بکرێت بە شێوەیەکی بنەڕەتی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە :

یەکەم: تەبەق نەخۆشییەکی ڤایرۆسی توندوتیژی سارییە.

دووەم: ڤایرۆسی نەخۆشییەکە کۆمەڵێك خانەخوێی هەیە:

سێیەم: هۆکاری نەخۆشییەکە چەند جۆرێکی سەرەکی و لاوەکی هەیە.

## هۆکاری نەخۆشی تەبەق "F.M.D" :

سێیەم: هۆکاری نەخۆشیەکە چەند جۆرێکی جیاواز جیاوازە:

نەخۆشی تەبەق "F.M.D" نەخۆشییەکی ڤایرۆسییەو جۆرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسێك کە پێی دەوترێت (Aphtho virus) کە سەر بە خێزانی (Picorna Viridae) یە وەلە کۆمەڵەی (RNA Virus)، وە ئەوەی شایانی باس بێت ڤایرۆسی نەخۆشی تەبەق لە ئاژەڵدا یەکەم ڤایرۆس بوو کە دۆزرایەوە لە ساڵی ۱۸۹۷ز لەلایەن هەردوو زانا:

.(Loeffler and Froch)

(7 — ڤایرۆســـی نەخۆشـــی تەبـــەق حـــەوت جـــۆری ســـەرەکی Serotypes) هەیە بەم شێوەیە:

١- جۆری "A"

٢- جۆری "C"

٣- جۆری "O"

ئەم سێ جۆرە لە زۆربەی ولآتانی جیهاندا بلآوبوونەتەوە.

٤- جۆری SAT- 1

٥- SAT- 2

٦- SAT- 3

ئەم سێ جۆرە لە ولآتانی کیشوەری ئەفریقیادا هەیە.

٧- جۆری ASIA- 1 زیاتر لە ولآتانی کیشوەری ئاسیادا هەیە. بە تایبەتی لە چین و پاکستان و هندستان و ئێران و هونگ کونگ و تایلند بلآوبونەتەوەو بە پێی سەرچاوە پزیشکییەکان هەر سێ جۆری (Asia 1,O,A) لە عیراقدا هەیە.

سەرەڕای ئەو حەوت جۆرە سەرەکییە، هەر جۆرەیان لە ئەنجامی بازدانی بۆمـــاوەیی (mutation) چـــەند جـــۆرێکی لاوەکـــی تـــری لێ دروســـت دەبێـــت (Subserotypes)و بە پێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرینەری نزیکەی "٦٥" شەست و پێنج جۆری لاوەکی لێ دروست بووە بەم شێوەیە:

- ٣٢ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی "A" دروست بوو.
- ١١ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی "O" دروست بوو.
- ٥ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی "C" دروست بوو.
- ٧ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی SAT- 1 دروست بوو.
- ٢ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی SAT- 2 دروست بوو.

- ٤ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی SAT- 3 دروست بوو.
- ٣ جۆری لاوەکی لە جۆری سەرەکی Asia- 1 دروست بوو.

## خەسڵەتە تایبەتەکانی ڤایرۆسی نەخۆشی تەبەق:

یەکەم: هیچ جۆرە پەیوەندی‌یەکی ئەنتیجینی (Antigenic relationship) نی‌یە لە نێوان جۆرە سەرەکی‌یەکان و لاوەکی‌یەکاندا واتە بە هیچ شێوەیەك دیاردەی (Cross- immunity) نی‌یە لە نێوانیاندا کە بێگومان ئەمەش هۆیەکە لە هۆیەکانی کۆنترۆڵ نەکردنی نەخۆشی‌یەکە هەتاکو ئەم سەردەمە.

دووەم: قەبارەی ڤایرۆسەکە بچوکەو نزیکەی (٢٠-٣٠) نانۆمیترە.

سێ‌یەم: توانای بەرهەڵستی کردنی ماددەی ئەلکهول و ئیترو کلۆرۆفۆرم و هەموو توێنەرەوە چەوری‌یەکانی هەیە.

چوارەم: لە پلەی کوڵاندا ڤایرۆسەکە لەناو دەچێت.

پێنجەم: توانای مانەوەی هەیە بۆ ماوەی مانگێك لە تۆوی گادا لە پلەی (-٧٩) پ.س.

شەشەم: بە شێوەیەکی گشتی ڤایرۆسەکە توانای مانەوەی هەیە لە بارو دۆخی سارداو بە پێچەوانەوە لەناودەچێت لە بارودۆخی گەرمدا.

حەوتەم: شوێنی هەڵبژێراوی ڤایرۆسەکە لە لەشی ئاژەڵدا زیاتر مەیلی هەیە بۆ پەردەی ناوپۆشی بۆشایی دەم و هەروەها پێستی نێوان سمەکانی ئاژەڵەکەو هەندێك جۆریش مەیلی هەیە بۆ ماسولکەی دڵی ئاژەڵەکەو دەبێتە هۆی (Myocarditis).

هەشتەم: لە ماوەی چەند خولەکێکدا ڤایرۆسەکە بەم ماددانە لەناو دەچێت:

- Sodium hydroxide
- Formalin 1-2%

- Sodium Carbonate 4%

## نیشانەکان CliniCal Findings:

توندوتیژی نەخۆشی تەبەق و دەرکەوتنی نیشانەکان بە شێوەیەکی گشتی بەندە لەسەر:

یەکەم: جۆری ڤایرۆس (Strain of the Virus)

دووەم: ئاستی بەرگری لە لەشی ئاژەڵەکەدا. (Immune Status of the animal)

## لە مانگادا:

لە کاتی تووشبوونی مانگادا نیشانەکان بە شێوەیەکی دیار دەردەکەون لەوانەش:

ماوەی چونە ژوورەوەی ڤایرۆسەکە بۆ ناو لەشی ئاژەڵ و هەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییەکە نزیکەی (١-١٤) رۆژ دەخایەنێت.

پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵی تووش بوو بەرز دەبێتەوەو دەگاتە (٤٠-٤١) پ.س و ئاژەڵەکە لەلەوەڕ دەکەوێت و لاوازو بێ هێز دەبێت.

بۆشایی دەمی ئاژەڵی تووشبوو سوور دەبێتەوەو تووشی هەوکردن دەبێت (Stomatitis) و لیکی زۆر بە دەمیدا دێتە خوارەوە ئەمەش لە ئەنجامی دروست بوونی تلۆقدا روودەدات (Vesicles) لەسەر زمان و ژێر زمان و بەشەکانی دیکەی دەم و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی برین و ئازارێکی زۆری پێوە دیارە.

چاوی ئاژەڵی توشبوو ئاوێکی زۆر دەکات.

ئاژەڵی توشبوو دەشەلێت لە ئەنجامی دروست بوونی تلۆق لە نێوان سمەکانیدا بەرەبەرە هەو دەکات و ئاژەڵەکە بە لایەکدا دەکەوێت و توانای جوڵەی

نامێنێت، هەر لەبەر ئەوەشە کە تلۆق لە دەم و قاچی ئاژەڵی تووشبوو دروست دەبێت پێی دەوترێت نەخۆشی قاچ و دەم: (Foot and Mouth Disease)

هەندێك جار تلۆق لەسەر گوانی ئاژەڵی تووشبوو دروست دەبێت و دەبێتە هۆی هەوکردنی گوان (Mastitis).

ئاژەڵی ئاوس بەردەخات (Abortion) لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشی.

بەرهەمی شیر بەڕێژەیەکی لەبەرچاو کەم دەکات.

- شێوەیەك لە شێوەکانی نەخۆشیەکە پێی دەوترێت (Malignant form) دەبێتە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئاژەڵە تووشبووەکان بە تایبەتی ئاژەڵە تەمەن بچوکەکان لە ئەنجامی ئەوەی جۆرێك لە ڤایرۆسەکە تووشی ماسولکەی دڵ دەبێت و دەبێتە هۆی هەوکردنی دڵ (Myocarditis)

## لە مەڕو بزندا:

لە مەڕو بزندا نیشانەکانی نەخۆشی تەبەق زۆر ئاشکراو دیار نین هەروەك لە مانگادا پێوەی دیارە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە چونکە مەڕو بزن هەروەك هەڵگرێکی ڤایرۆسەکە کاردەکات و لەبارو دۆخی گونجاودا دەگوێزرێتەوە بۆ مانگاو لە ئەنجامدا تووشی نەخۆشییەکە دەبێت..

- شەلینی ئاژەڵەکە بە شێوەیەکی دیار کە ئازارێکی تیژی پێوە دیارە بەسەرەکیترین نیشانە دادەنرێت لە مەڕو بزن دا.

- لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکەدا ڕێژەی لە ناوچوونی کارو بەرخ زۆر زیاترە بەبەراورد لە گەڵ مەڕو بزندا.

## - ڕێگاکانی گواستنەوەی نەخۆشی تەبەق:

ڤایرۆسی نەخۆشی تەبەق زۆر بە خێرایی دەگوێزرێتەوەو لە شێوەی شۆڕشێکی نەخۆشیدا لە نێوان ئاژەڵەکاندا تەشەنە دەکات بە دووری ٦٠کم هەڕەشە دەکاتو بە هۆی ئەم ڕێگایانەوە دەگوازرێتەوە:

یەکەم: بەهۆی تێکەڵ بوونی پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان ئاژەڵەکان بە تایبەتی لە وەرزە ساردەکاندا.

دووەم: لیکو میزو شیرو تۆو پاشەڕۆی ئاژەڵی تووشبوو بە سەرچاوەی ڤایرۆسەکە دادەنرێت کە لە ڕێگەیانەوە ئاژەڵی تریش تووش دەبێت.

سێیەم: ڤایرۆسەکە لە ڕێگەی هەواوە زۆر بە خێرایی دەگوێزرێتەوە.

چوارەم: ڤایرۆسەکە لە ڕێگای باڵندە کێوییەکان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی دەگوێزرێتەوە.

پێنجەم: هەروەها نەخۆشییەکە لە ڕێگەی مێشو مەگەزەوە دەگوێزرێتەوە.

شەشەم: مرۆڤیش گوێزەرەوەیەکی باشە بۆ ڤایرۆسی نەخۆشیەکە.

## نەخۆشی تەبەق F.M.D لە مرۆڤدا:

هەروەك لە بەشەکانی پێشوتردا ئاماژەمان بۆ کرد نەخۆشی تەبەق بە یەکێك لە نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان ئاژەڵو مرۆڤ دادەنرێت (ZoonoSis) بەڵام خۆشبەختانە کاریگەریەکی نەخۆشخەرانەی ئەوتۆی نییە بۆ سەر مرۆڤ چونکە مرۆڤ خانەخوێیەکی هەستیار نییە بۆ ڤایرۆسی نەخۆشییەکە. نەخۆشی تەبەق دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لە ڕێگەی تێکەڵ بوونو پەیوەندی ڕاستەوخۆ بە ئاژەڵەوە بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئاژەڵنو قەسابەکانو هەروەها پزیشکەکانی ڤێترنەری، بەکارهێنانی شیرو بەرهەمەکانی شیر لەلایەن مرۆڤەوە یەکێکە لە ڕێگە سەرەکییەکانی گواستنەوەی نەخۆشییەکە چونکە تەبەق لەو نەخۆشیانەیە کە لە

رێگەی خواردنەوەی شیرەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و نیشانەکانی نەخۆشی یەکە لەسەر مرۆڤ زۆر لە نیشانەکانی نەخۆشی ئەنفلۆنزا دەچێت لەوانەش:

- ماوەی چوونە ژوورەوەی ڤایرۆسەکەو هەتاوەکو دەرکەوتنی نیشانەکان (٢-٧) رۆژ دەخایەنێت.
- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشی نەخۆشەکە.
- ووشك بوونەوەی ناودەمی نەخۆشەکەو قوت نەدانی خواردن.
- دروست بوونی تلۆق لەناو بۆشایی دەم یان سەردەست.
- مرۆڤ هەندێ جار وەك هەڵگری ڤایرۆسەکە کاردەکات و دەبێتە هۆی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

## - دەست نیشان کردنی نەخۆشیەکە Diagnosis:

دیاری کردن و دەست نیشان کردنی نەخۆشی تەبەق F.M.D لەلایەن پزیشکانی ڤیتێرنەرییەوە دەبێت بە هۆی:

یەکەم: مێژووی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە.

دووەم: نیشانە دیارەکانی سەر ئاژەڵی نەخۆش.

سێیەم: رێژەی تووشبوون (Morbidity rate) و لەناوچوون (Mortality rate).

چوارەم: بەهۆی پشکنینی تاقیگەییەوە بەتایبەتی پشکنینی (ELISA).

و پێویستە نەخۆشی تەبەق لەم نەخۆشیانەی خوارەوە جیا بکرێتەوە:

١- نەخۆشی شەلکە (Foot Rot) لە مەڕو بزندا.

٢- نەخۆشی (Vesicular Stomatitis) لە مانگادا.

٣- نەخۆشی (Rinder pest) لە مانگادا.

٤- نەخۆشی (Blue tongue) لە مەڕدا.

## - چارەسەرکردن و خۆپاراستن:

نەخۆشی تەبەق نەخۆشی‌یەکی ڤایرۆسی‌یە شێو چارەسەرێکی تایبەتمەندی نی‌یە لەبەر ئەوە پێویستە هەوڵ بدرێ کە ژینگەی کوردستان لەم دەردە گرانە بپارێزرێت چونکە لە ساڵی ١٩٩٩ لە کوردستاندا بڵاوبووەو زەرەری گەورەی گەیاند بە سامانی ئاژەڵ لە کوردستاندا، جا لەبەر ئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

یەکەم: کوتانی هەموو ئاژەڵەکان (مانگاو مەڕو بزن) بە جۆری (Poly Valent Vaccine) بە تایبەتی ئەو جۆرە سیرۆلۆجیانەی کە لە ناوچەکەدا بە هەمیشەیی هەیەو ساڵانە دووبارە بکرێتەوە بە مەبەستی چالاککردنی کۆئەندامی بەرگری.

دووەم: پێویستە بنکەی تەندروستی ڤێترینەری لەسەر سنوورەکان دابنرێت و ئەو ئاژەڵانەی کە دێنە ناو سنورەکەوە بپشکنرێن و ئاژەڵی نەخۆش قەدەغە بکرێت.

سێیەم: لەکاتی ڕووداني نەخۆشی‌یەکە لەهەر ناوچەیەکدا پێویستە بە زووترین کات کۆنترۆڵ بکرێت و بخرێتە ژێر چاودێری تەندروستی ڤێترینەری‌وە بە هیچ شێوەیەك کە ئاژەڵی نەخۆش جم و جوڵی پێ نەکرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و هەروەها خاوەنەکانیشیان ئەم لاو ئەولا نەکەن.

چوارەم: پێویستە کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندن (تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەو گۆڤار)ی حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەموو لایەنە سیاسیەکان گرنگی‌یەکی تایبەت بدرێت بە نەخۆشی‌یەکانی ئاژەڵ و نەخۆشی‌یە هاوبەشەکان بە گشتی و نەخۆشی تەبەق بە تایبەتی بە دانانی بەرنامەی تایبەت و بەستنی

کۆڕو کۆبونەوەی بەردەوام بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تەندروستی لە نێوان کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان.

پێنجەم: لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵەکان لە قەسابخانە پێویستە لەسەر قەسابەکان یەکسەر لاشەی ئاژەڵەکە نەخرێتە ناو بەفرگرو مجمەدەوە بەڵکو بۆ ماوەیەك هەڵبواسرێن لە شوێنێکی پاکدا بۆ ئەوەی پلەی ترشێتی گۆشتەکە بەرزبێتەوە.

شەشەم: هەستان بە کوڵاندنی شیر پێش خواردنەوەی لەلایەن مرۆڤەوە.

## ئەو سەرچاوانەی کە سودیان لێ وەرگیراوە:


١- Blood. D,C, & Henderson,J.A, 1979. Veterinary Medicine.

٢- The Merck Veterinry Manual 8 th edition- 1998.

٣- چەند سەرچاوەیەك لە مەڵبەندی ئینتەرنێتی زانکۆ

٤- بعد جنون البقر والحمى القلاعيه

الالبان فى دائره الخطر

الحمى القلاعيه وجنون البقر خطران يهددان صناعه الالبان.

٤- Food and – Mouth Disease

٥- گۆڤاری بژوێن ژمارە (٣) – ١٩٩٩.

نەخۆشی تەبەق: د. توانا خوارەحم عزیز.

٦- Foot- and – Mouth Disease "F.M.D"

محاچره من قبل /

- الدكتور انطوان
- الدكتور سلامه شحاته

زانکۆی بغداد.

# نەخۆشی مەقاو

# Strangles

مرۆڤ هەر لە سەرەتای پەیدا بوونیەوە لەسەر گۆی زەوی زۆر سوودی لە ئاژەڵ وەرگرتووە بە تایبەتی لە وولاخەبەرزە وەکو ئەسپ و مایین و ئێستر بە مەبەستی گواستنەوەی پێداویستی‌یەکانی لەشت و مەك لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی، کێڵانی زەوی کشت‌وکاڵی و هەروەها لە جەنگەکاندا لەسەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا.

لە کۆمەڵگای کوردەواریشدا بەهەمان شێوە لەوولاخە بەرزە سود وەرگیراوە لە بوارە جیاجیاکانی ژیانداو سروشتی شاخاوی کوردستان وای کردووە هەتاکو ئەم سەردەمەش وولاخەبەرزە لە هەندێك ناوچەدا بەکاربهێنرێت و بۆ هاتووچۆو گواستنەوە، بە هیچ شێوەیەك نەتوانرێت وازی لێ بهێنرێت.

لە رووی پزیشکی‌وە وولاخەبەرزە بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە تووشی زۆر نەخۆشی دەبن، یەکێك لەو نەخۆشیانەی کە بەبەردەوامی تەندروستیان دەخاتە مەترسی‌یەوە نەخۆشی مەقاوە لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی کە چەند زانیاری‌یەك دەربارەی ئەم نەخۆشی‌یە بخەمە پێش چاوی خوێنەران بە هیوام لە خزمەتی گشتی‌دابێت.

# نەخۆشی مەقاو:

لە کوردەواریدا پێی دەوترێت ((مەقاو)) لە وولاتە عەرەبییەکاندا پێی دەوترێت ((خناق الخیل)) یان (السقاوە) نەخۆشی مەقاو تووشی وولاخەبەرزە دەبێت وەکو ئەسپ و ماین و گوێ درێژو ئێسترو زیاتر ئەسپ هەستیارترە بۆ نەخۆشییەکە لە تەمەنی ٣ مانگ بەرەوژوورو تاکو تەمەنی پێنج ساڵ. نەخۆشی مەقاو لە نێوان ئەو وولاخەبەرزانەدا بلاودەبێتەوە کە لە سوپادا بەکاردەهێنرێن بۆ گواستنەوەی کەل وپەلی سەربازی لە ناوچە شاخاوییەکاندا.

نەخۆشی مەقاو زیاتر لە وەرزە ساردو شێ دارەکاندا تەشەنە دەکات وەکو لەوەرزی پاییزو زستان.

## هۆکاری نەخۆشی مەقاو:

هۆکاری نەخۆشی مەقاو بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەرێتەوە بۆ بەکتریایەك کە پێی دەوترێت:

Streptococcus equi

- سەر بە کۆمەڵەی لانسفیلد "C"و "G+".
- بەشێوەیەکی سروشتی لە بەشی سەرووی کۆئەندامی هەناسەدانی وولاخەبەرزەدا هەیەو جێگیربووە.
- دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی ژەهرێك کە پێی دەوترێت Exot oxi n کە دەبێتە هۆی تێکدانی خانەی تووشبوو.
- توانای مانەوەی هەیە بۆ چەند هەفتەیەك لە دەوروبەریداو لە ئاودا بۆ ماوەی ٦-٩ رۆژێك دەمێنێتەوەو لەسەر پێستی ئاژەڵدا بۆ ماوەی (٣-٤) هەفتە توانای مانەوەی هەیە.

- بەکترياکە لە پلەی گەرمی کوڵاندا ناچالاك دەبێت و هەروەها بەهۆی بەکارهێنانی ماددەپاکژکەرەکانیشەوە.

لە ئەنجامی هەستیاری وولاخەبەرزە بە پرۆتینی بەکترياکە دەبێتە هۆی دروستبوونی دیاردەیەك کە پێی دەوترێت : Purpura Haemorrhagica

## - نیشانەکانی نەخۆشی مەقاو:

ماوەی چوونە ژوورەوەی بەکترياکە بۆناو لەشی ئاژەڵەکەو هەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی (٤-٨) رۆژ دەخایەنێت و نەخۆشی‌یەکە لەناکاودا دەردەکەوێت و بڵاودەبێتەوەو بەوە دەست پێ دەکات کە ئاژەڵەکە بە تەواوی لەلەوەڕ دەکەوێت و دەم بۆ هیچ شتێك نابات.

- پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵەکە دەگاتە (٣٩,٥ – ٤٠,٥)پ.س.
- لووتی ئاژەڵەکە ئاو دەکات و بەرەبەرە خەست دەبێتەوەو بەلوتیدا شۆڕ دەبێتەوە بەشێوەیەکی دیار.
- تووشی هەوکردنی قوڕگ دەبێت (Pharyngitis)

ئاژەڵەکە هیچ شتێکی بۆ قووت نادرێت و لە کاتی هەوڵ دانی بۆ قووت دانی خواردن یان ئاو لە کونەلوتیەوە دێتە دەرەوەو دەکۆکێت لە ئەنجامی ئەو ئازارە تیژەی ناوچەی قوڕگی.

لە نیشانە سەرەکی‌یەکانی نەخۆشی مەقاو ئەوەیە کە ئاژەڵەکە ووشی خنکاندن دەبێت و ناوی Strangles و (خناق الخيل) لە خنکاندنەوە هاتووە. ئەمەش ڕوودەدات لە ئەنجامی هەوکردن و گەورەبوون و ئاوسانی گرێ لیمفاوی‌یەکانی ناوچەی قورگی ئاژەڵکە، تەنگە نەفەسی پێوە دیاردەبێت تووشی هەناسەبڕکێ دەبێت و ئاژەڵکە لەوە دەچێت کە بخنکێت و جار جاریش دەپژمێت.

- بۆ کەم کردنەوەی ئازاری ناوچەی قوڕگ، ئاژەڵەکە هەوڵ دەدات کە سەری شۆڕبکاتەوە.

- دوای (٢-٣) رۆژ پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵەکە دێتە خوارەوەو دوای ماوەیەك ووڵاخەبەرزەکە تووشی دیاردەیەك دەبێت کە پێی دەوترێت (Pur pur a Haemor r hgi ca).

## - دیاردەی (Purpura Haemorrhgica) چی دەگەیەنێت؟

ئەم دیاردەیە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی تووشبوونی ولاخەبەرزە بە بەکتریای نەخۆشی مەقاو، ئەمەش ڕوو دەدات دوای چاك بوونەوەی ئاژەڵەکە بۆ ماوەیەك و لە ئەنجامی هەستیاری لەشی ئاژەڵەکە بە پرۆتینی بەکتریاکە:

Sensitivity to streptococcal protein

لە نیشانە دیارەکانی ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە لەشی ئاژەڵی تووشبوو بە شێوەیەکی گشتی تووشی خوێن بەربوون دەبێت لەژێر پێستیداو لە ئەنجامدا لەشی دەئاوسێت و ڕەنگی وەنەوشەیی هەڵدەگەڕێت و ووشەی Purpura پۆرپۆرا لە ڕەنگی وەنەوشەییەوە وەرگیراوە هیچ چارەسەرێکی نییەو بە مرداربوونەوەی ئاژەڵی تووشبوو کۆتایی دێت.

## چارەسەرکردن:

بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئاژەڵی تووشبوو بە نەخۆشی مەقاو پێویستە ئاژەڵەکە جیابکرێتەوەو بخرێتە شوێنێکی پاك و خاوێنەوەو پشوویەکی تەواوی بدرێتێ لە ماوەی چارەسەرکردندا.

بەکارهێنانی دەرمان بە تایبەتی لە کۆمەڵەی پنسلین: (procaine Penicillin) بۆ ماوەی (٥-٧) ڕۆژ لەسەریەك ئەنجامی باش دەدات بەدەستەوە.

- لە ماوەی چارەسەرکردندا واباشترە کە ئاژەڵەکە لە شوێنێکی گەرمدا بێت و ئەو جۆرە خواردنانەی بدرێتێ کە بە ئاسانی قوت دەدرێت.

- لە کاتی تێبینی کردنی نیشانە سەرەتایی‌یەکانی نەخۆشی مەقاو پێویستە لەسەر خاوەن ئاژەڵەکان بەزووترین کات پەیوەندی بکەن بە کلینکەکانی پزیشکانی ڤێتێرینەری.

## ئەو سەرچاوە زانستیانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە:


1- Veterinary Medicine "1996"
D.C Blood and G.A. Htenderson
2-Veterinary Microbiology "1999"
Dwight C. Hirsh
Yuan chung zee

٣- Strangles د. علی مجید الدراجی، زانکۆی بغداد

# نەخۆشی نیو کاسل

## Newcastle Disease

بەخێوکردنی پەلەوەر بەگشت جۆرەکانیەوە لە مریشك و قەل و قاز و مراوی و هەروەها هەندێك باڵندەی دیکەی وەکو کۆترو کەو و سوێسکەو قەتێ لە کوردستاندا هەر لە مێژەوە پیشەیەکی باوبووەو گرنگییەکی تایبەتیان لەلایەن باووباپیرانمانەوە پێدراوە بە شێوەیەك کە شارەزاییەکی باشیان لە چۆنییەتی ماڵی کردنیان و بەخێوکردنیان و بەڕێوەبردنیان پەیداکردووەو تارادەیەکی زۆریش بژێوی خێزانیان لەسەر بووە. لەم سەردەمەشدا پیشەسازی پەلەوەر بە یەکێك لە پیشەسازییە سەرەکییەکانی وڵاتانی جیهان دادەنرێت و رۆژ لە دوای رۆژیش لە پێشکەوتن و گەشەکردندایەو لە کوردستانیشدا لە دوای راپەڕینە مێژووییەکەی گەلەکەمان و بە تایبەتی دوای جێبەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦)ی نەتەوە یەککرتووەکان کە ناسراوە بە (نەوت بەرامبەر خۆراك)، پیشەسازی بەخیوکردنی پەلەوەر گەشەکردنێکی لەبەرچاوی بەخۆوە بینی لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتی و بەشێوەیەك کە هاووڵاتی لە بازارەکانی کوردستاندا بەنرخێکی هەرزان گۆشتی سپی و هێلکەی دەست دەکەوێت.

لەلایەکی دیکەوە سەرەڕای ئەم پێشکەوتنەی لە بواری پیشەسازی پەلەوەردا، لەهەمان کاتدا دەردو نەخۆشییەکانی پەلەوەریش روو لەزیادبونن، نەخۆشی نیوکاسل یەکێکە لەو دەردانەی کە هەمیشە بەهەڕەشەیەکی بەردەوام دادەنرێت لەبەردەم پیشەسازی پەلەوەرداو لە دوژمنە سەرسەختەکانی خاوەن کێڵگەکان دادەنرێت و لە کوردستاندا ئەم نەخۆشییە زۆر بڵاوەو ساڵانە زەرەرو زیانی گەورە بە ئابووری وڵات دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی پیسبوونی ژینگە، جا لەبەرئەوە بە هیوام ئەم زانیارییانە لە خزمەتی گشتیدا بێت و سوودبەخش بێت.

## - نەخۆشی نیوکاسل (Newcastle disease)

نەخۆشی نیوکاسل نەخۆشییەکی ڤایرۆسی توندوتیژی کوشندەیە کە زۆر بەخێرایی بڵاودەبێتەوەو تەشەنە دەکات و لەهەموو وڵاتانی جیهاندا هەیەو دەتوانین بڵێین نەخۆشییەکی جیهانییە:

(Panzootic spread of New Castle disesse)

بە پێی (Kaleta and Baldauf, 1988) نەخۆشی نیوکاسل تووشی نزیکەی (٢٥٠) جۆری باڵندە دەبێت و لە مریشکدا نەخۆشییەکە زۆر توندوتیژو کوشندەیە، چونکە مریشك خانەخوێیەکی سەرەکی ڤایرۆسەکەیەو هەروەها پێشی دەوترێت (Avian PneumoencePhalitis). نەخۆشی نیوکاسل بە یەکێك لە نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ دادەنرێت (Zoonsis) و هۆکاری نەخۆشییەکە لە باڵندەی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و لە ئەنجامدا لە مرۆڤدا دەبێتە هۆی (ConJun Ctivitis) کە دوای ماوەیەکی کەم چاك دەبێتەوەو زەرەرێکی ئەوتۆی نییە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ .

## کورتەیەکی مێژوویی لەسەر نەخۆشی نیوکاسل:-

بە پێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری مێژووی سەرهەڵدانی نەخۆشی نیوکاسل بۆ یەکەم جار دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٦ز، چونکە لەو ساڵەدا نەخۆشییەکە لە شێوەی پەتایەکی گەورەدا لە شاری نیوکاسل لەوڵاتی بەریتانیا بڵاوبووەو تەشەنەی کردو هەروەها لەهەمان ساڵدا لەجاڤا لەوڵاتی ئەندەنوسیاش بڵاوبووەوە، هەر لەبەرئەمەش لەلایەن (Doyle)وە ناوی نیوکاسلی لێنراو هاتاکو ئەم سەردەمەش هەر پێی دەوترێت نەخۆشی نیوکاسل. هەندێك سەرچاوەی دی ئاماژە بەوە دەکەن کە نەخۆشی نیوکاسل لەساڵی ١٩٢٤ز لە کۆریا بڵاوبۆتەوەو زەرەرو زیانێکی گەورەی بەباڵندە گەیاندووە. نەخۆشی نیوکاسل نەخۆشییەکە بە هەموو وڵاتانی جیهاندا بڵاوبۆتەوە، سەرەتا لە باشووری کیشوەری ئاسیاوە دەستی پێکردووەو بە پێی بۆچوونەکانی (Doyle) نەخۆشییەکە لە ئاسیاوە گوێزراوەتەوە بۆ

ئەورووپاو لە ساڵی ١٩٢٦ز گەیشتۆتە بەریتانیاو لە ساڵی ١٩٦٠ز گەیشتۆتە وڵاتەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستو هەتا ساڵی ١٩٧٣ز هەموو جیهانی گرتۆتەوە.

## - شێوەکانی نەخۆشی نیوکاسل:

بە پێی بۆچوونەکانی (Beard and Hanson, 1984) نەخۆشی نیوکاسل لە مریشکدا چەند شێوەیەکی جیاواز جیاوازی هەیە بە پێی ئەو نیشانە دیارانەی کە لەسەر مریشکی تووشبوو دەردەکەون هەر لەبەر ئەمەش نەخۆشی نیوکاسل بۆسەر چەند شێوەیەك دابەش کراوە بەم شێوەیە:

یەکەم/ شێوەی: Doyles, Form

نەخۆشی نیوکاسل لەم شێوەیەیدا زۆر توندوتیژو کوشندەیەو لە گشت تەمەنەکاندا تووشی مریشك دەبێتو دەبێتە هۆی دروستبوونی پەڵەی خوێناوی لەهەموو بەشەکانی کۆئەندامی هەرسی باڵندەکەدا.

دووەم/ شێوەی: Beach's Form

نەخۆشی نیوکاسل لەم شێوەیەشدا زۆر وندوتیژو ترسناکەو لە گشت تەمەنەکاندا تووشی مریشك دەبێتو زیاتر نیشانەکان لەسەر کۆئەندامی هەناسەدانو ناوەندە کۆئەندامی دەماری باڵندەی تووشبوو دەردەکەوێت.

سێیەم/ شێوەی: Beaudette's Form

نەخۆشی نیوکاسل لەم شێوەیەیدا کاریگەری نەخۆشخەرانەی کەمترە وەك لە شێوەی (Beach)و زیاتر تووشی مریشك دەبێت لە تەمەنی بچووکدا (جوچك).

چوارەم/ شێوەی: Hitchner's Form

نەخۆشی نیوکاسل لەم شێوەیەدا هیچ زەرەرو زیانێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت بە مریشکی تووشبوو، لەبەرئەوە ئەو جۆرە ڤایرۆسەی دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئەم شێوەیە هەروەکو ڤاکسین لە پرۆسەی کوتان بەکاردەهێنرێت لە مریشکی ساغدا.

پێنجەم/ شێوەی ڕیخۆڵە:Enteric Form نەخۆشی نیوکاسل لەم شێوەیەیدا تووشی ڕیخۆڵەی مریشك دەبێت و هیچ نیشانەیەك لەسەر مریشکی تووشبوو دەرناکەوێت (Asymptomatic).

## - هۆکاری نەخۆشی نیوکاسل:

هۆکاری نەخۆشی نیوکاسل بەشێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسێك کە سەر بەخێزانی (Paramyxo viridae) و لە توخمی (Paramyxo virus)و لە جۆری Paramyxo virus-1 (PMV-1).

- بە پێی توندو تیژی ڤایرۆسەکە (Virulencity) دەکرێتە سێ کۆمەڵەی سەرەکییەوە:

### یەکەم/ جۆری:Velogenic strain

توندو تیژترین جۆریانەو کاریگەری نەخۆشخەرانەی بەهێزی هەیە لەسەر مریشك و زۆر بە ئاسانی دەگوێزرێتەوەو دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشی نیوکاسل لە شێوەی Doyleو شێوەی Beach.

### دووەم/ جۆری: Mesogenic strain

- کاریگەری نەخۆشخەرانەی ئەم جۆرە کەمترە بەبەراورد لەگەڵ جۆری یەکەم و دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشی نیوکاسل لەشێوەی (Beaudette).

### سێیەم/ جۆری: Lentogenic Strain

ئەم جۆرەیان کاریگەرییەکی نەخۆشخەرانەی ئەوتۆی نییە لەسەر مریشك و دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشی نیوکاسل لە شێوەی (Hitchner) هەر لەبەر ئەمەشە هەر وەك ڤاکسین ئامادە دەکرێت و لە پرۆسەی کوتان (Vaccination) بەکار دەهێنرێت لە مریشکی ساغدا.

## له خەسڵەته گشتییەکانی ڤایرۆسی (PMV-1) :

- ڤایرۆسەکه له جۆری (RNA)و یەك پارچەیە.
- تیرەی ڤایرۆسەکه نزیکەی (١٠٠-١٥٠) نانۆمیترە.
- شێوەی ڤایرۆسەکه هەندێك جار خڕەو هەندێك جار درێژکۆلەیە.
- یەکێك له چالاکییە بایۆلۆژییە تایبەتمەندەکانی ڤایرۆسی نەخۆشی نیو کاسل توانای کارلێکی هەیە لەگەڵ خڕۆکە سوورەکانی خوێنی مریشك بەم چالاکییەش دەوترێت: Haemagglutination activity )) ئەم خەسڵەتەش لەتاقیگەکاندا بۆ تەشخیص کردنی ڤایرۆسی نەخۆشی نیوکاسل سودی لێوەدەگیرێت.
- ڤایرۆسەکه ناچالاك دەبێت بەهۆی بەکارهێنانی ماددە کیمیاییە پاکژکەرەوەکان و هەروەها بەهۆی تیشکی سەروبنەوشەیی.

## - نیشانەکانی نەخۆشی نیوکاسل:

نەخۆشی نیوکاسل تووشی زۆر جۆر لەباڵندە دەبێت و مریشك لە هەموویان زیاتر هەستیارترە بۆ ڤایرۆسی نەخۆشییەکەو لە ئەنجامدا نیشانەکانی زۆر بە ئاشکرا لەسەری دەردەکەوێت و پێی دەناسرێتەوە.

ماوەی تووشبوون بە ڤایرۆسەکەو هەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی (٢-١٥)رۆژ دەخایەنێت و ئەوەی شایانی باسە دەرکەوتنی نیشانەکان بە شێوەیەکی گشتی بەندە لەسەر چەند فاکتەرێك لەوانە:

- ئاستی بەرگری لەشی باڵندەکە.
- تەمەنی باڵندەی تووشبوو.
- بارودۆخی ژینگەیی بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە.
- تووشبوونی باڵندەکە بە نەخۆشیی دی.

- چۆنیەتی تووشبوونی باڵندەکە.
- جۆری ڤایرۆسی نەخۆشخەر.
- جۆری باڵندەی تووشبوو.

– نەخۆشییەکە لەناکاودا دەردەکەوێت و رادەی تووشبوون دەگاتە (١٠٠٪)و رادەی لەناوچوون لە مریشکی تەمەن بچوکدا دەگاتە (٩٠٪)و لە مریشکی پێگەیشتوودا دەگاتە (٥٠٪)، بە تایبەتی لەکاتی تووشبوون بە ڤایرۆسی نیوکاسل لە جۆری (Velogenic strain).

نیشانەکان بەوە دەستپێدەکات کەرادەی هەناسەدانی مریشکی تووشبوو زیاد دەکات و بێهێزدەبێت و دەکەوێتە سەر زەوی و مرداردەبنەوەو ئەو مریشکانەی کە بۆ ماوەیەکی دی دەمێننەوە دەموچاویان دەئاوسێت و ئەم نیشانانەیان لەسەر دەردەکەوێت:

– تووشی سکچوونێکی سەوزباو دەبن.
– لەرزینی، ماسولکەکانی لەشی مریشکی تووشبوو.
– ملی دەسوڕێت (Tor t i col l i s).
– تووشی باڵەشۆڕە دەبن و لەقاچ دەکەون.
– رادەی بەرهەمهێنانی هێلکە زۆر کەم دەکات و هەندێك جار لە هێلکەکردن دەکەوێت.
– لەکاتی تووشبوون بەجۆری (Mesogenic strain) کە زیاتر تووشی کۆئەندامی هەناسەدان دەبێت و دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی رادەی بەرهەمهێنانی هێلکەو رادەی لەناوچوون زۆر کەمە.

بەڵام لەکاتی تووشبوون بە (Lentoginic strain)، هیچ نیشانەیەك لەسەر مریشکی تووشبوو دەرناکەوێت.

## نیشانەکانی دوای مرداربوونەوەی باڵندەکە: Gross Lesions

نیشانە دیارەکانی دوای مرداربوونەوەگرنگییەکی تایبەتیان هەیە لەلایەن پزیشکانی ڤێتێرنەری و بەمەبەستی دیاریکردنی نەخۆشی نیوکاسل، لەوانەش بینینی پەڵەی خوێناوی (Haemorrhage) لە کاتی کردنەوەی ڕیخۆڵە باریکەو ڕیخۆڵە کوێرەو هەروەها گەدەی ڕاستەقینە (Proventri Culus)، وە بڵاوبوونەوەی ئەم پەڵە خوێنانە بەناڕێك وپێکی لەسەر رووی ڕژێنەکاندا لە گەدەی ڕاستەقینەدا بەنیشانەیەکی گرنگ دادەنرێت، هەروەها بوونی پەڵەی خوێناوی لەسەر ماسولکەکانی دڵ.

هەوکردنی تورەکە هەواییەکانی باڵندەکە بەوەی کە دیوارەکانیان ئەستووردەبن.

## چۆنیەتی گواستنەوەی نەخۆشی نیوکاسل:

١-هۆی جوڵاندنەوەو ڕۆیشتنی باڵندە جۆربەجۆرەکان لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی.

٢-هۆی جوڵاندنەوەو ڕۆیشتنی ئاژەڵەکان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

٣-ڕێگەی جم وجۆڵی مرۆڤەوە دەگوێزرێتەوە.

٤-هۆی گوێزانەوەی بەروبومی پەلەوەر لەگۆشت و هێلکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

٥-ڕێگەی هەواوە دەگوێزرێتەوە بە تایبەتی لەکاتی ڕەشەبا.

٦-یرۆسی نەخۆشییەکە لەڕێگەی ئاوەوە دەگوێزرێتەوە.

٧-ڕێگەی ئالفی پەلەوەرەوە دەگوێزرێتەوە.

## دیاریکردنی نەخۆشی نیوکاسل:

دیاریکردنی نەخۆشی نیوکاسل بەشێوەیەکی زانستیانە بەندە لەسەر:

یەکەم/ مێژووی سەرهەڵدانی نەخۆشییەکە.

دووەم/ نیشانە دیارەکانی سەر مریشکە نەخۆشەکە.

سێیەم/ نیشانەکانی دوای مرداربوونەوەی باڵندەکە.

چوارەم/ جیاکردنەوەو دەستنیشانکردنی ڤایرۆسەکە لە تاقیگە.

پێنجەم/ بەهۆی تاقیکردنەوە سیرۆلۆجییەکان گرنگترینیان: Haemagglutination Inhibition test (HI)

## چارەسەرکردن و خۆپاراستن:

هەتامو ئێستا نەخۆشی نیوکاسل هیچ چارەسەرێکی گونجاوی نەدۆزراوەتەوە لەبەرئەوە هەموو کاتێك خۆپاراستن باشترین ڕێگەچارەیە، پرۆ- کوتان (Vaccination) باشترین و ئاسانترین ڕێگەچارەیە بۆ خۆپاراستن نەخۆشی نیوکاسل.

پرۆگرامی کوتان لە دژی نەخۆشی نیوکاسل لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە جیاوازی هەیە، ئەو ڤایرۆسانەی کە بەکاردەهێ زیاتر لەپرۆسەی کوتاندا لەجۆری (Mesogenic) وەکو (Roakin) وەهەر لەجۆری Lentogenic وەکو: (Lasota)و Hitchner B1.

پرۆگرامی کوتان لە دژی نەخۆشی نیوکاسل لە کوردستاندا چەند جۆر هەیە، بەڵام لە هەموویان زیاتر ئەم پرۆگرامەی خوارەوەیە کە پێویستە لە کێڵگە بەخێوکردنی پەلەوەردا پەیڕەوی بکرێت بەرێکوپێکی بەبێ هیچ دواکەوتنێ کاتەکاندا:

- یەکەم کوتان: لەتەمەنی (٧) ڕۆژ لە ڕێگەی ئاوی خواردنەوە.

- دووەم کوتان: لەتەمەنی (١٧) ڕۆژ لە ڕێگەی ئاوی خواردنەوە.

- سێیەم کوتان: لەتەمەنی (٢٧) ڕۆژ لە ڕێگەی ئاوی خواردنەوە.

- چوارەم کوتان: لە تەمەنی (٣٧) ڕۆژ لە ڕێگەی ئاوی خوادنەوە.

- پێنجەم کوتان: لەتەمەنی (٤٧-٥٠) ڕۆژ لەڕێگەی ئاوی خواردنەوە.

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە:


1-Spradbrow,P.B, 1999. Epidemiology of New Castle disease and the economics of its Control

2-Calnek, B.W,1997. Diseases of Poultry. 10th edition.

3-Ritchle, B.W, Harrison, G.J., and Harrison, L.R., 1997. Avian .Medicine


- شارەزایی چەند ساڵێك لەسەرپەرشتیکرنی هۆڵەکانی بەخێوکردنی پەلەوەر لەشاری سلێمانی.

# نەخۆشی دانکە یان ئاوڵە

# Pox Disease

هەروەك چۆن نەخۆشی بە شێوەیەکی گشتی بەیەکێك لە دوژمنە سەرسەختەکانی مرۆڤ دادەنرێت، بەهەمان شێوەیەش لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئاژەڵیشە چونکە ئەگەر نەخۆشییەکانی مرۆڤ تەنها زیان بگەیەننە تەندروستی مرۆڤ ئەوا بێ گومان نەخۆشییەکانی ئاژەڵو باڵندە زیان دەگەیەننە تەندروستی ئاژەڵو تەندروستی مرۆڤ و هەردوولا بە دەستیەوە دەناڵێنن لەبەرئەوەی بڵاوبونەوەی دەردو نەخۆشی لە باڵندەوئاژەڵدا دەبێتە هۆی کەم بونەوەی بەرهەمەکانی ئاژەڵو باڵندە لەشیرو گۆشتو هێلکە کە ئەمەش لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی سەرچاوەکانی پرۆتین بەمەش بێگومان مرۆڤ زەرەرمەند دەبێت.

نەخۆشی دانکە... لە ئاژەڵو باڵندەدا یەکێکە لەو نەخۆشییانەی کە دەبێتە هۆی کەم بونەوەی بەرهەمی ئاژەڵو باڵندە، لەبەر ئەوە ڕوونکردنەوەی لایەنە جیاجیاکانی ئەم نەخۆشییە کارێکی پێویستەو بەهیوام لە خزمەتی گشتیدا بێت.

## - نەخۆشی دانکە POX:

- لە کوردەواریدا پێی دەوترێت (دانکە)و لە هەندێك ناوچەدا پێی دەوترێت (ئاوڵە)و عەرەب پێی دەڵێن (الجدری). و لە ئاژەڵو باڵندەکان بەم شێوەیە ناودەبرێت:

- لە مەڕدا پێی دەوترێت دانکەی مەڕ.
- لە بزندا پێی دەوترێت دانکەی بزن.
- لە مانگادا پێی دەوترێت دانکەی مانگا.

- له مریشکدا پێی دەوترێت دانکەی مریشك.
- لە قەل دا پێی دەوترێت دانکەی قەل.
- نەخۆشی دانکە لە هەموو جیهاندا بڵاوەو لەزووربەی وڵاتەکانی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەوروپاو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیەو لە کوردستانیشدا نەخۆشی دانکەی مەڕو بزنو باڵندە ساڵانە تووشی ئاژەڵو باڵندە دەبنو زیانیان پێ دەگەیەنن، مەڕو بزن لە هەموو ئاژەڵەکانی دی زیاتر تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن هەروەها مریشكو قەلیش لە باڵندەدا.

## دانکەی مەڕو بزن: Sheep and goat pox

### هۆکاری نەخۆشی‌یەکە:

نەخۆشی دانکە نەخۆشی‌یەکی ڤایرۆسی‌یە واتە هۆکاری نەخۆشییەکە ڤایرۆسە. نەخۆشی دانکەی مەڕ هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ: (sheep pox virus) و نەخۆشی دانکەی بزن هۆکەی بریتیە لە (goat pox virus) کە هەدوو جۆرەکەش دەگەڕێتەوە بۆ توخمی (Capri pox virus) و هەندێك جاریش بە نەخۆشییەکە دەوترێت (Capri pox infections) و ئەم ڤایرۆسە زیاتر ئارەزووی تووشبوونی پێستی ئاژەڵەکەی هەیە.

### - نیشانەکانی نەخۆشییەکە:

- نەخۆشی دانکە تووشی زۆرجۆر لە ئاژەڵی کێویو ماڵی دەبێت، بەڵام مەڕو بزن لە هەموویان زیاتر هەستیارترە بۆ ڤایرۆسی نەخۆشییەکەو لە ئەنجامدا نیشانەکانی زۆر بەئاشکرا لەسەر دەردەکەوێت.
- ماوەی تووشبوون بەڤایرۆسەکەو هەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی (١٢-١٤) رۆژ دەخایەنێتو دەرکەوتنی نیشانەکانیش بەشێوەیەکی گشتی بەندە

لەسەر چەند فاکتەرێك لەوانە: ئاستی بەرگری لەشی ئاژەڵ، باروودۆخی ژینگەو بڵاوبونەوەی نەخۆشی دیکەو توندوتیژی جۆری ڤایرۆسەکە.

- نەخۆشی دانکە لەناکاودا دەردەکەوێت و ڕادەی لەناوچوون دەگاتە ٥٠٪.

- لە ئاژەڵی تەمەن بچوکدا (بەرخ و کار) نەخۆشی دانکە توندوتیژترو کوشندەترە وەك لە ئاژەڵی پێگەیشتوو و هەندێك جار دەبێتە هۆی مرداربوونەوەی ئاژەڵەکە پێش دەرکەوتنی هەموو نیشانەکان.

- ئاژەڵی توشبوو بێ‌هێزو لاواز دەبێت و لە لەوەڕدەکەوێت بەرەبەرە لە پێش دەکەوێت و دەم و لوت و چاوی ئاو دەکات.

- پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵی توشبوو بەرز دەبێتەوە واتە تایەکی توندی لێ دێت بەشێوەیەك کە دەبێتە هۆی بەرخستنی ئاژەڵی ئاوس (بە ژمارەیەکی زۆری دیار).

- دیارترین نیشانەش بریتیە لە دروست بوونی برینێك لەشێوەی زیپکە یان بڵق لەسەر پێستی ئاژەڵی توشبوو بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە موو یان خوریان پێوەنی‌یە وەك ناوچەی ژێر ڕانی دەوروبەرو سەرگوانی ئاژەڵەکە، ژێر دەستی یان ژێر کلکی و دەم و چاوو سەرو گوێچکەکانی و لەمەڕدا لەسەر دوگەکەی بڵاودەبێتەوە، کە بێگومان ئەمەش بەنیشانەیەکی تەشخیصی دادەنرێت و هەر لەبەر ئەمەشە بە نەخۆشی‌یەکە دەوترێت دانکە یان ئاوڵە.

## چارەسەرو کۆنترۆڵ کردن:

نەخۆشی دانکە لەمەڕو بزندا هیچ چارەسەرێکی تایبەتمەندی نی‌یە، بەڵام پێویستە ئاژەڵە ساغەکان ساڵانە بە ڤاکسینی نەخۆشی دانکە بکوترێن (Cpripox vaccine)

## دانکەی باڵندە: Fowl pox

نەخۆشی دانکە تووشی زیاتر لە (٦٠) جۆری باڵندەی کێوی دەبێت و یەکێکە لە نەخۆشییە بڵاوەکانی باڵندەی ماڵی لە مریشك و قەل و کۆترو کەناری و تووشی هەموو تەمەنەکان دەبێت و لە هەموو جیهاندا بڵاوەو لە ئەنجامدا زەرەروو زیانێکی گەورە بە ئابوری وولاتان دەگەیەنێت.

## هۆکاری دانکەی باڵندە:

هۆکاری نەخۆشی دانکەی باڵندە دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسێك کە پێی دەوترێت (Fowl pox virus) کە لە توخمی (Avi pox virus) سەر بە خێزانی (pox viridae).

## نیشانەکان و شێوەکانی دانکەی باڵندە:

نەخۆشی دانکەی باڵندە بەتایبەتی لە مریشك و قەل دا دوو شێوەی سەرەکی هەیە، هەندێك جار باڵندە کە شێوەیەکیانی لەسەر دەردەکەوێت و هەندێك جاریش هەردوو شێوەکەی لەسەر دەردەکەوێت. شێوەکانیش بریتین لە:

### یەکەم/ شێوەی پێست: Cutaneous form

- ئەم شێوەیەی نەخۆشییەکە تایبەتە بە پێستی باڵندەکە بەوەی کە برینێك لە شێوەی زیپکە یان بلّق لەسەر پێستی دەموچاوی باڵندەکە دەردەکەوێت و هەروەها ئەو شوێنانەی کە پەڕی پێوە نییە.

### دووەم/ شێوەی تەڕ wet pox:

لەم شێوەیەدا هەروەك پەردەیەکی زەردباو لە بۆشایی دەم و سورێنچك و بۆری هەوادا دروست دەبێت بەمەش باڵندەکە ماندوو دەکات و دەی خنکێنێت، هەر لەبەر

ئەم هۆیەشە کە ڕادەی تووشبوون و لەناوچوون بەم شێوەی نەخۆشییەکە زۆر زیاترە لە شێوەی یەکەمی نەخۆشییەکە، کە دەگاتە (٥٠٪) و لە کەناریدا ڕادەی لەناوچوون دەگاتە (٨٠- ١٠٠٪).

- نیشانەکانی نەخۆشییەکە لە باڵندەدا بەندە بەجۆری باڵندەکەو توندوتیژی ڤایرۆسەکەو شێوەی نەخۆشییەکەو ئاستی بەرگری لەشی باڵندەکە.
- ماوەی تووشبوون بە ڤایرۆسەکەو هەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی (٤- ١٠) ڕۆژێك دەخایەنێت.
- لە مریشکی هێلکەکەردا بەرهەمی هێلکە کەم دەکات.
- هەندێك جار شێوەی پێستی نەخۆشی‌یەکە دەبێتە هۆی کوێربوونی باڵندەکەو لە ئەنجامدا مرداربونەوەی.

## چارەسەرو کۆنترۆڵی نەخۆشییەکە:

هیچ چارەسەرێکی گونجاوی نی‌یە، بەلام پێویستە پرۆسەی کوتانـدن (Vaccination) ئەنجام بدرێت.

## سەرچاوەکان:


1- Calnek, B.W, Diseases of poultry, 1997, 10th edition

2-Radostits, O.M, Gay, C.C, Blood, D.CHinchcliff, K.W, Veterinary Medicine. 2000, qth edidion.

3-Ritchie, B.W, Harrison, G.J, Harrison, L.R Avian Medicine, 1997.

# پرۆسەی

# کەڵدانی دەستکرد

## "ArtifiCial Insemination"

گومانی تێدا نییە کە ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی دانیشتوانی سەر ڕووی زەمین ڕوو لە زیادبونەو لەگەڵ ئەمەشدا پێویستی‌یەکانی مرۆڤیش لەگشت لایەنێکەوە ڕوو لە زیادبوونە بەتایبەتی پێویستی‌یە خۆراکی‌یەکان لەبەرهەمەکانی ئاژەڵ و پەلەوەر لە گۆشتی سورو سپی و شیرو هێلکە... هتد. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە بۆ دابین کردنی پێویستی‌یە خۆراکییەکانی مرۆڤ لەم سەردەمەدا پێویستە ڕێگەچارەی حیراو نوێ جێگەی ڕێگەچارەی کۆن بگرێتەوەو بەرهەم هێنان بە شێوەیەکی گشتی بخرێتە چوارچێوەی پیشەسازی‌یەوە هەروەك پیشەسازی پەلەوەرو کێڵگەی بەخێوکردنی مانگای شیروگۆشت و هەروەها دروست کردنی کۆمپانیای بەرهەم هێنانی ماست و پەنیرو کەرەو ... هتد. پرۆسەی کەڵدانی دەستکردیش یەکێکە لەو ڕێگە دەست کردو نوێیانەی کە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرهەمەکانی ئاژەڵ لە گۆشت و شیر.

پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد یەکێکە لەو هۆکارە گرنگ و چالاکانەی بەکاردەهێنرێت بۆ چاککردنی ئاژەڵ بە شێوەیەکی گشتی و لە مانگادا بەتایبەتی ئەمەش دەبێت بەهۆی گۆڕینەوەی پێکهاتە بۆ ماوەییەکان کە بەمەش ئاژەڵ هەروەك یەکەیەکی ئابوری خاوەن بەرهەم سودی لێ وەردەگیرێت بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە خۆراکییەکانی مرۆڤ لە گۆشت و شیر بە نرخێکی گونجاو.

## مێژووی کەڵدانی دەستکرد لە جیهاندا:

بە پێی زۆربەی سەرچاوەکانی پزیشکیی ڤێتێرنەری مێژووی کەڵدانی دەستکرد لە جیهاندا بەسەر چوار ماوەی یەك لەدوای یەك دا دابەش دەکرێت:

**ماوەی یەکەم:** لە ساڵی ۱۷۸۰ز تاکو ساڵی ۱۹۰۰ز دەگرێتەوە لەم ماوەیەدا زانای ئیتاڵی سپالانزانی (Spalanzani) پسپۆڕ لە زانستی فسیۆلۆژی سەرکەوتوانە تاقیکردنەوەیەکی لە بواری کەڵدانی دەستکردا بەئەنجام گەیاند ئەویش بریتیبوو لە کەڵدانی سەگێك بە شێوەیەکی دەستکردو هەروەها لەم ماوەیەدا پزیشکێکی ڤێتێرنەری فەرەنسی (Ripiquet) کەڵدانی دەستکردی بەکارهێنا بۆ چارەسەرکردنی هەندێك حاڵەتی نەزۆکی (Infertility) .

**ماوەی دووەم:** لە ساڵی ۱۹۰۰ز تاکو ساڵی ۱۹۳۰ز دەگرێتەوە لەم ماوەیەدا زانای رووسی ئیڤانۆڤ (Ivanoff) وەك ڕابەرێك لە بواری کەڵدانی دەستکرد کاری دەکردو سەرکەوتووانە تاقیکردنەوەکانی ئەنجام دەدا لەسەر زووربەی ئاژەڵەکان و هەروەها لەم ماوەیەدا پەیمانگایەکی تایبەت بە کەڵدانی دەستکرد لە رووسیا دروستکرا. زانا (Amantea) بە سەرکەوتوویی یەکەم زێیی دەستکردی (Artificial Vagina)ی دروستکرد.

**ماوەی سێیەم:** لە ساڵی ۱۹۳۰ز تا ساڵی ۱۹٤٥ز لەم قۆناغەدا بە تایبەتی دوای جەنگی جیهانی دووەم بەکارهێنانی کەڵدانی دەستکرد لە جیهاندا بڵاوبووەوە بەشێوەیەکی فراوان.

زانایان (Phillips & Lardy) بۆ یەکەمجار زەردێنەی هێلکەیان بەکارهێنا وەك پارێزەری تۆو.

قۆناغی چوارەم: لە دوای ساڵی ١٩٤٥ز شۆڕشێکی زانستی فراوان لە بواری کەڵدانی دەستکردا لە جیهاندا بەرپا بوو کە لە ساڵی ١٩٥٨ز دەستکرا بە کەڵدانی مانگا لە عیراقدا بەشێوەیەکی دەستکرد لەساڵی ١٩٦٢زدا یەکەم مەڵبەندی کەڵدانی دەستکرد لە ئەبوغرێب کرایەوە هەروەها چەند مەڵبەندێکی دیش لەچەند شارێکی دیکەی عیراق و لە کوردستانیشدا کرایەوە.

## مێژووی کەڵدانی دەستکرد لە ناوچەی سلێمانی:

ناوچەی سلێمانی یەکێکە لەو ناوچانەی کە ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵی تێدا بەخێو دەکرێت و خەڵکێکی زۆریش بە ئاژەڵدارییەوە خەریکن و ژمارەی ئاژەڵیش لە ساڵی ٢٠٠٠ و ٢٠٠١ هەروەك لەم خشتەیەدا پیشاندراوە بەم شێوەیەیە (بە پێی ڕێکخراوی F.A.O):

| کامێش | مانگا | بزن | مەڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٣٦٠ | ٣١٣,٤٤٣ | ١,٥٥١,٨٢٢ | ٢,٣٨٦,٦١١ | ٢٠٠٠ |
| ٤٣٧١ | ٤٠٦,٦٥٠ | ١,٤٤٤,٠٣٢ | ٢,٨١٥,٥٥٤ | ٢٠٠١ |

بەپێی سەرچاوەکانی بەڕێوەبەرایەتی سامان و دروستی ئاژەڵ لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٧٠ و پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد لە مانگای ناوچەی سلێمانی دەستی پێ کردووە لە شارۆچکەی بەکرەجۆ بەوەی کە چەند سەرێك لە گای جۆری فریزیان لە کێڵگەی بەکرەجۆ بەخێودەکرا بەهۆی چەند پسپۆڕێکەوە هەڵدەستان بە وەرگرتنی تۆوی گاکان بەهۆی زێی دەست کردو لە ئەنجامدا کەڵدانی مانگای ناوچەکە بە ڕێگەی ساردکردنەوە (Coolling method) بەم شێوەیە پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد ساڵ لەدوای ساڵ لە ناوچەکەدا گەشەی دەکردو چوارچێوەی چالاکییەکانی فراوانتر دەبوو هەروەها خاوەن ئاژەڵ و جوتیاری ناوچەکە زۆر بە

گەرمییـەوە بـەرەو پـێری کارەکـە دەچوون چونکە پراکتیکیانـە بۆیـان دەرکـەوت کـە کەڵـدانی دەسـتکرد سـودی زۆرەو هـەر لەبـەر ئەمـەش دوای ماوەیـەك نـۆ مەڵبەنـدی کەڵـدانی دەسـتکرد لەشـارو شارۆچـکەکانی (چەمچـەماڵ- کـەلار- سـەید سـادق- هەڵەبجـە- رانیـە- قـەڵادزێ- سوسـێ- عەربـەت و نەخۆشـخانەی ڤێتێرنـەری لـە سلێمانی) کرایەوە، ئەمـەش وایکـرد کـە چالاکییەکانی تیمـەکانی کەڵدانی دەستکرد زۆربـەی ناوچـەی سـلێمانی بگرێتـەوە لـە گونـدو شـارو شارۆچـکەو شـوێنە سنوورییەکانیش بە شێوەیەك کە خاوەن ئاژەڵ و جوتیاری ناوچەکە خۆیان دەگەڕان بەدوای تیمەکاندا بەهۆی بەرزبونەوەی ئاستی هۆشیاری جوتیاران و گوندنشینەکانی ناوچەکەو هەستکردنیان بەوەی کە بەرهەمی کەڵدانی دەستکرد زۆر باشترە لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لـە بەرهـەمی کەڵـدانی سروشـتی ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی مانگـای بەرهـەمی کەڵـدانی دەسـتکرد زۆر جیـاوازی هـەبوو لـە مانگـای بەرهـەمی کەڵدانی سروشتی لەبەر ئەم خەسڵەتانەی خوارەوە:

١-مانگای کەڵدانی دەستکرد بە قەبارە زۆر گەورەترە لە مانگای خۆماڵی.

٢-نگای کەڵدانی دەستکرد زۆر بە بەرهەمترە لە مانگای خۆماڵی .

-3نگای کەڵدانی دەستکرد توانایەکی باشی هەیە لە خۆگونجاندن لە گەڵ ژینگەی کوردستاندا.

-4نگای مانگای کەڵدانی دەستکرد زۆر گەورەو سەرنج ڕاکێشترە لە گوانی مانگای خۆماڵی.

٥-نگـای کەڵـدانی دەسـتکرد لـە بـازاڕدا زۆر گـرانترو بـەنرخترە لـە هـی خۆمـاڵی بـەم شێوەیە پرۆسـەی کەڵـدانی دەستکرد لـە ناوچـەی سلێمانی هـەر لـە سـاڵی ١٩٧٠وە هـەنگاوی باشـی نـاوە تـاکو ئـەمڕۆ هـەر لـە ئـەنجامی ئەمـەش خـاوەن ئـاژەڵی شـارەزا پەیـدابووە کـە زانیارییـەکی پەیـداکردووە لـە بەخێوکردنـی ئـاژەڵ بەگشـتی و مانگـای کەڵـدانی دەسـتکرد بەتایبـەتی. لـەدوای ڕاپەڕینـە مێژووییەکـەی گـەلی کـوردو دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەروەها پراکتیزەکردنـی بڕیـاری ٩٨٦ی نەتـەوە یـەکگرتووەکان کـە ناسـراوە بەنـەوت بەرامبـەر خـۆراك، گومـانی تێدانییـە کـە

کۆمەڵگای کوردەواری لە هەموورووپەکەوە گەشایەوەو بوژایەوە هەر لە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی کوردستان و گەڕانەوەی گوندنشینەکان بۆ گوندەکانیان و بوژانەوەی سامانی ئاژەڵ بە شێوەیەکی لەبەرچاو کە ژمارەیان لە ساڵی ۲۰۰۰و ۲۰۰۱ هەروەك لە خشتەکەی پێشودا پیشان دراوە. بەهاوکاری بەڕێوەبەرایەتی سامان و دروستی ئاژەڵ و ڕێکخراوی (FAO) پرۆسەی کەڵدانی دەستکردیش هەنگاوی خێراتری ناو پێشکەوتنی لەبەرچاوی بەخۆوە بینی بە تایبەتی لە ساڵەکانی (۱۹۹۹-۲۰۰۰و ۲۰۰۱-۲۰۰۲) کە ژمارەی تیمەکانی کەڵدانی دەستکرد لە ناوچەی سلێمانی گەیشتە سی وسێ تیم و زۆربەی ناوچەکانی سلێمانی گرتەوەو ژمارەی مانگای کەڵدراوی بە شێوەیەکی دەستکرد زیادی کرد هەروەك لەم خشتەیەدا پیشان دراوە: (بەپێی ڕێکخراوی :FAO)

| ساڵ | ژمارەی مانگای کەڵدراو |
|---|---|
| ۱۹۹۹ | ۱۰۳۹ |
| ۲۰۰۰ | ۷,۹٦٥ |
| ۲۰۰۱ | ۱٥,۸٦۹ |
| ۲۰۰۲ | ۱۲,۰۷۹ |

## کەڵدانی دەستکرد چی دەگەیەنێت:

پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد بەشێوەیەکی زانستی بەوە پێناسە دەکرێت کە بریتیە لە دانانی خانەکانی نێرینە (Spermatozoa) لە کۆئەندامی زاوزێی مێیینە بە ڕێگایەکی میکانیکی لە جیاتی کەڵدانی سروشتی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن نێرەوە.

## چۆنیەتی ئامادەکردنی تۆو:

ئامادەکردنی تۆو بە مەبەستی بەئەنجامدانی پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد پێنج قۆناغ لەخۆدەگرێت:

### یەکەم/ کۆکردنەوەی تۆو: (Semen Collection)

لەم قۆناغەدا لەلایەن پسپۆڕی تایبەتەوە تۆو وەردەگیرێت لەو گایانەی کە خاوەن خەسڵەتی باشن، ئەمەش بە بەکارهێنانی زێی دەستکرد (Artificial Vagina) ئەنجام دەدرێت بەم ڕێگەیەش دەوترێت ڕێگەی زێی دەستکرد: (Artificial Vagina method).

### دووەم/ پشکنینی تۆو: (Examination)

پشکنینی تۆو بە سێ جۆر ئەنجام دەدرێت:

- پشکنینی سەرەتایی تەنها بەچاو: ئەم پشکنینەش لەلایەن پزیشکێکی ڤێتێرنەری شارەزاوە ئەنجام دەدرێت و ئەم لایەنانە دەگرێتەوە (قەبارەی تۆو- ڕەنگی تۆو- چڕێتی تۆو- پاک و خاوێنی تۆو) .
- پشکنینی بەکۆمەڵ: ئەمەشیان بەهۆی بەکارهێنانی مایکرۆسکۆپەوە ئەنجام دەدرێت کە چالاکی بەکۆمەڵی سپێرمەکان دەردەخات.
- پشکنینی تاک: ئەم پشکنینە ئەنجام دەدرێت دوای بە ئەنجام گەیاندنی قۆناغی سێیەم کە چالاکی تاک تاکی سپێرمەکان پیشان دەدات لە شێوەی سروشتی و ناسروشتی سپێرمەکان و جۆری جوڵەیان و هەروەها بەکارهێنانی ڕەنگی ئیۆسین- نگرۆسین بۆ دیاری کردنی سپێرمی مردوو لە سپێرمی زیندوو.

## سێیەم/ ڕوون کردنەوەی تۆو: (Dilution)

ڕوونکردنەوەی تۆو بریتیە لە زیادکردنی قەبارەی تۆوی وەرگیراو بەهۆی بەکارهێنانی مادەیەکەوە کە پارێزگاری لە چالاکی تۆوەکە بکات بەمەبەستی مانەوەی بە چالاکی بۆ ماوەیەکی درێژتر.

لەو ماددانەش کە زیاتر بەکاردەهێنرێت زەردێنەی هێلکەی مریشك و شیرە.

لە خەسڵەتە گرنگەکانی ئەم دوو مادەیەش:

١-پلەی ڕشێتیان گونجاوو لەبارە بۆ بەردەوامی ژیانی تۆوەکە.

٢-توانای پارێزگاری تۆوەکەیان هەیە لەکاتی گۆڕانی پلەی گەرمی.

٣-تەوژمی ئۆزموزیان نزیکە لە تەوژمی ئۆزموزی تۆوەکە.

٤-هەرزانن و بە ئاسانی دەست دەکەون.

٥-کار ناکەنە سەر چالاکی تۆوەکە.

تۆوەکە ئەم مادانە بەکار دەهێنێت هەروەکو سەرچاوەیەکی ووزە.

## چوارەم/ هەڵگرتن: (Storage)

لەم قۆناغەدا تۆوی ئامادەکراو لە پلەی (٤-٥)سْ لە بەفرگرەدا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەڵدەگیرێت، بەم ڕێگەیەش دەوترێت کەڵدانی دەستکرد بەشێوەی ساردکردنەوە (Cooling) یاخود مادەی گلیسرۆڵ (Glyserol)ی تێکەڵ دەکرێت و لە پلەی (-١٩٦)سْ هەڵدەگیرێت و بەهۆی نایترۆجینی شل لە دەبەی تایبەتداو تۆوەکە دەپارێزرێت بۆ ماوەی دەساڵێك لە پلەی بەستندا بەم ڕێگەیەش دەوترێت کەڵدانی دەستکرد بە ڕێگەی بەستن (Frozen).

## پێنجەم/ کەڵدانی مانگا بەتۆوی ئامادەکراو:

لەلایەن پزیشکانی ڤێتێرنەری یاخود کارمەندی ڤێتێرنەری شارەزا تۆوی ئامادەکراو بە ڕێگەیەکی میکانیکی دەخرێتە منداڵدانی کۆئەندامی زاوزێی مانگای بەکەڵ هاتوو لە کاتی دیاری کراودا

## سودەکانی پرۆسەی کەڵدانی دەستکرد:

یەکەم: سود وەرگرتن لەو گایانەی کە خاوەن توانایەکی بەرهەمی بەرزیان هەیە بەشێوەیەکی باشترو زیاتر.

دووەم: بۆ زانینی بەهای بۆ ماوەیی.

سێیەم: بۆ نەهێشتن و ڕێگەگرتن لە گواستنەوەی هەندێك نەخۆشی تایبەت بە کۆئەندامی زاووزێ.

چوارەم: یارمەتی بلاوبونەوەی سوود دەدات واتە بە کەڵدانی ئەو مانگایانەی کە دوورن لەشارو شارۆچکەکانەوەو کەوتونەتە ناوچە شاخاوی و سنوورییەکان.

پێنجەم: بەرزبونەوەی باری ئابوری وڵات.

شەشەم: هاتنە خوارەوەی نرخی بەروبومی ئاژەڵ لە گۆشت و شیر.

## سەرچاوەکان :


1-Areport about: Artificial Insemination in Sulaimani Region (FAO).

By: Dr. Faraidoon Abdull Sattar

Artificial Insemination Consultant.

(16-11-2002 21-12-2002)

2-Arthur, G.E, Noakes, D.E, Pearson, Hand Parkinson, T.J, Veterinary reproduction and Obstetrics, 1996, 7thedition.

٣- گۆڤاری بژوێن ژمارە (١) ساڵی ١٩٩٩.

# بەکیس بوونی هێلکەدان
# Cystic ovarian Disease

زۆربوون (Reproduction) یەکێکە لە مەبەستە سەرەکییەکانی بەخێوکردنی ئاژەڵ لەلایەن کەرتی تایبەتو کەرتی گشتییەوەو خاوەن ئاژەڵ هەمیشە لە هەوڵی زیادکردنی ژمارەی ئاژەڵەکانیەتی لە ڕێگەی زاووزێوە کە ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی زیادبونی دەستکەوتەکەی لە ڕێگەی زیادبوونی بەرهەمەکەی لە شیرو گۆشتو پێستەو خوری و هتد.

زۆربوونی ئاژەڵیش لە ڕێگەی زاووزێوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە کۆئەندامی زاووزێی ئاژەڵەوە هەیە، واتە کۆئەندامی زاووزێ هەروەك کۆئەندامێکی گرنگی لەشی ئاژەڵ بە لێپرسراوی یەکەم دادەنرێت لەزۆربوونی ژمارەی ئاژەڵدا.

کۆئەندامی زاووزێ (Reproductive system) لە ئاژەڵدا بە شێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لە جوتێك هێلکەدان (Ovaries)و جوتێك جۆگەی فالوب (Fallopian tubes)و گوێرەکەدان (Uterus)و ملی گوێرەکەدان (Cervix)و زێ (Vagina) هەر کێشەیەك کە تووشی بەشێك لە بەشەکانی کۆئەندامی زاووزێ ببێت دەبێتە هۆی پەکخستنی فەرمانی کۆئەندامی زاووزێ کە بەشێوەیەکی سروشتی کارناکاتو لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی ڕێگرێك لەبەردەم پرۆسەی زۆربون دا هەروەها گەیاندنی زەرەرو زیانێکی گەورە بە کەرتی تایبەتو کەرتی گشتی.

نەخۆشی بەکیس بوونی هێلکەدان یا پەیداکردنی تورەکە لە ئاژەڵداو بە تایبەتی لە مانگادا بە یەکێك لە کێشە سەرەکی‌یەکانی کۆئەندامی زاووزێ دادەنرێتو دەبێتە هۆی پەکخستنی پرۆسەی زۆربون، لەبەر ئەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی بەکارێکی پێویست دادەنرێت.

## سوڕی هێلکەدان (Ovarian Cycle):

یەکێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی مێ بەشێوەیەکی گشتی و مانگا بەتایبەتی بوونی سوڕی مانگانەیە کە پێی دەوترێت سوڕی هێلکەدان یان سوڕی زۆربوون Reproductive Cycle وە لە نێو خاوەن ئاژەڵدا پێی دەوترێت سوڕی هاتنەکەڵ (Estrus Cycle)، ماوەی سوڕی هاتنەکەڵ لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی دیکە دەگۆڕێت هەروەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێت :

| ئاژەڵ | ماوەی سوڕی هاتنەکەڵ |
|---|---|
| ١- مانگا | ٢١-٢٢ ڕۆژ |
| ٢- ماین | ١٩-٢٥ ڕۆژ |
| ٣- مەڕ | ١٦-١٧ ڕۆژ |
| ٤- بزن | ٢١ ڕۆژ |
| ٥- بەراز | ١٩-٢٠ ڕۆژ |
| ٦- سەگ | ٦-١٢ مانگ |

لەئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژیانەی کەبەسەر هێلکەدان دا دێت، سوڕی هێلکەدان بەچەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەکدا تێدەپەڕێت لەژێر کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی کۆئەندامی دەمارو ژێر مێشکە ڕژێن، قۆناغەکانی سوڕی هاتنەکەڵ بریتین لە:

١-قۆناغی پێش هاتنە کەڵ (Proestrus phase).

٢-قۆناغی کەڵی (Estrus phase).

٣-قۆناغی دوای هاتنەکەڵ (Metestrus phase).

٤-قۆناغی تەنەزەردە (Diestrus phase).

هەر قۆناغێك لەم قۆناغانەی سوڕی هێلکەدان چەند خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی هەیە کەلەسەر هێلکەدان دا دەردەکەوێت و گرنگترینیان پرۆسەی هێلکەدانانە (ovulation)و دروست بونی هێلکەیە (ovum) لە ژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی هاندانی هۆرمۆنی لیۆتینی (LH)١ + لەسەر چیکڵدانەی گراف (Grafian follicle) کە لەژێر مێشکە ڕێژێنەوە دەردەچێت و بە لێپرسراوی یەکەم دادەنرێت لە پرۆسەی هێلکەدانان.

پرۆسەی هێلکەدانان لە گشت جۆرەکانی ئاژەڵ لە قۆناغی کەڵ دا (Estrus phase) ڕوودەدات، بەڵام تەنها لە مانگادا جیاوازە بەوەی کە هێلکەدانان لە قۆناغی دوای هاتنە کەڵ (Metestrus)دا ڕوو دەدات، بەتایبەتی دوای (١٠-١٢) کاتژمێر لە دوای کۆتایی هاتنی قۆناغی کەڵ (Estrus phase) کە بێ گومان ئەمەش بە خەسڵەتێکی گرنگ دادەنرێت لە مانگادا بە تایبەتی لە کاتی کەڵدانیدا بە شێوەیەکی دەستکرد (A.I)٢

دریژی ماوەی سوڕی هاتنەکەڵ لە مانگادا نزیکەی (٢١ ڕۆژە) واتە هەموو مانگایەك هەر (٢١ ڕۆژ) جارێك دێتەکەڵ و لە نیشانە سەرەکییەکانی هاتنە کەڵ لە مانگادا بریتیە لە:

١-مانگای بەکەڵ دەوەستێت و کلکی بەرزدەکاتەوە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی گایەکەوە کەڵ بدرێت.

٢-شلەیەکی ساف و خاوێن و لینج بەزێیدا دێتە خوارەوە.

٣-بەرهەمی شیری زۆر کەم دەکات.

٤-مانگـای بەکـەڵ جوڵـە جـوڵ دەکـاتو دەبۆڕێنێـتو کـۆنترۆڵکردنی لەلایـەن خاوەنەکەیەوە زەحمەتە.

## بەکیس بوونی هێلکەدان: Cystic Ovarian Disease

بـەکیس بـوونی هێلکـەدان بـەگرنگترین کێشـەی کۆئەنـدامی زاووزێـی مانگـای پێگەیشـتوو دادەنرێـت بەتایبـەتی لـە مانگـای شـیردا کـە دەبێتـە هـۆی نـەزۆکی بـە شـێوەیەکی کـاتی (Infertility)و زیـاتر لـەو مانگایانـەدا ڕوودەدات کـە بەرهـەمی شیریان زۆر زۆرە (High producing Dairy Cows)و لـە کێڵگـەی تایبـەتیدا بەخێودەکرێنو ئالفێکی چڕوپڕیان دەدرێتێ (ماددەی پرۆتینی زیادبێت).

بەکیس بوونی هێلکەدان لەوەرزی پاییزو زستاندا ڕوودەدات بە بەراورد لەگەڵ وەرزەکانی دیدا.

بـەکیس بـوونی هێلکـەدان بریتیـە لـە دروسـت بـوونی کیسێك یـان تووڕەکەیـەك لەسەر هێلکەدان لە ئەنجامی ڕوونەدانی پرۆسەی هێلکەدانان، کە زیـاتر لـە ١٠ ڕۆژێك لەسەر هێلکەدان بمێنێتەوەو تیرەکەی گەورەتربێت لە (٢,٥)سم، لەسەر یەك هێلکەدان بێت یاخود لەسەر هەردوو هێلکەدان.

دروسـت بـوونی کـیس لەسـەر هێلکـەدان کاردەکاتـە سـەر سـوڕی هێلکـەدان (هاتنەکەڵ)و دەبێتـە هـۆی گـۆڕینی بـاری فسـیۆلۆژی سوڕەکەو تێکدانی قۆناغەکانی سوڕەکە لـە مانگـاداو لـە ئەنجامـدا گـۆڕینی هەڵسـوکەوتی مانگاکـە، بەمـەش خـاوەن ئاژەڵی شارەزا تێبینی ئەم بارە ناسروشتیە دەکات.

## هۆکاری ڕوودانی بەکیس بونی هێلکەدان:

بە پێـی سەرچاوەکانی پزیشـکی ڤێتێرنـەری هۆکاری ڕوودانـی بـەکیس بـونی هێلکـەدان دەگەڕێتـەوە بـۆ کـەم بونـەوەی ڕێـژەی هۆرمـۆنی لیـۆتینی (LH) لـەکاتی دروست بـونی چیکڵدانەی گراف لەسـەر هێلکـەدان،و لـە ئـەنجامی ئـەم کەمبونـەوەی

هۆرمۆنی لیۆتینی پرۆسەی هێلکەدانان ڕوونادات (Anovulation)و چیکلدانەکە دەگۆڕێت بۆ کیسێك لەسەر هێلکەدان و بەمەش سوڕی هێلکەدان تێك دەچێت. چەند بۆچونێك هەیە دەربارەی کەم بونەوەی هۆرمۆنی لیۆتینی (LH)و ئەو هۆیانەی کە دەبێتە کەمبونەوەی ڕادەی هۆرمۆنەکە، لەوانەش:

<u>یەکەم</u>/ بۆچونی یەکەم دەڵێت لەو مانگایانەدا ڕوودەدات کە بەرهەمی شیریان زۆر زۆرەو بەتایبەتی لە دوای (١٥-٤٥) ڕۆژ لە دوای زایینی مانگاکە کە ڕادەی بەرهەمهێنانی شیر لەم ماوەیەدا دەگاتە ئاستێکی زۆر بەرزو هەروەك هۆکارێکی ماندووکەر (Stress factor) ڕۆڵی هەیەو میکانیزمی ڕوودانی بە کیس بوونی هێلکەدان بەپێی ئەم بۆچونە لەم هێڵکارییەدا ڕوون کراوەتەوە :

**بەرهەمهێنانی شیر بە شێوەیەکی زۆر هەروەك هۆکاری ماندووکەر**

(Stress factor)

↓

ژێر مێشکە ڕژێن

Pituitary gland

↓

زیادبونی هۆرمۆنی (ACTH)3

↓

توێکڵی سەرە گورچیلە ڕژێن

Adrenal Cortex

↓

↓

زیادبونی هۆرمۆنی کۆرتیزۆل

Cortisol

↓

کارێکی نەگەتیڤانەی هەیە لەسەر ناوەندە کۆئەندمی دەمار بەتایبەتی

(Hypothalamus)و ژێر مێشکە ڕژێن

↓

دروست نەبونی یاخود کەمبونەوەی هۆرمۆنی لیۆتینی (LH)

↓

پرۆسەی هێلکە دانان ڕوونادات

Anovulation

↓

بە کیس بونی هێلکەدان

Cysticovaries

__دووەم__/ بۆچوونی دووەم پەیوەندی هەیە بە بەرزبونەوەی ئاستی هۆرمۆنی پرۆلاکتین (prolactin) کە، لێپرسراوی دروست کردنی شیرە،و بە پێی ئەم بۆچونەش لەکاتی بەرهەم هێنانی شیر لە ئاستێکی بەرزدا بەهەمان شێوە هۆرمۆنی پرۆلاکتین لە ئاستێکی بەرزدایەو دەبێتە هۆی کەمبونەوەی هەستیاری هێلکەدان بۆ هۆرمۆنی لیۆتینی (LH)، واتە هۆرمۆنی (LH) لە ئەنجامدا نابێتە هۆی پرۆسەی هێلکەدانان و دەبێتە هۆی ڕوودانی بەکیس بونی هێلکەدان.

سێیەم/ بە پێی چەند سەرچاوەیەك دەڵێت دروست بونی بەكیس بونی هێلكەدان پەیوەندی هەیە بەكەم بونەوەی ڕێژەی هۆرمۆنی سایرۆید (Hypothyroidism) لە هەندێك جۆری ئاژەڵدا.

## جۆرەكانی بەكیس بوونی هێلكەدان:

## بەكیس بوونی هێلكەدان دوو جۆری سەرەكی هەیە:

### یەكەم/ بەكیسبوونی هێلكەدانی چیكڵدانەیی:

### Follicular Cystic ovary

لەم جۆرەیاندا دیواری كیسەكە زۆر تەنكەو شلەیەكی تێدایەو چەند نیشانەیەكی ناسروشتی لەسەر مانگای توشبوو دەردەكەوێت لەوانەش:

- سوڕی هاتنەكەڵ تێكدەچێت بەوەی مانگاكە لە ماوەی كورت كورتدا دێتەكەڵ بۆ نمونە هەفتەی جارێك دێتەكەڵ و خاوەن ئاژەڵ بەشێوەیەك دەڵێت كە مانگاكەم هەموو ڕۆژێك بەكەڵە بەم دیاردەیەش دەوترێت: Nymphomania
- مانگای توشبوو ناڕەحەتەو نائارامە.
- بەرهەمی شیری زۆر كەم دەكات.
- چالاكی سێكسی زیاد دەكات.

### دووەم/ بەكیس بوونی هێلكەدانی لۆتینی:

### Luteal cystic ovary

- لەم جۆرەدا دیواری كیسەكە ئەستوورەو شلەیەكی تێدایە مانگای توشبوو بە هیچ شێوەیەك نایەتە كەڵ واتە هیچ نیشانەیەكی كەڵی لەسەر دەرناكەوێت بەمەش دەوترێت نەهاتنەكەڵ ( Anest r us )، و خاوەن ئاژەڵ بە شێوەیەك دەڵێت كە مانگاكەم نایەتە كەڵ.

## چارەسەرکردن: Tr eat ment

چارەسەری نەخۆشی بەکیسبوونی هێلکەدان دوای دیاریکردنی نەخۆشی‌یەکە لەلایەن پزیشکێکی شارەزاوە بەهۆی بەکارهێنانی هۆرمۆنەوە دەبێت.

- چارەسەری بەکیسبونی هێلکەدانی چیکلدانەیی بەهۆی بەکارهێنانی هۆرمۆنی (GnRH) (٤) یاخود (HCG) (٥) وە دەبێت.
- چارەسـەری بەکیسـبونی هێلکـەدانی لیـۆتینی بـەهۆی بـەکارهێنانی هۆرمۆنی( PGF2x ) (٦)وە دەبێت.

### پەراوێزەکان:

LH= Luteinizing hormone -١

- - هۆرمۆنی لۆتینی لێپرسراوی پرۆسەی هێلکەدانانە کە لە پلی پێشەوەی ژێر مێشکە رژێن دروست دەبێت.

A.I= Arificial Insemination -٢

واتە کەڵدانی دەست کرد.

ACTH= Adeno Corticotropichormone -٣

لە پلی پێشەوەی ژێر مێشکە رژێن دروست دەبێت.

GnRH= Gonadotropin Releasing hormone. -٤

- - لە (Hypothulamus) دروست دەبێتو کار دەکاتە سەر ژێر مێشکە رژێن.

HCG= Human Chorionic gonadotr opin -٥

- له ئافرەتی سکپڕدا لـه هەفتـه سـەرەتاییەکاندا دروست دەبێت و زۆر لـه هۆرمـۆنی لۆتینی دەچێت (LH).

٦- PGF2 = Protaglandin F2

- ئـەم هۆرمۆنـە لـەژێر چـەند ناوێکـدا هەیـە وەکـو : - Lut yl ase (Synchromate).

## سەرچاوەکان:


1-Bearden, H Jand Fuquay, J-w, 2000.

Applied Animal Reproduction, 5th edition.

2-Arthur, G.H, Noakes, D.E, Paerson, H., and parkinson, T J, 1996.

Veterinary Reproduction and Obstetrice.

3-Roberts, S.J, 1986. Veterinary and Genital Diseases.

4-Treatmant of Cystic ovarian Disease in Cattle.

٥- گۆڤاری زانستی سەردەم ژمارە (٤، ١٢)

# بەکارهێنانی تیشك لە هەڵگرتنی گۆشتو ترسناکیی لەسەر تەندروستیی مرۆڤ

زانایانو لێکۆڵەرەوەکان لە بواری (خۆراکزانی)دا هەر لە مێژەوە بیریان لەوە کردۆتەوە کە بگەڕێن بەدوای دۆزینەوەی باشترین ڕێگە بۆ هەڵگرتنو پاراستنی گۆشتی ئاژەڵ بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەشێوەیەکی زانستییانە کە دووربێت لەمەترسی کاری خراپی بەکتریای نەخۆشخەر (Pathogenic Bacteria) کە دەبێتە هۆی بۆگەنبوونو خراپبوونی شانەکانی گۆشتی ئاژەڵ بەشێوەیەکی گشتی، هەروەها گواستنەوەی ئەم گۆشتانە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو گەیشتنی بەبازاڕە جیهانییەکانو بەکارهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەبێ مەترسی.

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە پسپۆڕان بۆ ئەم مەبەستە بیریان لە بەکارهێنانی تیشك کردەوە بۆ پاراستنو پاکژکردنەوەی گۆشت بەتایبەتی لە هەندێك وڵاتدا تیشکە ناوکییەکانیان بەکارهێنا بۆ کوشتنو نەهێشتنی چالاکی ئەو بەکتریایانەی کە زیانەگەیەنن بە تەندروستیی مرۆڤ.

لەوڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهاندا گەلێك لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ ئەم مەبەستە ئەنجامدراو نزیکەی سێ ساڵی خایاند بۆ زانینی کاریگەریی ئەم ڕێگەیە (واتە بەکارهێنانی تیشکە ناوکی) لەسەر ژیانی مرۆڤ. هەڵگرتنو پاراستنی گۆشت بەڕێگەی بەکارهێنانی تیشك ئەنجامدەدرێت بەدانانی ئەو پارچە گۆشتانە لە شوێنی تایبەتداو لەدوایدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەخرێتە بەرتیشکە ناوکی یان ئەلکترۆنی کە تەرخانکراوە بۆ ئەم کارە، لە ئەنجامدا دەرکەوتووە کە بەکارهێنانی تیشك دەبێتە هۆی لەناوبردنی زۆربەی بەکتریا زیانبەخشەکانی گۆشتەکەو لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تیشکانە بەهیچ شێوەیەك کارناکاتە سەر تامو ڕەنگو بۆنی گۆشتەکە، بەم جۆرە ڕێگەی بەکارهێنانی تیشك لە پارێزگاریکردنی خواردەمەنیدا هۆکارێکی زانستی

گرنگە بۆ هەڵگرتن و پاراستنی گۆشت لە بۆگەنبوون و خراپ بوون دووركەوتنەوە لە مەترسی ژەهراویبوونی خواردەمەنی کە ساڵانە نزیکەی سێ ملیۆن هاوولاتی هەروەها ئەمەریکی پێوەیدەناڵێنن و نزیکەی نۆهەزاریان ژیان لەدەستدەدەن.

بەڵام سەرەڕای ئەمەش ڕای گشتی بەترس و دڵە ڕاوکێیەکی زۆرەوە سەیری ئەم مەسەلەیەیان دەکرد چونکە چەندەها زانای ئەمریکایی لەبواری خۆراکزانیدا دژی ئەم بیروبۆچوونە بوون، هەرچەندە زیاتر لە چل وڵاتدا ئەم ڕێگەی بەکارهێنالە پارێزگاریکردنی گۆشت بەهۆی تیشکەوەو لە ئەنجامدا ئەو زانایانە لە کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنەوە دژایەتی خۆیان نیشانداو ڕوونیانکردەوە بە بەڵگەی زانستی کە بەکارهێنانی تیشکە ناوەکی کارێکی خراپ دەکاتە سەر تەندروستیی مرۆڤ و دواڕۆژی مرۆڤایەتی هەر لەبەر ئەمەش زۆربەی کۆمپانیاکان بەکارهێنانی تیشکیان ڕەتکردەوەو بەکاریاننەهێنا چونکە ئەنجامەکەی نادیارە.

ئەو پسپۆرانەی خۆراکزانی کە دژایەتی خۆیان نیشاندا لەبەر دوو هۆی سەرەکی بوو:

١- کاریگەری ئەو تیشکانەو ترسناکییان لەسەر ئەو کەسانەی کە لەو بوارەدا کاردەکەن وەکو پسپۆران و هونەرییەکان و ئەو کرێکارانەی کە ئامێرەکانی تیشك ئامادەدەکەن چونکە زیاتر ئەگەری ئەوە هەیە ڕووبەڕووی ئەو تیشکانە ببنەوە.

٢-چۆنیەتی خۆپارێزکردن لە پاشەڕۆژی ئەو تیشکانەو کاریگەری خراپیان لەسەر ژینگە. لەبەر ئەم هۆیانە زانایانی پسپۆڕلە بواری خۆراکزانیدا ئەوەیان ڕوونکردۆتەوە کە زیاتر لەڕێگەیەکی دروست هەیە بۆ هەڵگرتن و پارێزگاریکردنی گۆشت بەشێوەیەکی ڕێك و پێك جگە لەبەکارهێنانی تیشك، لەبەر ئەوە ئامۆژگارییان ئەوەیە دووربکەوینەوە لە بەکارهێنانی تیشك و بەڵکو بەشێوەیەکی تەواو گۆشت بکوڵێنرێت واتە بگات بەپلەی کوڵاندن بۆ ئەوەی ببێتە هۆی لەناوبردنی هەموو هۆکارە نەخۆشخەرەکان و لەئەنجامدا بەشێوەیەکی دروست مرۆڤ سوودی لێوەربگرێت.

## سەرچاوە:

سوود لە نووسینێکی د.ابراهیم الراوي وەرگیراوە بەناونیشانی (حفظ اللحوم بطرق الاشعاع ومخاطره على مستقبل البشرية) لە گۆڤاری (ابقار واغنام الشرق الأوسط والشمال افريقيا) ساڵی پێنجەم ژمارە (١٨) ١٩٩٩.

## دەرمانی :- بایترل "Baytril®"

دۆزینــەوەی دەرمــان هــەروەك چارەســەرێك بــۆ زۆربــەی نەخۆشــیەكان بــە قۆناغێكی گرنگ لە مێژووی قۆناغەكانی پێشكەوتنی زانستی پزیشكییدا بەگشتیو زانستی پزیشكی ڤێترینەریدابەتایبەتی دادەنرێت، چونكە دەرمان بە شێوەیەكی گشتی چەكێكی كاری گەرو بەمێزە بەدەست پزیشكەكانەوە كەبەكار دەهێنرێت بەمەبەستی چارەسەركردنی ئو نەخۆشییە جیاوازانەی كە تووشی مرۆڤ یاخود ئاژەڵ دەبن لە رێگەی لەناوبردنی هۆكارە نەخۆشخەرەكان (میكرۆبەكان) یاخود وەستانی گەشەو زۆربوونیان.

دەرمانزانی (Pharmacology) لقێكە لەلقەكانی زانستی پزیشكی ڤێترینەری و ئەوەی شایانی باسە دەرمانزانی هەروەك زانستێك لە قۆناغی سێیەمی كۆلیژەكانی پزیشكی ڤێترینەریدا بەشێوەیەكی فراوان دەخوێندرێت.

## دەرمانزانی پزیشكی ڤێترینەری:

## (Veterinary Pharmacology)

لەو دەرمانانە دەكۆڵێتەوە كەبەكار دەهێنرێت لە چارەسەركردنی نەخۆشییەكانی ئاژەڵو باڵندەپێویستە لەسەر پزیشكانی ڤێترینەری زانیارییەكی چڕوپڕیان هەبێت دەربارەی (جۆرەكانی دەرمان، چۆنیەتی بەكارهێنانی دەرمان، رێگاكانی پێدانی دەرمان، یاساكیمیاییەكانی دەرمان) بۆئەوەی بتوانن بەشێوەیەكی زانستی بەكاری بهێننو كاری گەری خراپی نەبێت لەسەر تەندروستی گشتی.

یەکێك لەو دەرمانە گرنگانەی کەلەم سەردەمەدا بە شێوەیەکی لەبەرچاو بەکاردەهێنرێت و لە دەرمانخانەکانی پزیشکی ڤێترینەریدا دەبینرێت، دەرمانی بایترل "Baytril" کەزیاتر بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە ترسناکەکانی پەلەوەر بەکاردەهێنرێت. جالەبەر ئەوە بە پێویستم زانی کە چەند زانیاری یەك بخەمە پێش چاو بەو هیوایەی کەلەخزمەتی گشتیدا بێت.

## بایترل "Baytril" :-

بایترل "Baytril" دەرمانێکی نوێیە و بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٨٣ دروست کراوەو بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ لەناوبردنی میکرۆبەکان بەکاردەهێنرێت بەتایبەتی (بەکتریا و مایکۆپلازما)، لەرێگەی دەم و ماسولکەکانەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییانەی کەبەهۆی بەکتریا و مایکۆپلازماوە تووشی ئاژەڵ و پەلەوەر دەبن.

بایترل ناوێکی بازرگانییەو ماددە چالاکەکەی بریتییە لە ئینرۆفلۆکساسین (Enrofloxacin) سەر بەکۆمەڵە دەرمانی: (Quinolone Carboxylic acid)

لەدەرمانخانەکانی پزیشکی ڤێترینەریدا لەژێر چەند ناوێکی بازرگانیدا هەیەوەکو:

1-Baytril" بایترل

2-Enrovet 10 ٪ ئینروڤیت

3-Avitryl-5 ئیڤیتریل

4-F.Flox فلۆکس

5-Enrosol ئینرۆسۆل

## میکانیزمی کارکردنی بایترل:

## "Mechanism of action"

یەکێك لەسیفاتە هەرە گرنگەکانی ئەو دەرمانانەی سەر بەکۆمەڵەی (Quinolone Carboxylic acid)ن بەگشتیو دەرمانی ئنرۆفلۆکساسین (بایترل) بەتایبەتی ئەوەیە کە میکانیزمی کارکردن لەسەر میکرۆبەکان (بەکتریا و مایکۆپلازما) زۆر تایبەتە، هەر دەرمانە و کاردەکاتە سەر بەشێك لە میکرۆبەکان بەمەبەستی لەناوبردنیان یاخود وەستاندنی گەشەیان، ئینرۆفلۆکساسین کاردەکاتە سەر ترشە ناوکی "DNA" "Deoxyribose Nucleic acid" ی میکرۆبەکان، بەتایبەتی دەبێتە هۆی لەکارخستنی ئەنزیمێك کە پێی دەوترێت ( Bacterial gyrase") و لەئەنجامدا لەناوبردنی میکرۆبەکە، چونکە ئەنزیمی ناوبراو زۆر زۆر پێویستەو رۆڵێکی سەرەکی لەپرۆسەی " Replication of DNA"ی میکرۆبەکاندا دەبینێت.

دەرمانەکانی وەکو پنسلین"Penicillins" و سیفالۆسپۆرن "Cephalosporins"و باستراسن "Bacitra cin" کاردەکەنە سەر دیواری خانەی میکرۆبەکان لەئەنجامدا وەکو کولستن "Colistin"و دەرمانەکانی پۆلی میکسن "Polymyxin" کار دەکەنە سەر پەردەی سایتۆپلازمی " Cytoplasmic membrane" لەئەنجامدا لەکارخستنو لەناوبردنیان.

دەرمانەکانی وەکو کلۆرامفینیکۆل "Chloramphenicol" وکۆمەڵەی ئەماینۆگلایکۆساید

"Aminoglycosides" و تتراسایکلین "Tetracyclines"و ماکرۆلاید "Macroiides"و لنکۆمایسن "Lincomycin" دەبنەهۆی نەهێشتنی ڕوودانی پرۆسەی پرۆتین دروستکردن "Protein Synthesis"و لەئەنجامدا لەناوبردنی میکرۆبەکان یاخود وەستاندنی گەشەیان.

## چالاكی بايترل لەدژی میكرۆبەكان:

"Antibacterial activity of Baytril"

- میكانیزمی كاركردنی بايترل لەسەر میكرۆبەكان تواناییەكی باشی پێ بەخشیوە بەپیشاندانی چالاكییەكی فراوان لەدژی میكرۆبەكان كە ئەمەش وای كردووە:

یەكەم/

چالاكییەكی فراوان پیشانبدات لەدژی هەردوو كۆمەڵەی:

1-Gram-negative bacteria.

2-Gram- Positive bacteria.

هەروەها لەدژی مایكۆپلازما "Mycoplasma".

دووەم/

لەكەمترین بڕەوە "MIC" توانای لەناوبردنی بەكتریاو مایكۆپلازمای هەیە.

سێیەم/

بايترل توانای لەناوبردنی ئەو میكرۆبانەی هەیە كە بەرگری پیشان دەدەن لەبەرامبەر هەندێك دەرمانی دیكەی وەكو "پنسلین وتتراسایكلین‌و ماكرۆلاید".

چوارەم/

دوای وەرگرتنی بايترل لەڕێگەی دەمەوە یان لەڕێگەی ماسولكەكانەوە، بەشێوەیەكی باش لەلایەن لەشەوە هەڵدەمژرێت‌و بەشێوەیەكی فراوان بەلەشدا بڵاودەبێتەوە.

پێنجەم/

نابێتە هۆی بێهێزكردنی دەرمانەكانی وەك "Cocccidiostats" و "amoebicides"

شەشەم/

Good tolerance واتە لەش تواناى وەرگرتنى بايترلى هەيە:

حەوتەم/

بەكارهێنانى لەكاتى ڤاكسينەيشن "Vaccination" هيچ زەرەروو زيانێكى نييە لەسەر كۆئەندامى بەرگرى.

## بەكارهێنانى بايترل لە چارەسەركردنى نەخۆشيەكانى سەگ و پشيلە:

بايترل بەشێوەيەكى فراوان بۆ چارەسەركردنى ئەو نەخۆشييانەى كەتووشى سەگ و پشيلە دەبن بەكار دەهێنرێت وەكو:

- -نەخۆشى يەكانى كۆئەندامى هەرس.
- -نەخۆشىيەكانى كۆئەندامى هەناسەدان.
- -نەخۆشىيەكانى كۆئەندامى سوڕانى خوێن.
- -نەخۆشىيەكانى كۆئەندامى ميزو زاووزێ.
- -نەخۆشىيەكانى پێست.
- -نەخۆشىيەكانى گوێ.
- -ئەو نەخۆشييانەى لەبرينەوە سەر هەڵدەدەن.

## بەكارهێنانى بايترل لەچارەسەركردنى نەخۆشييەكانى پەلەوەر:

لەم سەردەمەى ئێستاماندا ژمارەيەكى زۆر لە كێڵگەكانى بەخێوكردنى پەلەوەر هەيەو ڕۆژبە ڕۆژيش ڕوو لەزيادبوونە، لە ئەنجاميشدا نەخۆشييەكانى پەلەوەر بەگشتىو نەخۆشييەكانى مريشك بەتايبەتى ترسناكى زياد دەكاتو هەڕەشەيكى بەردەواميشە بۆ سەر ژينگەو ئابوورىو تەندروستى گشتيش، لەبەر

ئەوە، بایترل لەلایەن پزیشکانەوە وەکو چەکێکی بەهێزو کاریگەر بەکاردەهێنرێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشییەکانی پەلەوەر.

... بەشێوەیەکی فراوان لەدژی میکرۆبەکانی وەکو (بەکتریا و مایکۆپلازما) بەکاردەهێنرێت و توانایەکی بەهێزی هەیە بۆ لەناوبردنی :

E.Coil, Pasteurella, Haemophilus, Salmonella

هەروەها توانایەکی باشی هەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی بەکتریای وەکو:

Staphylococcus, Erysipelothrix

بایترل لەرێگەی ئاوەوە بەپەلەوەر دەدرێت و بەرێژەی رۆژانەی ٨-١٠ ملگم بایترل بۆ هەر کیلۆگرامێك لە کێشی باڵندەکەو پێویستە ٥٠ملگم لەمادەی چالاکی بایترل لە لیترێك ئاوی خواردنەوەدا بێت.

- کاتێك بایترل بەکاردەهێنرێت لە رێگەی ئاوەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پەلەوەر پێویستە بۆماوەی سێ رۆژی بەردەوام بەکاربهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی CRD و بۆماوەی پێنج رۆژ لەسەریەك بەکاربهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی (Sal monel l osi s) بۆ نەهێشتنی میکرۆبەکە لەلەشی باڵندەکەدا.
- لەکێڵگەکانی بەخێوکردنی پەلەوەردا بەمەبەستی گۆشت واباشترە لەسێ رۆژی یەکەمی تەمەنی جوجکەکەدا بایترل بەکاربهێنرێت و هەروەها دووبارە بەکاربهێنرێتەوە لەتەمەنی سێ هەفتەی دا.
- بەشێوەیەکی گشتی بایترل بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییانەی پەلەوەر بەکاردەهێنرێت وەکو:

یەکەم/CCRD واتە ئەو نەخۆشییەی کە بەهۆی "مایکۆپلازما و E.Coil" بلاودەبێتەوە.

دووەم/Air Sacculitis ئەو نەخۆشییەی کە بەهۆی مایکۆپلازماوە بلاودەبێتەوە.

سێیەم/ Colisepticaemia ئەونەخۆشییەی کەبەهۆی بەکتریای E.Coil بە دەبێتەوە.

چوارەم/ Infectious coryza ئەو نەخۆشییەی کەبەهۆی بەکتریای Haemophilus بڵاودەبێتەوە.

پێنجەم/ نەخۆشی کۆلێرای باڵندە کە بەهۆی بەکتریای Pasteurella بڵاودەبێتەوە.

شەشەم/ نەخۆشی تایفۆیدی باڵندە کەبەهۆی بەکتریای Salmonella بڵاودەبێتەوە.

## بایترل وفلۆمکوین:

فلۆمکوین "Flumequine" دەرمانێکی دیکەو سەربەهەمان کۆمەڵەی "Quinolone Carboxylicacid" بەکاردەهێنرێت لەچارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پەلەوەردا لەزۆر تاقیکردنەوەکانی تاقیگەی فارمۆکۆلۆجیدا دەرکەوتووە کەکاری گەری کاری فلۆمکوین لەسەر میکرۆبەکان بەشێوەیەکی گشتی بەراورد کراوە لەگەڵ کاریگەری دەرمانی بایترل و گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە (MIC) دەرمانی فلۆمکوین هەموو کاتێك (٣-٥) جار زیاترە نە دەرمانی بایترل،هەروەها دەرکەوتووە کە فلۆمکوین زۆر کاریگەری نییە لە سەر هەردوو میکرۆب "

مایکۆپلازما و "Streptococci" کەوای کردووە بەکارهێنانی فلۆمکوین لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پەلەوەر سنووردار بێت.

## پەراوێزەکان

MIC-1 واتە {Minimum Inhibitory Concentration} بریتییە لە کەمترین یان نزمترین بڕی دەرمان کە پێویستە بۆ لەناوبردنی میکرۆب.

## =ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە:


1-R.BAUDITZ "Results of clinical studies with Baytril in poultry".

2- M-SCHEER "Studies on the antibacterial activity of Baytril".

3-P.TREUTHER "Data on chemistry and Toxicolgy of Baytrl".

4-R.BAUDITZ "Re s ults of clinical studies with Baytril in Dogs & Cats".



- پێشەکی یەکی‌دەرمانزانی

د.ذنون محمد عزیز پیریادی

پرۆفیسۆری کیمیا.

## دەرمانەكانى:

- ليڤاميزول ⟵ - Levamisole
- ئايڤەرمكتين ⟵ - Ivermectin
- كلوزانتيل ⟵ - Closantel
- ئالبندازول ⟵ - Albendazole

ووشەى دەرمان (Drug) لە ووشەيەكى فەرەنسى كۆنەوە وەرگيراوە كەپێى دەوترێت (Drogue) بە واتاى گژوگيا(Herb)، هەروەها پێشى دەوترێت (Medicine) يان (Pharmac)

ئەو زانستەى كە بايەخ بە جۆرەكانى دەرمان و خەسڵەتەكانى و كاريگەرى دەرمانەكان لەسەر كۆئەندامەكانى لەش دەدات پێى دەوترێت فارماكۆلۆجى (Pharmacology)، ئەو زانستەش كە لەو دەرمانانە دەكۆڵێتەوە كە بەكار دەهێنرێت بەمەبەستى چارەسەركردنى نەخۆشىيە جۆراو جۆرەكان لە ئاژەڵ و باڵندەدا پێى دەوترێت (Veterinary pharmaCology )و بە بەشێكى گرنگ دادەنرێت لە زانستى پزيشكى ڤێترينەرىدا.

لەبەر ئەوەو لەبەر گرنگى دەرمان لە جيهانى پزيشكى ڤێترينەرىدا بەپێويستم زانى كە لە دەرمانخانەى پزيشكى ڤێتێرنەرييەوە چەند دەرمانێك هەڵبژێرمو لەسەريان بدوێم بە تايبەتى ئەو دەرمانانەى كە رۆژانە بە شێوەيەكى فراوان لە دەرمانخانەكانى پزيشكى ڤێتێرنەرييەوە لەلايەن پزيشكانەوە بەكاردەهێنرێن بە مەبەستى چارەسەركردنى نەخۆشىيەكانى ئاژەڵ و باڵندە هەروەها كارى گەرييان لەسەر تەندروستى مرۆڤ .

## یەکەم/

# دەرمانی لیڤامیزول (Levamisole)

لیڤامیزول یەکێکە لەو دەرمانانەی کە لەم سەردەمەدا بە فراوانی بەکاردەهێنرێت و بەبڕێکی زۆریش لە دەرمانخانەکانی پزیشکی ڤێتێرنەریدا هەیەو سودێکی زۆریش دەگەیەنێت بە خاوەن ئاژەڵ.

- لیڤامیزول سەر بە کۆمەڵە دەرمانی Imidazothiazoles.
- چوار جێوەی کاریگەریی دەرمانی لیڤامیزول زۆر فراوانە دژی کرمەکانە لەبەرئەوە پێی دەوترێت: (Broad spectrum antihelmintic)
- لیڤامیزول بە شێوەیەکی سەرەکی بەکاردەهێنرێت بۆ لەناوبردنی کرمەکان لە کۆمەڵەی نیماتۆد Nematodes کە تووشی کۆئەندامی هەناسەدان و کۆئەندامی هەرس دەبێت لە مەڕو بزن و مانگاو ئەسپ و مریشک و بەرازو سەگ، و دەرمانێکی کاریگەرە بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی سییەکانی ئاژەڵ لە جۆری (Verminous Pneumonia) کە بەهۆی کرمەکانەوە دروست دەبێت.

لەم سەردەمەشدا سەرچاوە پزیشکییەکان ئاماژە بەکاریگەرییەکی دیکەی دەرمانی لیڤامیزول دەدەن، ئەویش بەوەی کە لیڤامیزول پەیوەندی بە کۆئەندامی بەرگری لەشی ئاژەڵ و مرۆڤەوە هەیەو لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە کە لیڤامیزول دەبێتە هۆی چالاککردنی کاری کۆئەندامی بەرگری لە لەشی ئاژەڵ و مرۆڤ دا لەبەر ئەوە پێی دەوترێت: (Non – Specific immunomodulator agent) لەبەر ئەمەش ئێستا لیڤامیزۆل بەکاردەهێنرێت لە مرۆڤ و ئاژەڵدا بۆ ئەو نەخۆشییانەی کە دەبێتە هۆی لاوازکردنی کۆئەندامی بەرگری لەش وەکو نەخۆشییە درێژخایەنەکان (Chronic disease)و نەخۆشییە شێرپەنجەکان (CanCers) چونکە لیڤامیزول هەروەك چالاککەرێکی بەتوانا کاردەکات بۆ هاندان و چالاککردنی کۆئەندامی بەرگری لەش بەتایبەتی چالاککردنی خانەی (T- lymphocyte)

بەمەش ئاستی بەرگری لەش بەرز دەبێتەوە، کەواتە دەرمانی لیڤامیزول لە ئاژەڵو مرۆڤدا بەسەرکەوتوویی بەکاردەهێنرێتو ئەنجامێکی باشیشی هەیە.

## دووەم/

## دەرمانی ئایڤەرمکتین (Ivermectin)

دەرمانی ئایڤەرمەکتین سەربەکۆمەڵە دەرمانی : Macrolide endectocides))

لەم ڕۆژگارەدا دەرمانی ئایڤەرمەکتین بە یەکێك لە دەرمانە سەرەکی‌یەکانی دەرمانخانەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری دادەنرێتو بەفراوانی لەلایەن پزیشکانەوە بەکاردەهێنرێت.

ئایڤەرمەکتین کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە دژی مشەخۆرە دەرەکی و ناوەکی‌یەکان لە ئاژەڵداو ئەنجامێکی باشیشی هەیە، مشەخۆرە ناوەکی‌یەکان وەکو کرمەکان لە جۆری نیماتۆدو (Nematodes)و مشەخۆرە دەرەکی‌یەکان وەکو گەنەو ئەسپێ...هتد.

- میکانیزمی کارکردنی دەرمانی ئایڤەرمەکتین بریتیە لە چالاککردنی گوێزەرەوە دەمارێك لە ناوەندە کۆئەندامی دەماردا کە پێی دەوترێت گابا (GABA) بەمەش لە ئەنجامدا مشەخۆرەکە پەکی دەکەوێتو لەناو دەچێت.
- بەشێوەیەکی گشتی لەڕێگەی ژێرپێستەوە (SIC) ئاژەڵ دەرمانی ئایڤەرمەکتین وەردەگرێت واتە هێواش هێواش دەرمانەکە هەڵدەمژێتو دەچێتە لەشی ئاژەڵەکەوەو نزیکەی بۆ ماوەی دوو هەفتەیەك لەلەشی ئاژەڵەکەدا دەمێنێتەوەو پێویستە ڕەچاوی خاڵێکی گرنگ بکرێت ئەویش ئەوەیە کە ئاژەڵی چارەسەرکراو بەدەرمانی ئایڤارمەکتین بۆ ماوەی (٢٨) ڕۆژ پێویستە شیرو گۆشتی بەکارنەهێنرێت لەلایەن مرۆڤەوە چونکە لەو ماوەیەدا بڕێك لە دەرمانەکە لەشیرو گۆشتی‌دا دەمێنێتەوە.

- هەروەها ئایڤارمەکتین بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەهۆی مێشی (Oestrus ovis) کە لە مەڕدا هەیە.

سێیەم/

## دەرمانی کلوزانتیل (Closantel)

- دەرمانی کلوزانتیل سەر بە کۆمەڵە دەرمانی (Salicylanilides).

- کلوزانتیل دەرمانێکە بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پەپولە (کرمی جگەر) چونکە توانایەکی دەرمانی باشی هەیە بۆ لەناوبردنی کرمی جگەر: Fasciola hepatica هەروەها کلوزانتیل کاریگەرییەکی باشیشی لە دژی کرمی هیمۆنکەس: Haemonchus و مێشی لوتی مەڕ (Oestrus ovis) هەیە .

- کلوزانتیل بۆ ماوەیەکی درێژ لە لەشدا دەمێنێتەوە چونکە توانای یەکگرتنی هەیە لەگەڵ پرۆتینی خوێندا بە تایبەتی ئەلبومین بەرێژەی ٩٩٪.

- خاوەن ئاژەڵەکان بەشێوەیەکی گشتی زۆر سوودیان لە دەرمانی کلوزانتیل وەرگرتووە چونکە کلوزانتیل ئەنجامێکی باشی هەیە لە چارەسەرکردنی ئاژەڵەکانیان لەبەرئەوە ڕۆژانە سەردانی کلینیکە ڤێتێرنەرییەکان دەکەن بۆ بەدەستهێنانی دەرمانی کلوزانتیل.

چوارەم/

## ئالبندازول (Albendazole)

- دەرمانی ئەلبندازول سەربەکۆمەڵە دەرمانی (Benzimidazole).

- بەشێوەیەکی فراوان بەکار دەهێنرێت بۆ لەناوبردنی مشەخۆرە ناوەکییەکان لەکرمە جۆراو جۆرەکانی گەدەو ڕیخۆڵەو سییەکان لە مەڕو بزنو مانگاداو دەرکەوتووە کە ئەنجامێکی باشی هەیە.

- خاڵێکی گرنگ هەیە لەکاتی بەکارهێنانیدا ئەویش ئەوەیە نابێت بدرێت بە ئاژەڵێکی ئاوس بەتایبەتی لەقۆناغە سەرەتاییەکانی ئاوسیدا چونکە دەبێتە هۆی :

تێکچوونە زگماکیەکان (Teratogenic effert))

- پەراوێزەکان:

١- گابا (GABA) واتە (Gamma animo butyric acid) : بریتیە لە یەکێك لە گوێزەرەوە دەمارییەکان لە ناوەندە کۆئەندامی دەماری ئاژەڵ و مرۆڤدا هەیە.

٢- Oestrous ovis جۆرێکە لە مێش کە دەچێتە لوتی مەڕەوە تووشی ئازاری دەکات و ئاژەڵەکە دەپژمێت و زۆرجار لەکاتی سەروپێ چاککردندا ئەم مێشە دەبینرێت.

## سەرچاوەکان:


1-Adams, H.R.,1995. Veterinary pharma cology and Thera peutice. 7th edition, lowastate university press, Ames,, USA.

2-Blood, D.C. and Studder V.P., 1993
Bailliere's Comprehensive Veterinary Dictionary
W.B. Saunders, London

٣- المدخل الى علم الادوية البيطرية تاليف فرانك الكسندر : پەرچڤەی : د.علی عزیز الخیاط ١٩٨٨ بغداد.

# بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان لە ئاژەڵداو نەخۆشییەکانی شێرپەنجە لە مرۆڤدا

زۆربەی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە زانستییە نوێیەکان لە جیهاندا ئەوەیان پیەلماندووە کە ئەو کەسانەی ماددە هاندەرەکان واتە (هۆرمۆنەکان) بەکاردەهێنن و بەرێژەیەکی فراوان بەخانەو شانەکانی لەشیان بڵاودەبێتەوە زیاتر بۆیان هەیە کەتووشی نەخۆشییەکانی شێرپەنجە ببن. مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی هۆرمۆنەکان لە دوو سەرچاوەوە وەردەگرێت،

یەکەم بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هۆرمۆنەکان بەکاردەهێنێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە درێژخایەنەکان (Chronic diseases) کە بۆماوەیەکی درێژ پێویستی بە چارەسەر هەیە وەکو نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسەدان (ڕەبوو:Asthma)و نەخۆشییەکانی جومگەکان و نەخۆشییەکانی پێست و کۆئەندامی زاوزێی....هتد

دووەم بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی بەکارهێنان و خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە بەهۆی هۆرمۆنە جۆربەجۆرەکانەوە گەشەیان کردووەو قەڵەوبوون، بەتایبەتی ئەو هۆرمۆنانەی کە سەر بەگلاندی (Supra renalgland) کە دەکەوێتە سەر گورچیلەو پێیان دەوترێت ( steroids → Cortico )، زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە بەکارهێنانی ئەم هۆرمۆنانە لە ئاژەڵدا (مانگاو مەڕدا) پێش سەربڕینیان دەبێتە هۆی گەشەکردنێکی خێراو ناسروشتیانەلەکاتی خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە بەهۆی هۆرمۆنەکانەوە قەڵەوکراون گەشەپێکراون. ئەم مەسەلەیەش لەلایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییەوە کە سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانە گفتوگۆیەکی چڕوپڕی لەسەر کراوەو لەئەنجامدا بووە هۆی وەستاندن و لەکارخستنی زۆربەی ئەو کۆمپانیا جیهانییانەی کە هۆرمۆنەکان بەکاردەهێنن لە قەڵەوکردنی ئاژەڵ پێش سەربڕینیان بە مەبەستی زیادکردنی بڕی

گۆشت بەماوەیەکی کورت. هۆرمۆنەکان لەباری فسیۆلۆجیدا لە لەشی مرۆڤدا جۆرەکانیان زۆرەو بە لەشدا بڵاودەبنەوەو هەریەکەیان فەرمانێکی تایبەتیان هەیەو کاریگەری خێرایان هەیە، کوێرەڕژێنەکان دروستیان دەکەنو یەکسەر دەڕژێنە خوێنەوەو لەڕێگەی موولولە خوێنەکانەوە دەگەنە هەموو ئەندامەکانی لەش بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان. بەڵام بەپێچەوانەوە گەر بەبڕێکی زیاتر بەکارهێنران لە پێویستی لەش ڕێگەخۆشکەرێك دەبن بۆ تووشبوون بە نەخۆشییەکانی شێرپەنجە. هەندێك لە لاوان لە (کوڕوکچ) هۆرمۆنەکان بەکاردەهێنن بەشێوەیەکی فراوان بەبێ گوێدانە ئامۆژگارییەکانی پزیشکی پسپۆڕ بەمەبەستی جوان کردنی لەشولاریانو هەروەها وەك چارەسەرێك بۆ بێهێزی لەڕولاوازیان هەروەها خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە بەکاریگەری هۆرمۆنەکان قەڵەوکراون. بێگومان ئەمەش کارێکی خراپ دەکەنە سەر تەندروستیان چونکە بەرزبونەوەی ئاستی هۆرمۆنەکان لە خوێندا دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی لەش بەشێوەیەکی گشتیو خاوبوونەوەی ماسولکەکانو دەمارەکان بەتایبەتی ئەمەش دەبێتە هۆی بێهێزیو ئێسقانەکان زۆربە ئاسانی دەشکێن بەتایبەتی ئێسقانەکانی قاچو دەست لەکاتی یاریکردن یاخود کەوتنە خوارەوەیان لە شوێنێکی بەرز.

لەلایەکی تریشەوە ناوەندە زانستییەکان لەڕێگەی توێژینەوە نوێیەکانەوە ئەوەیان سەلماندووە کە ژنانی ڕۆژئاوا بەڕێژەیەکی زۆر زیاتر تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی مەمك دەبن بە بەراورد لەگەڵ ژنانی ڕۆژهەڵات ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەڵکی ڕۆژهەڵات بەشێوەیەکی گشتی بەشێوەیەکی سروشتی دەژین بەوەی کە ئافرەتان لە تەمەنی گونجاودا شوودەکەنو منداڵیان دەبێتو خێزانێکی ڕێکوپێك پێك دەهێنن، بەبێ ئەوەی ژیانێکی دەستکرد پێك بهێنن بەهۆی بەکارهێنانی هۆرمۆنە جۆربەجۆرەکان، ئەمەش پێچەوانەی ئافرەتانی ڕۆژئاوایە کە زیاتر هۆرمۆنە زیانبەخشەکان بەکاردەهێنن بەتایبەتی هۆرمۆنە تایبەتەکانی دژی منداڵبوونو هۆرمۆنەکانی قەڵەوبوونو بێگومان ئەمەش کارێکی خراپ دەکاتە سەر باری تەندروستیانو باری کۆمەڵایەتیان.

## سەرچاوە:

گۆڤاری(ابقار اغنام)- الشرق الأوسط وشمال افريقيا.سالی شەشەم- ژمارە (٢٧) سالی (٢٠٠٠). د.ابراهيم الراوی. (تسمين حيوانات الذبح بالهرمونات و امراض السرطان لدی البشر).

# نەخۆشی تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان

## (PPR) Peste DesPetits Ruminants

لە کوردستان سامانی ئاژەڵی بە یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی ئابووری وڵات دادەنرێت بەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بە پیشەی ئاژەڵدارییەوە خەریکن بەتایبەتی لە گوندەکانو هەروەها ئاژەڵ بەسەرچاوەیەکی سەرەکی پرۆتین دادەنرێت. کۆمەڵێك دەردو نەخۆشی هەن کە تووشی ئاژەڵ دەبنو زیان بەم سامانە گرنگە دەگەیەنن، یەکێك لەو نەخۆشییانە کە بەتوندی تووشی مەڕو بزن دەبێت "نەخۆشی تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکانە ((PPR)) کە بێگومان لە ئەنجامدا زەرەوەر زیانێکی گەورە لە ئابووری وڵات دەگەیەنێت.

تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری پێی دەوترێت Peste des petitis ruminants و کورت دەکرێتەوە بۆ (PPR)و لەسەرچاوە عەرەبیەکاندا پێ ی دەوترێت " طاعون المخترات الصغيرة". تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان نەخۆشیەکی ڤایرۆسیەو ناوی ڤایرۆسەکە "Morbillivirus" کە دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی "paramyxoviridae" ڤایرۆسی نەخۆشیەکە بە شێوەیەکی سەرەکی تووشی مەڕو بزن دەبێتو نەخۆشییەکە لە هەر چوار وەرزی ساڵدا بوونی هەیەو دەرکەوتووە کە زیاتر لەو وەرزانەدا بڵاو کە باران دەبارێتو شێدارنو هەروەها گۆڕانی پلەی گەرمی لەناکاوی دەوروبەریش کاریگەری خۆی هەیە.

هۆکاری نەخۆشی (PPR) : بەپێی سەرچاوەکان خێزانی (paramy xoviridae ) بەم شێوەیە پۆلێن دەکرێت:

| Paramy xoviridae | |
|---|---|
| Subfamily | Snb Family |
| Paramyxovirinac | Pneumovirinae |
| 1- Respirovirus . | 1- Pneumovirus |
| 2.Rubulaviurs | 2- Metapneumoviurs |
| 3- Morbillivirus. | |

- تـیرەی ڤریـۆنی ( Paramyxo virus) دەگاتـە ١٥٠-- ٢٠٠ نانۆمیتـەرو درێژییەکـەی دەگاتە ٨- ٢٠ نانۆمیتەر.

- سەر بە کۆمەڵی (RNA Virus).

- قەبارەی نزیکەی KB(16 -15)

- لە پێکهاتەی ڤایرۆسەکەدا کۆمەڵێك پرۆتین هەن بەم ناوانە:

- Hemagglutinin
- Neuraminidase
- Fusion protein
- Nucleoprotein
- Transcriptase
- Matirxprotein

ئـەم پرۆتینانـە رۆڵـی سـەرەکییانە لـە چـۆنیەتی دروسـتبوونی نەخۆخـشییەکە (Pathogenesis )دا هەیە.

## - لە نیشانە دیارەکانی نەخۆشی تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان:

*مـاوەی تووشـبوون بـە ڤایرەسـی نەخۆشـییەکەو تـاوەکو دەرکـەوتنی نیـشانەکانی (Incubation period) نزیکەی ٢- ٦ ڕۆژ دەخایەنێت.

*پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵی تووشبوو لەناکاودا بەرز دەبێتەوە دەگاتە (٤٠- ٤١ س).

*ئاژەڵی تووشبوو بێهێزو لەڕو لاواز دەبێت لە لەوەڕ دەکەوێت.

*دەم و لووتی ئاژەڵی تووشـبوو ئاودەکاتو بـەرە بـەرە خەسـت دەبێتـەوەو بـۆنێکی ناخۆشی لێدێت بەتایبەتی لەکاتی هەناسەداندا.

*چاوی ئاژەڵی تووشبوو سوردەبێتەوە (Congested).

*بۆشـایی دەم (Oral cavity) ئـاژەڵی تووشـبوو توشـی ( necrotic stomatitis) دەبێـت کـە بـە نیـشانەیەکی جیاکـەرەوەی سـەرەکی نەخۆشـییەکە دادەنرێـت کـە بـە شـێوەیەك لێـوو پـوكو زمـانی ئاژەڵەکـە دەقڵـشێتو کـەفێکی زۆر دەکـاتو بـۆنێکی زۆر

ناخۆشی لێدێت.

*ئـاژەڵی تووشـبوو تووشــی سکـچوونێکی تونـد دەبێــتو لەئەنجامـدا ئاژەڵەکـە وشـك دەبێتەوە (Dehydration)

*کۆئەندامی هەناسەدان تووشی Bronchemonia دەبێت بە بەردەوامی دەکۆکێت.

*ئاژەڵی ئاوس(Prgnant) تووش بەرخستن (بەراویتەبوون) دەبێت.

*رادەی لەناوچوونو تووشبوون لەئاژەڵـە تەمـەن بـچووکەکاندا زیـاترە وەك لـە ئاژەڵـە تەمەن گەورەکان

## چارسەرکردن:

نەخۆشی تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان هیچ چارەسەرێکی تایبەتی نیە، بەڵام لـەکاتی تووشبووندا پێویستە ئاژەڵە تووشبوەکان جیابکرێنەوەو جوڵەیان سنوردار بکرێت لەگەڵ بـەکارهێنانی (Antibiotic)و شـلەمەنی، هـەروەها بـەکارهێنانی Vaccine بـۆ کۆتـانی ئاژەڵە ساغەکانی ناوچەکە بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکە.

## سەرچاوەکان:

1- Peste Des Petitis Ruminants (PPR): The Disease, Diagnosis and control strategies,
- Tim. U. obi, DVM, MVM, PHD
- Team leader, Animal Health and Production.
- FAO North Coordination- Erbil, Eraq.
2- The Merck veterinary Manual English edition, 1998.
3- Radopstits, O.M, Gay, C.C, Blood,D,C and Hinchcliff, K.W, 2000. veterinary Medicine 9th edition.

# نەخۆشی

# گـــاوەنـــاز

## Actinomycosis or lumpy jaw

نەخۆشی بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لە بارێکی نافسیۆلۆژی کە بەسەر کۆئەندامەکانی لەشی ئاژەڵ یاخود مرۆڤ دێتو لەئەنجامدا توانای ئەنجامدانی چالاکییەکانی بەشێوەیەکی سروشتی نامێنێت، زۆر هۆکاری هەیە کە دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەم بارە نافسیۆلۆژییە لەوانە هۆکارە نەخۆشخەرەکانی وەکو بەکتریاو ڤایرۆسو کەڕووەکانو زیندەوەر سەرەتاییەکانو هەندێك جار هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی یان زۆری پێکهاتەی سەرەکییەکانی خۆراك وەکو پرۆتینو چەوەریو ڤیتامینەکانو جۆرەکانی خوێ...هتدو هەروەها هۆکارەکانی ژینگەو دەروبەر وەکو بەرزبوونەوەی یان نزم بوونەوەی پلەی گەرمی یاخود بەرزبوونەوەی ڕادەی شێ کاری گەری خۆی هەیە.

ئاژەڵیش هەروەك زیندەوەرێکی بایۆلۆژی تووشی گەلێك نەخۆش دەبێت کە دەبێتە هۆی تێکچوونی باری فیسیۆلۆژی لەشیو پەکخستنی کۆئەندامەکانی لەشیو بەرە بەرە لاوازی دەکاتو بێ هێز دەبێت لەئەنجامدا زەرەروو زیانێکی گەورە بە ئابووری وڵات دەگەیەنێت.

یەکێك لەو نەخۆشیانە نەخۆشی (گاوەناز)ە کە زیانێکی لەبەرچاو بە سامانی ئاژەڵ دەگەیەنێت بەوەی کە تووشی ڕەشەوڵاخ دەبێت لە کوردستانداو دەبێت هۆی کەم بوونەوەی بەرهوومی ئاژەڵ، لەبەر ئەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری لەم بارەیەوە بەسوود دەبێت بۆ ئەو کەسانەی بە خێوکردنی ئاژەڵەوە خەریکن.

### نەخۆشی گاوەناز:

نەخۆشـی Actinomycosis لـە زۆربـەی ولاتـانی جیهانـدا تۆمـار کـراوە بـلاوە، لـە کۆ دەواریدا بە نەخۆشیەکە دەوترێت (گاوەناز) بە تایبەتی لەنێو ئـەو خەڵکانـەی کـە بـە بەخێوکردنی ڕەشەولاخەوە خەریکن، وا ناسراوە کـە نـە خۆشـی گاوەنـاز زیـاتر تووشـی ڕەشەولاخ دەبێت بە تایبەتی تووشی مانگا دەبێتو هەندێك جار تووشی ئەسپو بەرازیش دەبێت.

نەخۆشـی گاوەنـاز گرنگییـەکی تایبـەتی هەیـە لای خـاوەن ئـاژەڵ، چـونکە زۆر لـەم نەخۆشیە دەترسێت بـەوەی کـە نەخۆشـیەکە لـەناکاو سـەرهەڵدەداتو هـەروەها لـەکاتی چارەسەرکردندا ولاخی تووشبوو وەلامدانەوەیەکی ئەوتۆی نییە بـۆ دەرمانـەکانو بـەپێی سەرچـاوە پزیـشکیەکان هەنـدێك جـار نەخۆشـی گاوەنـاز تووشـی مـرۆڤیش دەبێـتو لەئەنجامدا زیان بەتەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت.

هۆکاری نەخۆشی گاوەناز بەشێوەیەکی سروشتی لە بۆشایی دەمی ئاژەڵەکەدا ( Oral Cavity) دا هەیەو دەژی، چاوەڕێ هەڵێك دەکات کە ڕۆڵی خۆی تێدا ببینێتو ببێتە هۆی دروست بوونی نەخۆشییەکەو دەرکەوتووە کە هۆکـاری نەخۆشـی گاوەنـاز زیـاتر تووشـی شـانە ڕەقـەکان (Hard tissues) ەبێـتو وەکـو ئێـسکەکانی لـەش بەتایبـەتی ئێـسکی شـەویلگەی سـەروو یـان شـەویلگەی خـواروو،و کـەمتر تووشـی شـانە نەرمـەکان ( Soft tissues) دەبێتو وەکو ماسولکەکان.

## هۆکاری نەخۆشی گاوەنازو چۆنیەتی دروست بوونی نەخۆشیەکە؟

بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریایەك کە پێ ی دەوترێت Actinomyces Bovis.

– ئەم بەکتریایە بەشێوەیەکی سروشـتی لـە بۆشـایی دەمـی مانگاکـەدا دەژیو هەیـەو ئاژەڵەکە تووشی نەخۆشی گاوەناز دەکات، بەکتریای نەخۆشیەکە زیاتر مەیلو ئارەزووی بۆ شانە ڕەقەکان هەیە بەتایبەتی لەدەمو چاوی ئاژەڵەکەداو لەکاتی بارودۆخی گونجاو دا

هێرش دەكاتە سەر شانە قوڵەكانی ناوەوە لەكاتی برینداروبونی پەردەی ناو دەم بەشتێكی تیژ یان ڕەق وەكو پارچە وایەرێك یان پارچە تەلێكو لەئەنجامدا دەبێتە هۆی ڕوودانی هەوكردنی ئێسك. (Osteomyselitis) بەتایبەتی هەوركدنی ئێسكەكانی شەوڵگەی سەروو یان شەویلگەی خواروو، كەبێ گومان بەم كارەش كاردەكاتە سەر وەرگرتنو جوینی ئالیك لەلایەن ئاژەڵی تووشبوو:

Prehension and Mastication

لە ئەنجامی ئاژەڵی تووشبوو توانای هەرسكردنی ئالفی بەشێوەیەكی سروشتی نامێنێت.

## نیشانە دیارەكانی نەخۆشی گاوەناز:

نیشانەكانی نەخۆشییەكە دیارتر لەسەر مانگاو دەردەكەوێت چونكە مانگا زیاتر لە ئاژەڵی دیكە تووشی نەخۆشییەكە دەبێتو نەخۆشییەكە بەوە دەستپێدەكات كە ئێسقانەكانی شەویلگەی سەرەوە یان خوارەوە ئاژەڵی توشبوو دەئاوسێت ( Bony Swelling)و ئاوساوییەكە بێ ئازارە لە سەرەتاوە بەرە بەرە ئاوساوییەكە گەورە دەبێتو بڵاو دەبێتەوە بەم لاو ئەولای شەویلگەكەدا، هەندێ جار لە ماوەی چەند هەفتەیەكدا دروست دەبێتو هەندێك جاری دیكە چەند مانگێك دەخایەنێت.

ئەم ئاوساوییەی لە ئێسكی شەویلگەدا دورست دەبێت زۆر ڕەقەو نەجولاوە واتە جێگیرەو ئەم لاو ئەولا ناكات بەڵام هەندێ جار لە دوا قۆناغەكانی دروست بوونیدا ئازاری لەگەڵدا دەبێت بەتایبەتی لەكاتی دەست لێدانیدا لەلایەن پزیشكانی ڤێترینەریو، دوای ماوەیەك ئاوساوییە ڕەقەكەی كون دەبێتو دەكرێتەوەو لە ئەنجامدا برێكی كەم لە كێمی لێ دێتە دەرەوە كە لە شلەیەكی هەنگوینی لینج دەچێت كە هەندێك دەنكۆڵەی وردی ڕەقی سپی زەردباوی تێدا دەبینرێت Yellow- white granules.

لەئەنجامی ئەم گۆرانكاریانەی كەبەسەر ئێسقانەكانی شەویلگەدا دێت ئاژەڵی تووشبوو

زۆر بەزەحمەت تواناى وەرگرتنى ئالفو جوينى دەبێتو پرۆسەكە زۆر ئازاراوييەو بەرە بـ ‎ ‏ە ئاژەڵەكە لاوازو بێ هێز دەبێتو كێشى كەم دەكات، هەندێك جار كە نەخۆشيەكە زۆر توندو تيژ دەبێتو ئاوساوييەكە بلاو دەبێتەوە لە شانە ڕەقەكانى وەكو ئێسقانەوە بۆ شانە نەرمەكانى وەكو ماسولكەكانى دەوروبەرى ناوچەى قورگى ئاژەڵى تووشبوو كە ئەمەش كاردەكاتە سەر هەناسەدانى ئاژەڵەكەو لە ئەنجامدا بە زەحمەت هەناسە دەدات.

هەروەها جارى وا هەيە شانە نەرمەكانى ماسولكەكانى سورێنچك دەگرێتەوەو دەگاتە بەشەكانى ديكەى كۆئەندانى هەرسو بەمەش نێگەتيڤانە كار دەكاتە سەر پرۆسەى هەرسكردنو ئاژەڵى تووشبوو جار بەجار با دەكاتو تووشى زكچوون دەبێت.

بەپێى هەندێك لەسەرچاوەكانى پزيشكى ڤێترينەرى هەندێك جار نەخۆشى گاوەناز دەبێتە هۆى هەوكردنى گونى گاى تووش بوو (Orchitis).

## چارەسەكردن:

لە چارەسەرى ئەم نەخۆشييەدا پێويستە ڕێگەى نەشتەرگەرى بەكاربهێنرێتو هەروەها بەكارهێنانى مادەى iodode بەڵام لە قۆناغە پێشكەوتووەكانى نەخۆشييەكەدا ئەنجامێكى ئەوتۆى نييە.

سەرچاوە:

1- Radostits, O.M, Gay, C.C, Blood D.C and Hinchcliff, K.W 2000 Verterinary Medicine, qth edition.

٢- الامراض الباطنية/ الدكتور محمود احمد النديم.

# نەخۆشی پزوو

## Nasal bots

هۆکـــارە نەخۆشـــخەرەکان زۆرنو هەمـــە جـــۆرن لەوانـــەش بـــەکتریاو ڤـــایرۆس ی مـشەخۆرەکانو پریـۆن کـە دەبنـەهۆی نەخۆشـی لـەمرۆڤو ئاژەڵەکانـدانو لـە ئەنجامـدا تەندروستییان دەخەنە مەترسییەوە سەرەڕای ئەمانەش هەندێك هۆکاری دیکە هـەن کـە بەبـەردەوامی لـە ژینگـەدا بوونیـان دەبێتـەهۆی پەکخـستنی کۆئەندامـەکانی لـەشو نەخۆشخستنیان کەئەمەش بێگومان کاردەکاتە سەر لایەنی بەرهەمهێنانی ئاژەڵەکە.

پزوو یەکێکە لـەو نەخۆشـیانەی کـە بـەهۆی مێـشێکەوە ڕوودەداتو کاردەکاتـە سـەر تەندورسـتیو چـالاکی ئـاژەڵی تووشـبوو هـەروەها بـەپێ ی سەرچـاوە زانـستییەکان لەمرۆڤیشدا ئەم نەخۆشییە تۆمار کراوە.

کرۆمکەی مێشەکە لە بۆشاییەکانی لـووتی ئـاژەڵی تووشـبوودا ژیـان بەسـەر دەبـاتو گەشە دەکات بەشێوەیەك کە قەسابەکانو خانمان بەتایبەتی لەکاتی سـەروپێ چاکردنو پاکردنیدا زیاتر چاویان بە کرۆمکەی مێشەکە دەکەوێت وپێی دەڵێن، کرمی لووت.

بەشـێوەیەکی گـشتی خـاوەن ئاژەڵـەکان لـە کوردسـتاندا شـارەزاییەکی باشـیان پەیداکردووە لە ناسینەوەی نەخۆشییەکەو دەچـنە کلینیکـەکانی پزیـشکانی ڤێتێرنـەریو دەڵـێن ئاژەڵـەکانمان پزوویـەتی، لەبـەر ئـەوە بـە پێویـستم زانـی لایەنـە زانـستییەکەی نەخۆشیەکە بخەمە پێش چاوی خۆێنەران.

### نەخۆشی پزوو چی دەگەیەنێت؟

لەکودەواریدا بەنەخۆشییەکە دەوترێت"پزوو"و هەندێجار پێی دەوترێت "کرمـی لـوت" لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری پێی دەڵێن: Nasal bots یـان "Oestriasis" یـان Oestrus Ovis infestation"

پزوو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێشێك کە ناوە زانستیەکەی بریتیە لە : Oestrus Ovis، کە لە قۆناغەکانی کرمۆکەییدا بەشێوەیەکی سروشتی لە ڕێڕەوەکانو گیرفانەکانی "Sinuses" لووتی مەڕدا دەژیو جێگیر دەبێتو زیاتر مەڕ هەستیار ترە بۆ تووشبوون بەم جۆرە مێشەو زیانی پێدەگەیەنێتو هەندێکجار تووشی بزنیش دەبێت.

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە تووشی سەگو مرۆڤیش دەبێت"Zoonoses"، لەمرۆڤدا مێشەکە کرۆمۆکەکان بەرهەم دەهێننو بڵاوی دەکەنەوە لەسەر چاوو لێوو لووتی مرۆڤەکەداو دەبێتە هۆی نەخۆشی "Ocular Myiasis" یاخود دەبێتە هۆی هەوکردنی بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسەدان.

مێشەکە زیاتر لە وەرزە گەرمەکاندا چالاك دەبنو لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا بڵاووەو بەتایبەتی لە باشووری ئەفریقاو بەرازیلو لەم دواییەدا ڕێژەی تووشبوون بەم مشەخۆرە لە وڵاتانی باکوری ئەوروپا کەم بووەتەوە . کوردستانیش یەکێکە لەو وڵاتانەی کە مێشەکەی تێدا هەیەو مەڕو ماڵات تووشی پزوو دەکات.

### سوری ژیانی Oestrus Ovis

تێگەیشتن لە سوڕی ژیانی هەر زیندەورێك زۆر پێویستە بۆ تێگەیشتن لە کۆنترۆڵکردنی ئەو زیندەوەرەو چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیەی کە دروستی دەکات.

مێشی پێگەیشتوو درێژییەکەی نزیکەی ١ سم دەبێتو ڕەنگێکی تاریکی خۆڵەمێشی هەیەو مێیەی مێشەکە کرۆموکەکان "Larvac" بەرهەم دەهێننو لە دەوروبەری لووتی ئاژەڵەکەدا بڵاوی دەکەنەوە، کرۆمۆکەکان بە قەبارە بچووکنو ئەستورنو ڕەنگەکەیان سپی زەردباوەو وردە وردە دەجولێنو کۆچ دەکەن بە ئاراستەی بۆشایی لووتی ئاژەڵەکەو دەگەنە گیرفانەکانیو زۆربەیان زۆربەی کاتیان لە گیرفانەکانی " Paranasal sinuses" بەسەر دەبەن، چونکە کرۆمۆکەکان ئارەزووی ئەو شوێنەیان هەیەو بۆشاییو گیرفانەکانی لووتی مەڕ بە گونجاوترینو لەبارترین ژینگە دادەنێن بۆ گەشەکردنیانو

پێگەیشتنیان.

کاتێك کە کرۆمۆکەکان پێ دەگەن ڕەنگەکەیان دەگۆڕێت بەوەی کە ڕەنگی تاریکیان لەسەر دەنیشێت‌و لە دواییدا هێلێکی ڕەش بەسەر پارچەی پشتەوە دەردەکەوێت.

ماوەی کرۆمۆکەیی"Period Larval" نزیکەی ١- ١٠ مانگ دەخایەنێت‌و لە ئاژەڵە تەمەن بچوکەکاندا ماوەکە کورت تر دەبێت‌و بەپێی سەرچاوەکان ماوەکە جیاوازی هەیە لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی دیکە. کاتێك کرمۆکەکە دەگاتە قۆناغی پێگەیشتوو بەرە بەرە گیرفانەکان‌و بۆشایی لووت بەجێدەهێڵن‌و دەکەونە سەر زەوی‌و دوایی ماوەیەك دەگۆڕێن بۆ کرۆمۆکەی ناو قۆزاخە(بەچکە مێرۆ Pupate) ئەم قۆناغەش نزیکەی ٣- ٩ هەفتە دەخایەنێت‌و زیاتر پەیوەندی هەیە بە هۆکارە ژینگەییەکانەوە لەکاتی لەباری ئاوو هەوای ژینگەدا گەشە دەکات‌و پێ دەگات‌و دەگۆڕێت بۆ مێشێکی پێگەیشتووو کە لە ئەنجامدا جووت بوون ڕوودەدات لەنێوان نێرو مێ داو دووبارە مێیەکان دەست دەکەنەوە بە بەرهەمێنانی کرۆمۆکەکان‌و سوڕی ژیانیان دووبارە دەبێتەوە.

## نیشانەکان:

بەشێوەیەکی گشتی نیشانەکانی پزوو لەسەر ئاژەڵی تووشبوو دەردەکەوێت لە ئەنجامی بوونی کرۆمۆکەکانی مێشەکە لە بۆشایی‌و گیرفانەکانی لووت داو جوڵە جوڵ‌و کۆچ کردنیان لە شوێنێکەو بۆ شوێنێکی دیکە کە ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی:

یەکەم: ئەوەی کە دەردراوی لووت بەرە بەرە زیاد دەکات‌و بەوەی کەلە قۆناغە سەرەتاییەکانی تووشبوونەوە بەشلەیەکی ساف‌و پاك دەستپێدەکات‌و وردە وردە شلەکە خەست دەبێتەوەو لە قۆناغەکانی کۆتاییدا پەڵەی خوێنی تێدا دەبینرێت‌و بەرە بەرە بڕی خوێنەکە زیاد دەکات‌و ئەمەش ڕوودەدات لەئەنجامی بوونی چەند پێکهاتەیەك لە شێوەی دڕکدا لەلەشی کرۆمۆکەکاندا کە دەیچەقێنێتە گیرفانەکانی لووتی ئاژەڵی

تووشبوو و بریندار کردنیو خوێن بەربوونی.

دووەم: لەئەنجامی زۆری ژمارەی کرۆمۆکەکانو بەردەوام بوونی چالاکیان لە بۆشایی لووتدا دەبنە هۆی ئەستور بوونی لینجە پەردەی لوتی ئاژەڵەکەو هەروەها بونی ڕێژەیەکی زۆر لە دەردراوی خەستەوەبووی ناو لووت کە کۆدەبێتەوەو دەبێتە هۆی پەککستنی پرۆسەی هەناسەوەرگرتنو هەناسە دانەوەو زۆر جار تووشی هەناسە بڕکیێ ی دەکات.

سێیەم: دیاردەی پژمینو سەر ڕاوەشاندنو دووبارە بوونەوەی بۆ چەند جارێك لەلایەن ئاژەڵی تووشبووەوە ئەمەش ڕوودەدات لە ئەنجامی جووڵە جوڵو کۆچ کردنی کرۆمکە گەورەکان لەناو گیرفانەکانی لوتدا.

چوارەم: هەندێ جار کرمۆکەکان تواناى جێهێلانی گیرفانەکانی لووتیان نیەو لە ئەنجامدا تیایدا لەناو دەچنو دەبنە هۆی هەوکردنی گیرفانەکان "Sinusitis" و ئەگەر لەم قۆناغەدا چارەسەر نەکرا بەرە بەرە هەوکردنەکە زیاد دەکاو بەرەو مێشکی ئاژەڵەکە هەنگاوە دەنێتو ئەنجامەکەی کوشندە دەبێت.

پێنجەم: لەکاتی تووشبووندا ئاژەڵەکەوردەوردە لە لەوەڕ دەکەوێتو لەڕو لاوازی پێوە دیاردەبێت.

**چارەسەرکردن:**

ڕێگە گرتن لەبەرهەمهێنانی کرمۆکەکان پێویستە ئاژەڵەکان شوێنەکانیان جیێ گۆڕکیێ پیێ بکرێتو پێویستە پرۆسەی چارەسەر کردن لەکۆتایی وەرزی بەهاردا دەستپێبکات، مەبەستی ڕێگەگرتن لەتووشبوون بە ژمارەیەکی زۆر لەمێشەکان.

- قەلاچوکردنی مێشو مەگەز بە بەردەوامی لە کێڵگەداندا.
- بەکارهێنانی هەندێك دەرمانی کاریگەر وەکو:

١– کلۆزانتیل، Closantel.

٢- ئيڤرمكتين، Ivermectin.

٣- ڕافۆكسنايد: Rafoxanid.

**سەرچاوە :**


- The, merck veterinary Manual English edition, 1998, P. 1109.
- Radostits, O. M, Gay, C,C M100d and Hinchcliff, K.w(2000) veterinary Medcine Atext book of the disease of cattle, sheep, pigs, Goats and Horses.

# نەخۆشی گوێ ڕەپە
## Tetanus

زۆر هۆکـاری نەخۆشـی هـەن بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ لـە ئـاژەڵی نەخۆشەوە ناگوێزرێنەوە بۆ مرۆڤ، بەڵکو هۆکاری نەخۆشیەکە بەجیا تووشی مرۆڤو ئاژەڵ دەبێتو بەم نەخۆشیانەش هەر دەوترێن نەخۆشییە هاوبەشـەکانی نێـوان مـرۆڤو ئـاژەڵ (دەردە مرۆژەڵییەکان)، ئەمەش لەبەر ئەوەی هۆکاری نەخۆشیەکە بونی لە ژینگەدا هەیەو دەبێتە هۆی دروستبوونی نەخۆشی لە ئاژەڵو مرۆڤدا.

یەکێك لەو نەخۆشیانە، بێگومـان نەخۆشـی گـوێ ڕەپەیـە کـە هۆکارەکـەی لەژینگـەدا هەیەو بڵاوە بەتایبەتی لەخاكو خۆڵدا لەکاتی بوونی برینێك لـە لەشـی ئـاژەڵ یـان مـرۆڤ، بەهـەڵی دەزانێـتو دەچـێتە برینەکـەوەو گەشـە دەکـاتو دەبێتـە هـۆی دروسـت بـوونی نەخۆشیەکە. لەمرۆڤدا بە نەخۆشیەکە دەوترێت دەردە کۆپان.

لە سەردەمانی پێشووتر بەهۆی لاوازی هۆشیاری زانستیو کەمی ژمارەی خوێندەواران لە کۆمەڵگای کوردەواریو بەتایبەتی لە گوندەکاندا، گەلێك لێکدانەوەی سادەو زانسیتانە لە لایەن خەڵکەوە بۆ ئەم نەخۆشیە ئەنجام دراوە، بەوەی کە بـە نەخۆشـییەکە گـوتراوە "شەوە" کەوا باو بووە کە شەوە گیاندارێکی نەبینراو بێتو هێرش بکاتـە سـەر ئـافرەتی سکپڕ لەکاتی منداڵبوونیداو لەئەنجامدا ئازاردانی و گیان لەدەستدانی.

لەبـەر ئـەوە بڵاوکردنـەوەی زانیـاری دەربـارەی ئـەم نەخۆشـییە بـەکارێکی پێویـست دەزانرێت چونکە هـەوڵ دەدەیـن زانـستیانە نەخۆشـییەکە ڕوون بکەینـەوە بـە مەبەسـتی ئەوەی لێکدانەوەی زانستی جێـی لێکدانـەوەی نازانـستیو میتافیزیکیـەکان بگرێتـەوە لـە ئەنجامـدا ببێتـە هـۆی بەرزکردنـەوەی ئاسـتی هۆشـیاری زانـستی لـەنێو کۆمـەڵگای کوردەواریدا.

## نەخۆشی گویٚ ڕەپە :

لە کۆمەڵگای کوردەواریو بەتایبەتی لەنێو گوندنشییەکاندا بە نەخۆشیەکە دەوترێت "گویٚ ڕەپە" زیاتر نەخۆشییەکە کە تووشی ولاخە بەرزە گویٚ درێژوو ئەسپو ماینو ئێستر" کە یەکێك لە نیشانە سەرەکییەکانی نەخۆشییەکە ئەوەی کە گوێی ئاژەڵی تووشبوو ڕەق دەبێتو ڕەپ دەبێت.

عەرەب پێی دەڵێن "نەخۆشی کەزاز" و لەمرۆڤدا پێی دەڵێن نەخۆشی دەردە کۆپان.

نەخۆشی گویٚ ڕەپە لەزۆبەی ولاتانی جیهاندا بلاوەو تووشی زۆربەی جۆرەکانی ئاژەڵ دەبێتو لە ولاخە بەرزەوەو ڕەشەولاخو مەڕو بزنو بەراز، بەلام بەپێی توێژینەوەکان ولاخە بەرزە زیاتر هەستیارترە بۆ هۆکاری نەخۆشییەکە، چونکە جۆرەکانی ولاخە بەرزە زیاتر بۆیان هەیە لەشیان تووشی ڕووشاندنو برینداربوون ببن، ئەمەش بیٚ گومان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو کارەی کەپێیان دەکرێت بە تایبەتی لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستان کە ولاخە بەرزە بەکاردەهێنرێت بۆ هەلگرتنی بارو گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری ڕادەی لەناوچوون "Case- fatality rate" لە ئاژەڵە تەمەن بچووکەکاندا دەگاتە ٨٠٪ لە ئاژەڵە کاوێژکەرەکاندا نەخۆشی گویٚ ڕەپە بلاو دەبێتەوە زیاتر لەدوای پرۆسەی کلك بڕین "Docking" یان گون خەساندن "Castration".

## هۆکاری نەخۆشییەکەو چۆنیەتی دورست بوونی نەخۆشییەکە :

هۆکاری سەرەکی نەخۆشی گویٚ ڕەپە دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لە بەکتریا کە پیٚ ی دەوترێت: Clostridium tetani

– ئەمەبەکتریایە لە ژینگەدا زۆر بلاوبۆتەوەو بە هەمیشەیی بوونی هەیە، چونکە توانای دروست کردنی سپۆری هەیە لەئەنجامدا توانای مانەوەی هەیە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ.

– لە کۆمۆڵەی گرام –پۆزەتیڤەوە $G^+$ bacteria.

- توانای جوڵەی هەیە "Motlile"
- بەبێ بوونی ئۆکسجین گەشە دەکات Anaerobic
- دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی دوو جۆر ژەهر.

یەکەم ژەهری (Hemolysin Tetanolysin) کە دەبێتە هۆی تێکشاندنی شانەکانو شیبوونەوەیان.

دووەم ژەهری (Neurotoxin Tetanospasmin) کە ژەهرێکی دەمارییەو بە ژەهرێکی کوشندە دادەنرێتو لێپرسراوی یەکەمە لە سەرهەڵدانینەخۆشی گوێ ڕەپەو دەرکەوتنی نیشانەکانو بەشێوەیەکی سەرەکی پێکهاتووە لە ماددەی پرۆتینو لەجۆری (Exotoxin) و مرۆڤو وڵاخە بەرزە زۆر هەستیارن بۆ ئەم جۆرە ژەهرە.

لەکاتی بوونی برینێك لە لەشی ئاژەڵی تووشبووداو کەمبوونەوەی ئاستی گازی ئۆکسجین لە شوێنەکەدا ڕێگە خۆشکەرە بۆ بەرهەمهێنانی ژەهر لەلایەن بەکتریاکەوەو بەرە بەرە بڕەکەی زیاد دەکاتو بڵاو دەبێتە بە لەشی ئاژەڵەکەدا، لە ڕێگەی دەمارەوە "Nerves" ڕێگە دەگرێتە بەر بەرەو ناو لەشیو لەئەنجامدا دەگاتە ناوەندی کۆئەندامی دەمار CNS وەکو درکە پەتك Spinal Cordو لاکێشە مۆخMedulla.

لەبەر ئەوەی بوونی هەر جۆرە برینێك لەلەش بە فاکتەرێکی ڕێگەخۆشکەر دادەنرێت بۆ سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە، بەپێی سەرچاوەکان نەخۆشی گوێ ڕەپە زیاتر سەر هەڵدەدات لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەك لەوانە:

کلك برین Docking گون خەساندن Castrationو بڕینی شاخی ئاژەڵ Dehorningو هەروەها لەکاتی زایینی ئاژەڵ Parturition.

## نیشانەکانی:

ماوەی تووشبوون بە نەخۆشییەکەو هەتاکو دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی سێ ڕۆژ بۆ چوار هەفتە دەخایەنێت.

نیشانەکانی نەخۆشییەکە لەزۆربەی ئاژەڵە تووشبووەکان وەکو یەکە بەوەی کە بەشێوەیەکی گشتی ماسولکەکانی لەش گرژ دەبنو ڕەق دەبن "Muscle Stiffness" و لە دواییدا لەرزینی ماسولەکەکان دەردەکەوێت. جوڵاندنی شەویلگەکانی سنوردار دەبێتو

بەوەش ناتوانێت بەشێوەیەکی سروشتی ئاژەڵەکە بلەوەڕێت.

– ڕەق بوونی ماسولکەکانی پەلی دواوە وا لە ئاژەڵی تووشبوو دەکات کە بەشێوەیەکی ناسروشتیانەو نا جێگیرانە بجوولێنەوە.

– کلکی ئاژەڵی تووشبوو ڕەق دەبێتو ڕەپ دەبێت.

– گوێ ی ئاژەڵی تووشبوو ڕەق دەبێتو لەئەنجامدا ڕەپ دەبێتو بە نیشانەیەکی دیار دادەنرێت، هەر لەبەر ئەمەش بە نەخۆشیەکە دەوترێت "گوێ ڕەپە".

– کونی لووتی ئاژەڵی تووشبوو فراوان دەبێت.

– ڕۆژ بە ڕۆژ ئاژەڵی تووشبوو توانای خواردنی نامێنێت، چونکە ماسولکەی شەویلگەکانی ڕەق دەبنو توانای جوینی نامێنێتو لەئەنجامدا لیکێکی زۆر بەدەمیدا دێتە خوارەوەو ئەگەر ئاژەڵەکە هەوڵیدا خواردن بخواتو قوتی بدات، ئەوا دوای ماوەیەك خواردنەکە لە کونە لووتیەوە دێتە دەرەوە.

– ئاژەڵی تووشبوو تووشی قەبزی Constipation دەبێتو میز لەمیزڵدان گیر دەبێتو دەمێنێتەوە.

– بەرە بەرە ئاژەڵی نەخۆش توانای جوڵەو ڕۆیشتنی نامێنێتو بەم لاو لادا دەکەوێتو دەبێتە هۆی بریندار بوونی لەشی.

– ئاژەڵی تووشبوو لەشی زۆر ئارەق دەکاتەوەو کەمێك پلەی گەرمی لەشی بەرز دەبێتە.

– دوای ماوەیەك ماسولکەکانی لەشی ئاژەڵی تووشبوو بەشێوەیەك گرژ دەبنو ڕەق دەبن کەپێی دەڵێن "Tetanic Convulsions" ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ئەم دیاردەیە زیادە دەکات.

– ئاژەڵی نەخۆشی هەندێك جار مردار دەبێتەوە لەئەنجامی گرژبوونی ماسولکەکانی کۆئەندامی هەناسەدان کە دەبێتە هۆی خنکاندنی ئاژەڵەکە "Aspyiation" و ڕەق بوونی ماسولکەکانی هەناسەدان کە دەبێتە هۆی وەستانی هەناسە وەرگرتنو هەناسە دانەوە.

**نەخۆشی دەردە کۆپان لەمرۆڤدا :**

لەمرۆڤدا بە نەخۆشی یەکە دەوترێت "دەردە کۆپان" بەپێی بۆچوونی (د. عبدولکەریم محەمە عەلی، ٢٠٠١) دەردە گۆپان لەوەوە هاتووە کاتێك منداڵی تازە لەدایك بوو لەکاتی ناوك بڕیندا تووشی نەخۆشییەکە دەبێت دەموليوی شین دەبێتەوەو ئاگای لەخۆی نامێنێت هەندێك کەس بەمە دەڵێن گەشکە یان پەرکەمو لەئەنجامدا لە کۆمەڵگای کوردەواری لەسەردەمەکانی پێشووتر لە گوندەکاندا زیاتر عەبایەکی ڕەشیان بەسەر منداڵە نەخۆشەکان دادەداو دەیا کردە ژێر کوپان(کورتان) ی گوێی درێژێكو تەقەیان بەسەرەیدا دەکرد بەو هیوایەی منداڵەکە لە نەخۆشییەکە ڕزگاری بێتو چاك بێتەوە.

نەخۆشی دەردە گۆپان بەهەمان شێوەی نەخۆشی گوێ ڕەپە، هۆکارەکەی لە ژینگەدا بڵاودو لەکاتی بوونی ڕوشانێك یان برینێك بەکتریای نەخۆشخەر بەهەڵی دەزانێتو دەچێتە برینکەوەو گەشە دەکاتو دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی ژەهرو ڕوودانی نەخۆشیەکە، بەوەی ماسولکەکانی لەشەی بەشێوەیەکی گشتی گرژ دەبنو ڕەق دەبن بەتایبەتی ماسولکەکانی دەمو چاوو سەرو مل ڕەق دەبنو لەئەنجامدا ئازارێکی زۆر لەلەشدا دروست دەبێتو نەخۆش زۆر ناڕەحەت دەکات.

بەپێی ئامارەکان نەخۆشی دەردەگۆپان لەم سەردەمەدا زۆر کەمترە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمانی پێشووتر کە کاتێك ژنان لەکاتی منداڵبووندا کەمتر دەچوون بۆ نەخۆشخانەی منداڵبوون بە تایبەتی لە گوندەکاندا، بەپێ ی ئەو نەریتە باوەی ئەوسای مامانەکان کە شارەزاییەکی سادەیان هەبووەو ئەو کەرەستانەی کە بەکاریان هێناوە هیچ مەرجێکی تەندروستی تێدا نەبووەو بوونی هەمیشەیی هۆکاری نەخۆشییەکە لەژینگەدا بووەتە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر دایك بەسەر منداڵبوونەوە گیان لەدەست بدەنو لە کوردەواریدا وا لێکدراوەتەوە کە دایکەکە شەوە لێداوە یان تووشی شەوە بووە، بەڵام ڕاستییە زانستییەکەی ئەوەی لەبەر نەبوونی مەرجە سەرەکییەکانی تەندرسوتیو بوونی بەکتریای نەخۆشخەر لە ژینگەداو کارکردنی هەندێك کەس بە ناوی مامانەوە ، لەئەنجامدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە دایکەکە تووشی نەخۆشیەکە بێتو دوای ماوەیەك نیشانەکانی نەخۆشییەکە لەسەری دەردەکەوێت لەئەنجامی بڵاوبوونەوەی ژەهری بەکتریایەکە لە

لەشیدا گیان لەدەست دەدات.

لەبەر ئەوەی لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت بەمەبەستی پارێزگاری کردن لەگیانی دایکان و کۆرپەلەکانیان:

١- بڵاوکردنەوەی هۆشیاری تەندروستی لە کەناڵە ڕاگەیاندنە جیا جیاکانەوەو ڕوون کردنەوەی لێکدانەوەی دیاردەکان و نەخۆشییەکان بەشێوەیەکی زانستی و بەزمانێکی سادەو ساکار کە زۆربەی خەڵك تێبگات.

٢- پێویستە پرۆسەی منداڵبوون لە نەخۆشخانەکانی منداڵبوندا ئەنجام بدرێت لەبەر بوونی پزیشکی پسپۆڕو مەرجەکانی تەندروستی و پاك و خاوێنی.

٣- کوتانی منداڵان لە سێ مانگی یەکەم بە ڤاکسینی نەخۆشییەکە.

٤- پابەند بوون بەمەرجە سەرەکییەکانی پاك و خاوێنی ئەمەش لەبەر ئەوەی کە سپۆری بەکتریای نەخۆشخەر بە بەردەوامی لە ژینگەدا بوونی هەیە.

٥- دەبێت لەهەموو کاتێکدا بەدەستکیشی لاستیکەوە کاربکرێت.

چارەسەرکردن و کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشییەکە:

بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی گوێ ڕەپە پێویستە:

١- بەکارهێنانی ڤاکسینی نەخۆشی گوێ ڕەپە کە پێی دەڵێن " Formalin-inactivated adjuvanated Toxoids" کە بۆماوەیەکی درێژ بەرگری دەداتە ئاژەڵە کوتراوەکەو پێویستە ئاژەڵی ئاوس لەماوەی ئاوسیدا بکوترێت بەتایبەتی ماوەی (٤- ٦) هەفتە پێش زایینی ئاژەڵەکە، هەروەها پێویستە ئاژەڵی تەمەن بچووك وەکو جوانو لەتەمەنی (٣- ٤) مانگ بکوترێت.

٢- پاك و خاوێن ڕاگرتنی هەر برینێك لە لەشی ئاژەڵەکەدا لەلایەن خاوەن ئاژەڵەوەو پێدانی ماویە پشووی پێویست بە ئاژەڵەکە هەتاکو چاك بوونەوەی برینەکەی لەشی.

بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئاژەڵی تووشبوو بە گوێ ڕەپە پێویستە:

١- بەکارهێنانی دژە ژیانەکانی وەکو پەنسلین بۆ لەناوبردنی هۆکاری نەخۆشییەکەو واباشترە لە ڕێگەی دەمارەوە بدرێت " Intravenous administration".

٢- بەکارهێنانی دژە ژەهری گوێ ڕەپە " Tetanus antitoxin " بە بڕی " I.U

300000"لە ولاخەبەرزەدا هەموو دوانزە سەعات جارێك بۆ ماوەی سێ جار، هەروەها بەکارهێنانی ئەم دژە ژەهرە لە دەورو بەری برینەکەش پێویستە.

٣- پاکژکردنەوەی برینی لەشی ئاژەڵە تووشبووەکەو بەکارهێنانی Hydorgen Peroxide "H2O2" بۆ پاکردنەوەو لەناوبردنی هۆکاری نەخۆشخەر.

٤- بەکارهێنانی هەندێ دەرمانی خاوکەرەوە وەکو (Chlorpromazine) بۆ خاوکردنەوەی ماسولکەکان.

٥- پێدانی خۆراك لە ڕێگەی دەماری خوێنەوە " Intravenous" یان بەهۆی بەکارهێنانی " Stomach tube feeding" لەکاتی ئەوەی ئاژەڵە تووشبووەکە بۆماوەیەکی درێژ لە لەوەڕ کەوتووە.

٦- پێویستە لەماوەی چارەسەردا لەشوێنێکی بێدەنگو پاکو خاوێندا ئاژەڵەکە چارەسەر بکرێتو شوێنەکە ڕووناکی کەم بێت یان تاریك بێت باشترەو ئەم هەولانە نزیکەی (٥٠٪)ی ئاژەڵە نەخۆشەکان چارەسەر دەکات لەماوی ٢٧ ڕۆژدان.

**سەرچاوە:**


١- نەخۆشی یەکانی ئاژەڵ کە تووشی ئادەمیزاد دەبن، د. عبدالکریم محەمەد ٢٠٠١.

2- Carter, G,R, CHengappa, M.M.and Roberts, A.W, 1995< Essentials of Veterinary Microbiology. 5th editon.

3- Radostits, O. M, Gay , Blood, D. C, and Hincliff,, K, W., 2000. Veterinary Medicien, A text book of the disease of Cattle Sheep, Pigs, Goats and Horses.

٤- الامراض المشترکة بين الإنسان والحيوان، د. صباح العلوچي، - د. عبدالحسين بيرم، ١٩٨٥.

# نەخۆشی گەڕیی

## Psoroptic Mange

لە جیهاندا فەلسەفەی مشەخۆرەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەوەیە کە بۆ بەردەوامی ژیانیان هەمیشە دەیانەوێت کە یەك لایەنە سوود لە خانە خۆی وەربگرنو بەبێ ئەوەی لە بەرامبەردا هیچ سوودێکی پێ بگەیەنن.

مشەخۆرەکان بەشێوەیەکی گشتی زیانبەخشنو زیان دەگەیەنن بە تەندروستی مرۆڤو ئاژەڵو باڵندە بەجۆرێك کە گەشەیان دوا دەخەنو لەئەنجامدا لە بەرهەمو ووزەیان کە دەکەنەوە پێی زانستی مشەخۆرانی Parasitology مشەخۆرەکان دەکرێنە دووبەشی سەرەکی

مشەخۆرە ناوەکییەکان Endo Parasities

مشەخۆرە دەرەکییەکان Ecto Parasities

لەم ژمارەیەدا لە نەخۆشییەك دەدوێین کە هۆرکارەکەی مشەخۆرێکی دەرەکییەو ئەو زیانانەی کە لە ئەنجامی تووشبوون بە مشەخۆرێکی دەرەکییەو روودەدەن هیچی کەمتر نییە لەو زیانانەی کە لەئەنجامی مشتەخۆرێکی ناوەکییەو ڕوودەدەن.

مشەخۆرە دەرەکییەکان زۆرنو هەمە جۆرن لەوانەش (گەنە، ئەسپێ، کێچ، ڕشك...هتد) کە دەبنە هۆی ڕوودانی نەخۆشی لە ئاژەڵو مرۆڤدا کە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ کاری تێکدەرانەی خۆیان ئەنجام دەدەن یان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبنە هۆی گواستنەوەی زیندەوەرانی دیکە واتە وەك گوێزەرەوەیەکی بایۆلۆژی ڕۆڵ دەبینن.

نەخۆشی گەڕیی یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی مشەخۆرێکی دەرەکییەو ڕوودەداتو هەروەها لە ئاژەڵی تووشبووەو دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤو لەئەنجامدا مرۆڤ تووشی گەڕی دەبێتو واتە بەیەکێك لە نەخۆشیە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ ئاژەڵ دادەنرێت"Zoonoses"

## نەخۆشی گەڕیی چی دەگەیەنێت:

لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا بە نەخۆشیەکە دەوترێت گەڕیی، ئەمەش لەوەوە هاتووە کەنیشانەکانی نەخۆشیەکە وا لە ئاژەڵی توشبوو دەکات کە بەشێوەیەکی ناشرین و گەڕ دەرکەوێت لەبەر ئەوەی پێی دەوترێت گەڕی ی واتە ئاژەڵەکە گەڕ بووە.

لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتەرنەری پێی دەگوترێت "Psoroptic Mange"و عەرەب پێی دەڵێن: " جرب"

نەخۆشی گەڕیی لە ڕووی ئابوورییەوە زیان دەگەیەنێت بە گشت وڵاتانی جیهان، چونکە لەزۆربەی وڵاتانی جیهان هەیەو بڵاوە کە بەشێوەیەکی سەرەکی دەبێتە هۆی کەموونەوەی بەرهوومی ئاژەڵ ئەوەش لەڕێگەی زیان گەیاندن بە موو خوری ئاژەڵ و هەروەها پێستی ئاژەڵ بەهاکەی دێتە خوارەوە.

نەخۆشی گەڕیی بەهۆی مشتەخۆرێکی دەرەکییەوە کە زیندەوەرێکی جومگەدارە "Arthropod Parasite" ڕوودەدات کە پێی دەوترێت "Mite" کە لە ئاژەڵی تووشبووەوە لە ئەنجامی پەیوەندی ڕاستەوخۆوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و نیشانەکانیش لە مرۆڤ دەردەکەوێت.

نەخۆشی گەڕیی تووشی زۆربەی جۆرەکانی ئاژەڵ دەبێت لەمەڕو بزن و ڕەشە وڵاخ و وڵاخە بەرزەو ئاژەڵە تەمەن گەورەکان.

هۆکاری نەخۆشیەکە هەندێکجار لەگوێی ئاژەڵەکاندا جێگیر دەبێت و تووشی گەڕیی دەکات لەبەر ئەوە بەمە دەوترێت "Ear Mange".

بەپێی سەرچاوەکان نەخۆشی گەڕیی زیاتر لە ئاوو هەوای ساردو شێداردا خێرا بڵاو دەبێتەوەو تەشەنە دەکات هەروەك لە وەرزەکانی پایزو زستاندا ئەمەش لەبەر ئەوەی لەم وەرزانەدا ئاژەڵەکان دەکرێنە شوێنەکانیانەوە بەژمارەیەکی زۆر کە لە ئەنجامدا زیاتر لەیەکتری نزیك دەبنەوەو پەیوەندی ڕاستەوخۆیان زیاتر دەبێت و مشەخۆرەکان چالاك دەبن و گەشە دەکەن بەئاسانی دەگوێزرێنەوەو نەخۆشییەکە بڵاو دەبێتەوە.

هەندێك هۆكار هەن كە دەبنە ڕێگە خۆشكەرێك بۆ بەخێراكردنی پرۆسەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەكە لەوانەش لاوازیو كەم خۆراكی كەموكوڕی لە بەڕێوەبردنی ئاژەڵەكان لە كێڵگەكاندا وا دەكات كە ئاژەڵەكان هەستیار تر بن بۆ تووشبوون.

## هۆكاری نەخۆشییەكە:

هۆكاری نەخۆشی گەڕیی "Mange" بەشێوەیەكی سەرەكی دەگەڕێتەوە بۆ مشەخۆرێكی دەرەكی كە زیندەوەرێكی جومگەدارە پێی دەوترێت "Mite" بەپێی (د. حەمە ڕەشید قەرەداغی، ٢٠٠٦) بە "Mite" دەوترێت "مۆرانە" و بەپێی "د. عبدالكریم محەمەد علی، ٢٠٠١" پێی دەوترێت "زچ".

ئەمە مشەخۆرە دەرەكییە بەشێوەیەكی سروشتی لەسەر پێستی ئاژەڵو باڵندە ژیان دەباتە سەرو بۆ بەردەوامی ژیانی خوێنو لیمفو شانەكانی پێست،و دەردراوی ڕژێنەكانی پیستیش وەك سەر چاوەی خۆراك بەكاردەهێنێت، مشەخۆرەكە بە قەبارە بچووكەو درێژیەكەی كەمترە لە "١ملم" و چەند جۆرێكی هەیە:

١- Psoroptes Ovis تووشی مەڕ دەبێت.

٢- Psoroptes equi تووشی وڵاخە بەرزە دەبێت.

٣- Psoroptes Cuni Culi تووشی گوێی ئاژەڵەكان دەبێت

٤- Psoroptes natalensis ڕەشە وڵاغ دەبێت.

دورست بوونی نەخۆشی گەڕیی لەوەوە دەست پێدەكات كە مشەخۆرەكە بەگشت بەشەكانی پێستدا هاتووچۆ دەكاتو زیاتر ئەو شوێنانە هەڵدەبژێرێت كە داپۆشراوە بە موو یان خوری، لەدواییدا مشەخۆرەكە هەوڵ دەدات كە پێستەكە كون كون بكات بەمەبەستی مژینی لیمفو لەئەنجامی ئەمەشدا كارلێك ڕوودەدات كە دەبێتە هۆی سووربوونەوەو ئاوسانی شوێنەكە كە ئەمەش دەبێتە هۆی خوارندنی پێستی ئاژەڵی تووشبوو هەروەها هەوكردنی و دەردراوەكانی پێست دەمەیێتو ڕەق دەبێتو قەتماغە دەكاتو كە وەك توێژێكی ڕەق دەردەكەوێت.

## نیشانەكانی:

زۆربەی ئاژەڵـەکان تووشـی نەخۆشـی گـەڕی دەبـن، بـەڵام لەمـەڕدا زیـاتر نیـشانەکان د. دەکەون پێستی مەڕ زیاتر گۆڕانـەکانی بەسـەردا دەردەکـەوێت بەتایبـەتی لـە ئاژەڵـە لاوازەکان کە بەدەست کەم خۆراکییەوە دەناڵێنن.

لەئـەنجامی کـاری تێکدەرانـەی مـشەخۆرەکە شـوێنی تووشـبوو سـور دەبێتـەوەو ددئاوسێتو دەسـت دەکـات بـە خورانـدن لەئەنجامـدا شـوێنەکە قەتماغـە دەکـات وەك توێـژێکی ڕەق دەردەکـەوێت هـەر لەبـەر ئەمەشـە لەمـەڕ بـە نەخۆشـییەکە دەگوترێـت "Sheep scab" لەئـەنجامی ئەمەشـدا خـوری ئاژەڵەکـە لـەو شـوێنەدا هەڵـدەوەرێتو دەکەوێتە سەر زەوی.

بەر بەرە ئەم گۆرانکاریانە لـە پێـستی ئاژەڵەکـەدا بـە بەشـەکانی دیکـەی لەشـدا بـڵاو دەبێتەوەو دوای ٦- ٨ هەفتە سێ بەشی لەشەی ئاژەڵەکـە دەگرێتـەوە تـووش دەبێـتو پێستی چرچو لۆچو ناشیرین دەبێت.

- خورانـدن "Itching"و هـەڵوەرینی خـوری ئاژەڵەکـە بـە نیـشانەیەکی کلینیکـی سەرەکی نەخۆشیەکە دادەنرێت.

- ئاژەڵی تووشبوو رۆژ بەڕۆژ لاواز دەبێتو کەم خوێنی پێوە دیار دەبێتو هەندێکجار بە مرداروەبوونی ئاژەڵەکە کۆتایی دێت.

- هەندێکجار نەخۆشییەکە بە ئاستێکی زۆر کـەم بـڵاو دەبێتـەوە واتـە چـوار چـێوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە سنووردار دەبێت ئەمەش لەنێوان ئـەو ئاژەڵانـەی کـە ئاسـتی خۆراکیان باشەو بەرگریان هەیە لە دژی نەخۆشییەکە.

**لە بزندا:**

لەبزندا زیاتر نەخۆشییەکە تووشی گوێی گوێی دەبێتو نیـشانەکانی لـە گوێیـدا دەردەکـەون لەئـەنجامی ئـەوەی مـشەخۆرەکە لـە گوێیـدا جـێگیر دەبێـتو خـوێنی دەمـژێتو وەك سەرچاوەیەکی خۆراکی بەکار دەهێنێت بەرە بەرە قەتماغە دەکاتو هەندێکجار جۆگەڵەی گوێ دەگیرێت.

### لەولاخە بەرزەدا:

نیشانەکانی نەخۆشییەکە زیاتر لەو ناوچانەی لەشیدا بلاو دەبێتەوە کە بە مووی درێژ داپۆشراوە وەکو کلکی ئاژەڵەکەو هەندێك شوێنی دیکە کەمووی پێوە نییە وەکو گوانی. شوێنەکە دەست دەکات بە خوراندنو هەندێکجار گوێی ئاژەڵەکە دەگرێتەوەو دەبێتە هۆی سەر راوەشاندنی ئاژەڵەکەو هەوڵدەدات سەری بەهۆی شتێکی رەقەوە بخورێنێتو زۆر لاوازی دەکات.

### لە رەشە ولاخدا:

نیشانەکانی لەسەر ملو کلکی ئاژەڵەکەوە دەست پێدەکاتو بەرە بەرە بۆ بەشەکانی دیکەی لەشدا بلاو دەبێتەوە. شوێنی تووشبوو لەسەر پێستی ئاژەڵەکە بە توندی دەست دەکات بە خوراندنو قەتماغەی دروستبوو زۆر بلاو دەبێتەو ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی پێویستی ئاژەڵی تووشبوو ئەستوور ببێتو چرچو لۆچی پێوە دیاربێت.

### لەمرۆڤدا:

بەپێ ی سەرچاوەکان نەخۆشی گەریی لەو نەخۆشیانەیە کە لە ئاژەڵی تووشبوو دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤو نیشانەکانی لەسەر دەستو قۆڵو مەچەكو رانو هەندێك شوێنی دیکە دەردەکەوێتو بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە ئاژەل بەخێو دەکەن بەوەی شوێنەکە سوردەبێتە دەست دەکات بە خوراندنو خوێنی لێ دێت.

### چارەسەرکردنو کۆنترۆڵ کردنی:

بە مەبەستی چارەسەر کردنو کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی گەری پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

یەکەم: لە وەرزی پاییزو زستاندا پێویستە رەچاوی ژمارەی ئاژەڵەکانو رووبەری شوێنەکانیان بکرێت واتە نابێت ژمارەکانیان بەپێی رووبەری شوێنەکە دابنرێت.

دووەم: بایەخ بدرێت بە لایەنی خۆراکی ئاژەڵەکان، چونکە تا ئاستی خۆراکیان باش بێ، لەئەنجامدا ئاستی بەرگرییان لە دژی نەخۆشییەکان زیاتر دەبێت.

سێیەم: شۆردنی ئاژەڵەکان" Dipping" بەپێ ی بەرنامەیەکی زانستی کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ڤێتێرنەرییەوە ساڵانە سەرپەرشتی دەکرێت پێویستە خاوەن ئاژەڵەکان پەیڕەوی بکەن، چونکە دەبێتە هۆی لەناوچوونی مشەخۆرە دەرەکیەکان بەشێوەیەکی گشتیو مشەخۆری نەخۆشیی گەڕی بەشێوەیەکی تایبەتی.

ئەو ماددانە کە زیاتر بەکاردەهێنرێن بۆ شۆردنی ئاژەڵەکان وەکو "Coumaphos " یان "Diazinon".

چوارەم: بەکارهێنانی دەرمانی ئیڤرمکتین "Ivermectin" کەلە ڕێگەی ژێر پێستەوە دەدرێتە ئاژەڵی تووشبوو کە چالاکانە کاردەکات لەدژی مشەخۆرە دەرەکیو ناوەکییەکان.

پێنجەم: لەکاتی گوێی ئاژەڵەکەدە پێویست گوێیان پاك بکرێتەوو بە خاوێنی ڕابگیرێت بە بەکارهێنانی هەندێك دەرمان کە دژی مشەخۆرەکان کار دەکات .

**سەرچاوەکان:**

1- Radostists, O. M, Gay, C . C, Blood, D, and Hincheliffe, K. W. 2000. Verterinary Medicine (A text book of the disease of Cattle, Sheep, Pigs, Goats and Horses ) 9th edition. W. B . Saunders.

٢- فەرهەنگی ئازادی. ئینگلیزی – کوردی. د. حمە ڕەشید قەرەداخی ، چاپی یەکەم– ٢٠٠٦.

٣- نەخۆشییەکانی ئاژەڵ کە تووشی مرۆڤ دەبن، د. عبدالکریم حاجی محەمەد علی، ٢٠٠١.

# نەخۆشی شەلکە

## "Infectious foot Rot"

**پێشەکی:**

سامانی ئاژەڵ لە کوردستان بە کۆڵەکەیەکی سەرەکی ئابووری نیشتیمانی دادەنرێتو بێگومان گەشەکردنو پێشکەوتنی ئەم سامانە گرنگە دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی ئاسایشی خۆراك لە کوردستان چونکە لەم قۆناغەدا هەوڵدان بۆ دابینکردنی ئاسایشی خۆراك بە پێویستیەکی مێژوویی دادەنرێت. زۆر دەردو نەخۆشی هەیە کە دەبنە هۆی پەکسختنی گەشەکردنی سامانی ئاژەڵ، لەوانەش نەخۆشی شەلکەیە کە تووشی مەڕو ماڵات دەبێتو لەڕووی ئابورییەوە دەبێتە هۆی لەدەستدانی ژمارەیەکی زۆر لە ئاژەڵ بەوەی کە کێشیان کەم دەکاتو هەروەها بەرهەمی شیرو خوریشیان دێتە خوارەوە.

**نەخۆشی شەلکە "foot Rot"**

لە کوردەواریدا بەتایبەتی لەنێو خاوەن ئاژەڵدا بە نەخۆشی "شەلکە" ناسراوەو عەرەب پێی دەڵێن " تعفن الاظلاف"و لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری پێی دەوترێت "Infectious foot Rot".

بەپێی سەرچاوەکان نەخۆشی شەلکە یەکێکە لە کۆنترین ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی مەڕو بزن دەبنو هەر لەمێژەوە پسپۆڕان هەستاون بەئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لە وڵاتەکانی جیهان:

- لە فەرەنسا لە ساڵی ١٧٩١ لەلایەنە زانا "Chabert".
- لە ئیتاڵیا ساڵی 1808.
- لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨١٥.
- لە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٣٧ لە لایەن زانا "Youatt".

- له ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له سالّی ١٩٠٤ له‌لایه‌ن زانایان" Mohlerand, Washburn" نه‌خۆشی شه‌لّکه تووشی مه‌ڕو بزن مانگا ده‌بێت‌و هه‌روه‌ها له ئاسکدا ده‌رده‌که‌وێت له گشت ولاّتانی جیهاندا بلاّوه به‌تایبه‌تی ئه‌و ولاّتانه‌ی که ژماره‌یه‌کی زۆر له‌مه‌ڕو بزن به‌خێو ده‌که‌ن وه‌کو ئوسترالیا، نیوزلندا، ئه‌مریکا، به‌ریتانیا هندستان‌و هه‌روه ها له کوردستانیش که ژماره‌یه‌کی زۆر له‌مه‌ڕو بزنی تێدا به‌خێو ده‌کرێت‌و سالاّنه هه‌ندێکیان تووشی نه خۆشی شه‌لکه‌ده‌که‌ن، نه‌خۆشی شه‌لکه له‌و وه‌رزانه‌دا زیاتر ته‌شه‌نه ده‌کات که ڕاده‌ی شێ تیایدا به‌رزده‌بێته له‌گه‌لّ پله‌ی گه‌رمی گونجاودا هه‌روه‌ك له وه‌رزی پاییزو به‌هاردا زیاتر نه‌خۆشییه‌که ده‌رده‌که‌وێت له‌نێو مه‌ڕو مالاّتدا، هه‌روه‌ها له وه‌رزی زستاندا نه‌خۆشی شه‌لکه له‌نێو ئه‌و ئاژه‌لاّنه‌دا ده‌رده‌که‌وێت که له گه‌وره‌کاندا ده‌مێننه‌وه، به‌به‌رده‌وامی‌و هه‌ندێکجار له وه‌رزی هاویندا سه‌ر هه‌لّده‌دات، نه‌خۆشی شه‌لکه له‌و ژینگانه‌دا زیاتر هه‌یه که ئاوی وه‌ستاویان زۆره له شیوو دۆلّه‌کانداو هه‌روه‌ها له ناوچه‌ی به‌رداوی ی کێوه‌کاندا ته‌شه‌نه ده‌کات.

سه‌رچاوه‌ی هۆکاری نه‌خۆشی شه‌لکه به‌شێوه‌یه‌کی سه‌ره‌کی ئاژه‌لّی تووشبووه که هه‌روه‌ك "Reservior" کار ده‌کات له ئه‌نجامدا نه‌خۆشییه‌ك له ناوچه‌یه‌که‌وه ده‌گوێزرێته‌وه بۆ ناوچه‌یه‌کی دیکه، به‌شێوه‌یه‌کی سه‌ره‌کی دوو شێوه له نه‌خۆشی شه‌لکه هه‌یه:

یه‌که‌م: نه‌خۆشی شه‌لّکه‌ی ساده "Benign foot Rot".

دووه‌م: نه‌خۆشی شه‌لکه توندو تیژ Virulent fo Rot ، مه‌ڕو بزن له زۆربه‌ی ته‌مه‌نه‌کاندا تووشی نه‌خۆشییه‌که ده‌بن، به‌لاّم مه‌ڕو بزنی به ته‌مه‌ن زیاتر هه‌ستیارتره بۆ نه‌خۆشی شه‌لکه له‌وانی دیکه.

**گواستنه‌وه‌ی نه‌خۆشی شه‌لکه له‌ناوچه‌یه‌که‌وه بۆ ناوچه‌یه‌کی دیکه ده‌بێت:**

١- به‌هۆی ئاژه‌لّی هه‌لّگری هۆکاری نه‌خۆشییه‌که ( Carrier animals).

٢- بەهۆی ئەو کەل و پەل و هۆکاری گواستنەوە بەکاردەهێنرێت لەکاری کێڵگەکاندا وەکو مرۆڤو ئۆتۆمبێل...هت.

٣- ئاوی وەستاوو ناوچەی بەرداوی ڕێگە خۆشکەرن بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی شەلکە.

## ئەو هۆکارانەی کە ڕێگە خۆشکەرن لەبەردەم بڵاوبوونەوەی نەخۆشی شەلکە:

یەکەم: ئاوو هەوای ژینگە کاریگەری گرنگی هەیە لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە بەوەی لە ئاوو هەوای شێ دارو گەرمی گونجاو دا لەوەڕگاکاندا هۆکاری نەخۆشییە کە گەشە دەکەن و ژمارەیان زیاد دەکات بەتایبەتی لە وەرزی پاییزو بەهاردا کە باران دەبارێت ولەوەڕگاکان بە شێ داری دەمێننەوە لەگەڵ بوونی تیشکی خۆر کە ژینگەیەکی لەبار پێك دەهێنێت بۆ تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە.

دووەم: لە وەرزەکانی پاییزو بەهاردا زیاتر نەخۆشی شەلکە پەردەسێنێت لەنێو مەڕو ماڵاتدا چونکە لەم وەرزەدا گەرمیو شێ دوو فاکتەری پێویستن بۆ گەشەکردنی هۆکاری نەخۆشییەکە.

سێیەم: بەخێو کردنی ژمارەیەکی زۆر لە مەڕو ماڵات لە شوێنێکی بچووكو تەسکدا هۆکارێکی گونجاوە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە کە ئەمەش بێگومان زیاتر لە وەرزی زستاندا دەبێت بەوەی کە خاوەن ئاژەڵەکان لەترسی سەرماو سۆڵە ئاژەڵەکانیان کۆدەکەنەوەو دەیکەنە گەوڕەکانیانەوە.

چوارەم: بوونی ئاوی وەستاو لە دۆڵو شێوەکانداو مانەوەی ئاژەڵەکان بۆ ماوەیەکی درێژ لەنێو ئەو ئاوانەدا هۆکارێکی ڕێگە خۆشکەرەو هەروەها بوونی ناوچەی بەرداوی لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەبێتە هۆی بریندار بوونی پێستی نێوان سمەکانیان.

## هۆکاری نەخۆشی شەلکەو چۆنیەتی دروست بوونی نەخۆشییەکە:

هۆکاری سەرەکی نەخۆشی شەلکە دەگەڕێتەوە بۆ دوو بەکتریا کە بە یارمەتیدەری

یەکترن بۆ دروست بوونی نەخۆشییەکە:

1- Dichelobacter nodosus.
2. Fusobacterium necrophorum.

ئەم دوو جۆرە لە کۆمەڵی Gram negative پێویستیان بە گازی ئۆکسجین نییە بۆ گەشە کردنیان کە پێیان دەوترێت ( Anaerobic bacteria) لەبەر ئەوە چالاك دەبێت لە ژینگەیەکی بێ ئۆکسجینی دا لەکاتی بوونی برینێك لە پێستی نێوان دوو سمەکانیداو مانەوەیان بۆ ماوەیەك لەناو ئاوی وەستاوەدا، لەم کاتەدا بەکتریاکان هێرش دەکەنە سەر ئەو برینەی لە قاچی ئاژەڵەکەدا هەیەو لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی هەوکردنی جێگەیی: Local dermatitis کە ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی شەلینی ئاژەڵی تووشبوو.

**نیشانەکانی: Clinical signs**

لە نیشانە دیارو سەرکییەکانی نەخۆشی شەلکە لەمەڕو ماڵاتدا کە بەشێوەیەکی کتو پڕ تیایاندا دەردەکەوێت کە ئەویش شەلینی ئاژەڵەکانە( Lameness) هەر لەبەر ئەمەشە لە کوردەواریدا پێی دەوترێت نەخۆشی شەلکەو خاوەن ئاژەڵەکان بەشێوەیەکی گشتی شارەزاییەکی باشییان پەیدا کردووە لە دەست نیشان کردنی نەخۆشییەکە.

- پەلی تووشبوو ئازارێکی توندی پێوە دیارەو ئاژەڵەکە زۆر جار بەرزی دەکاتەوە لەسەر زەوی.
- ڕادەی بەرهەمی شیرو خوری دێتە خوارەوە.
- هەندێکجار هەردوو قاچی یان هەردوو دەستی ئاژەڵەکە تووش دەبێتو ئازار ی پێوە دیار دەبێت لە ئەنجامدا ئاژەڵەکە لەسەر ئەژنۆ دەڕوات.
- پێستی قاچی ئاژەڵی تووش بوو سور دەبێتەوەو دەئاوسێتو هەو دەکات.
- لەکاتی بەردەوامبوونی نەخۆشییەکە قاچی ئاژەڵی تووشبوو بۆنێکی ناخۆشی لێ دێت (Foul- Smelling ).

– لەکاتی شێوەی توندی نەخۆشیەکە(Vriulent form) ئاژەڵی تووشبوو لە لەوەڕ دەکەوێتو تای لێ دێتو بەلایەکدا دەکەوێت لەڕو لاواز دەبێتو لە کۆتاییدا مردار دەبێتەوە.

## نەخۆشی شەلکە لە مانگادا:

لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری بە نەخۆشی شەلکە لە مانگا دەوترێت ( Foul in the foot) واتە (پەیدابوونی بۆنێکی ناخۆش لە قاچدا) کە ئەمەش لەئەنجامی تووشبوونی بە بەکتریای نەخۆشییەکە.

لەزۆربەی ولاتانی جیهان دا بڵاوەو نیشانەکانی نەخۆشی شەلکە لەمانگادا زۆر لەنیشانەکانی نەخۆشی شەلکە دەچێت لە مەڕو بزندا. نەخۆشی شەلکە لە مانگا زیاتر لە مانگای شیردا دەردەکەوێت، لەبەر ئەوە یەکێك لە نیشانەکانی بریتیە لە کەمبوونەوەی بەرهەمی شیر لە و مانگایانەدا، ڕادەی ڕودانو سەرهەڵدانی نەخۆشی شەڵکە لەمانگادا دەگۆڕێت بەپێ ی شوێنو ئاوو هەواو لەوەڕ.

## دیاریکردنی نەخۆشی شەلکە:

دیاریکردنی نەخۆشی شەلکە ئەنجام دەدرێت بەهۆی:

١– مێژووی سەرهەڵدانی نەخۆشییەکە (case history) ئەم زانیاریانە دەگەڕێتەوە لەسەر کاتی بلاوبوونەوەی نەخۆشییەکەو شوێنی بەخێوکردنی ئاژەڵەکانو ڕێژەی تووشبوونو ڕێژەی مرداربوونەوە کە لەلایەن خاوەن ئاژەڵەکانەوە دەدرێتە پزیشکی پسپۆر.

٢– نیشانە دیارەکانی نەخۆشی شەلکە.

کە بەهۆی نیشانە سەرەکیو دیارەکانەوە لە نەخۆشییەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە کە نیشانەکانیان لە نەخۆشی شەلکە دەچن.

٣- بەهۆی پشکینکی تاقیگەییەوە بە مەبەستی جیاکردنەوەو دەستنیشانکردنی بەکتریای نەخۆشیی شەلکە.

**چارەسەرکردن:**

خۆپاراستن باشترین ڕێگە چارەیە بۆ ڕێگەگرتن لە بەردەم سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەی نەخۆشی شەلکە لەنێو مەڕو ماڵاتدا، لەبەر ئەوە پێویستە لەوەرزی باران بارینداا ئاژەڵکان دوور بخرێنەوە لەوەستان بۆ ماوەیەکی درێژ لەناو ئاوی وەستاودا لەشێو دۆڵەکانداو هەروەها کەم کردنەوەی ژمارەی ئاژەڵەکان لە گەورەکاندا لەوەرزی زستاندا واتە وا باشترە کە مژارەی ئاژەڵ بەپێ ی ڕووبەری شوێنەکە دابنرێت.

لەکاتی بڵاو بوونەوەی نەخۆشییەکە پێوست دەکات ئاژەڵە تووشبووەکان بەشەلکە جیابکرێنەوە بهێلرێنەوەو چارەسەر بکرێن بە بەکارهێنانی دژە ژیانەکانی وەکو پەنسلینو ستریپتۆماسینو هەروەها پاککردنەوەی سمەکایان بە دەرمانی ئایۆدینو پاک ڕاگرتنی بە بەردەوامی.

**سەرچاوەکان:**


1- Radostists, O, M, Gay, C . C, Blood, D, and Hincheliffe, K. W. 2000. Verterinary Medicine (A text book of the disease of Cattle, Sheep, Pigs, Goats and Horses ) 9th edition.

2- The Merck verterinary Manuual 8th edition. 1998.

# دەرمانی هاوبەش لەنێوان ئاژەڵ و مرۆڤدا

# یان پاشماوەی دەرمان

# Drug Residues

لەزانستی پزیشکی ڤێترینەری ئاماژە بە لقێکی گرنگ کراوە، کەئەویش نەخۆشیە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ ئاژەڵە، یان پێیان دەوترێت دەردە مرۆژەڵیەکان (Zoonoses) کەبەو کۆمەڵە دەردو نەخۆشیانە دەوترێت کە لە ئاژەڵە ماڵی و کێویەکانەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەو خۆ دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لە ڕێگەی میکرۆبە جۆر بەجۆرەکانەوە.

لە لایەکی دیکەوە سەرەڕای نەخۆشییە هاوبەشەکان، دەرمانە هاوبەشەکانیش هەن کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مەترسیان بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ ڕوو لەزیادبوونە بەشێوەیەك کە مرۆڤ هەستیان پێ ناکات. وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان زۆر گرنگی بەم لایەنە دەدەن و لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی بە بەردەوامی بە ئەنجام دەگەیەنن، بۆ نموونە لە وڵاتێکی وەکو ئەڵمانیاو لە شاری شتوتگارت فەرمانگەیەك هەیە بەناوی ( Chemicals and Veterinary Diagnositic Labratories) (CVUAS).

کە لە کۆمەڵێك تاقیگەی جۆراو جۆر پێکهاتووە لە بوارەکانی پزیشکی ڤێترینەرو پشکنینی کیمیایی ولە پشکنینانەی کە بە بەردەوامی ئەنجام دەدرێت لەو تاقیگانەدا پشکنین پاشماوەی ئەو دەرمانانەیە لە شانەو خانەکانی لەشی ئاژەڵ دا، بە مەبەستی بەدواداچوونێکی زانستیانەی ئەو دەرمانانەی کە بەکار دەهێنرێت لە چارەسەر کردنی ئاژەڵ و پەلەوەر لەو وڵاتەدا.

لەبەر ئەوە لە کوردستانیشدا کاتی ئەوە هاتووە کە بیربکرێتەوە لە پشکنینی بەرووبوومی ئاژەڵ لە گۆشت و شیرەمەنی بە مەبەستی زانینی ڕادەی پاشماوەی ئەو دەرمانانەی کە لەچارەسەرکردنی نەخۆشی یەکانیاندا بەکارهاتوون و بەهیوام ئەم بابەتە

بنێته هاندەرێك بۆ دامەزراندنی تاقیگەیەكی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە.

## دەرمانە هاوبەشەكان چی دەگەیەنن:

دەرمانە هاوبەشەكان ئەو دەرمانانە دەگرێتەوە كە لە بواری پزیشكی ڤێتریندەری دا بەكار دەهێنرێن بەمەبەستی چارەسەركردنو كۆنترۆڵكردنی نەخۆشییە جۆراو جۆرەكانی ئاژەڵو باڵندەو لەئەنجامدا گواستنەوەی بڕێك لە پاشماوەی ئەو دەرمانانە بۆ خانەو شانەكانی لەشی مرۆڤ لە ڕێگەی بەكارهێنانی بەروبوومی ئاژەڵو باڵندە وەكو گۆشتو هێلكەو شیرەمەنی لەلایەن مرۆڤەوە كە بێگومان مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت دەست بەرداری ئەم خواردنانە بێت چونكە بەسەرچاوەیەكی گرنگی پرۆتین دادەنرێن، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بڕی پاشماوەی دەرمانەكان زیاد دەكاتو كۆدەبێتەوە لە خانەو شانەكانی لەشی مرۆڤو كاریگەری نێگەتیڤانەی دەبێت بۆ سەر ئەندامەكانی لەشی مرۆڤ كە هیچی كەمتر نیە لە كاریگەری نەخۆشی یە هاوبەشەكان.

لە كوردستاندا بەتایبەتی دوای ڕاپەڕینە مێژووییەكەی گەلەكەمانو دامەزراندنی حكومەتی هەرێمی كوردستان كە بێگومان بووە هۆی بوژاندنەوەی كوردستانو كۆمەڵگای كوردەواری لە گشت ڕوویەكەوە بەتایبەتی ئاوەدانكردنەوەی گوندەكان بووە هۆی بوژاندنەوەی سامانی ئاژەڵ بە شێوەیەكی دیارو لەبەر چاو ئەویش بەزیادبوونی ژمارەی ئاژەڵەكان لە مانگاو مەڕو بزنو هەروەها زیاد بوونی ژمارەی كێڵگەكانی بەخێو كردنی پەلەوەر كە ئەمەش بێگومان بووە هۆی بەرهەم هێنانی بڕێكی باش لە گۆشتی سورو سپیو هێلكەو شیرەمەنی كە پێداویستی خەڵكی كوردستانی تا ڕادەیەكی باش پركردۆتەوە، بەڵام لەهەمان كاتدا بەكارهێنانی دەرمان بەگشت جۆرەكانیەوە زیادی كردووە بە شێوەیەكی بەربڵاوو بێ سنوور كە زۆر جار لایەنە زانستی یەكە لە بەرچاو ناگیرێتو تەنها لایەنە ئابووریەكە لە بەر چاو دەگیرێت كە ئەمەش كارێكی خراپ دەكاتە سەر تەندروستی مرۆڤ بەوەی كە مرۆڤ بەبێ ئەوەی هەستی پێ بكات ڕۆژانە بڕێك لە

پاشماوەی ئەو ئەو دەرمانانە (Drug Residues) لە ڕێگەی خواردنی گۆشت و هێلکەو بەرووبوومی شیرەوە دەچێتە لەشییەوەو لە شانەو خانەکانی لەشیدا کەڵەکە دەبێت و کار دەکاتە سەر فسیۆلۆژی کۆئەندامی لەشی.

## دژە زیندەکان Antibiotics

دژەزیندەکان ئەو کۆمەڵە دەرمانانەن کە لەبواری پزیشکی ڤێترینەری دا بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکار دەهێنرێت لە چارەسەرکردنی نەخۆشیی یەکانی ئاژەڵ و باڵندەو مرۆڤیش لەڕێگەی بەکارهێنانی بەرووبوومی ئاژەڵ و باڵندەو بڕێکی باش لە پاشماوەی دژە زیندەکان ڕۆژانە ڕۆژ لە شانەکانی لەشیدا کۆدەبێتەوە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی میکرۆبە سوود بەخشەکان و زیانبەخشەکان و سەرهەڵدانی نەخۆشی نوێ و هەروەها دەبێتە هۆی زیادبوونی و دروستبوونی بەرگری ( Resistance)ی مێکرۆبەکان بۆ دژە زیندە جۆربەجۆرەکان کە ئەمەش وا دەکات مرۆڤ زیاتر بناڵێنێت بە دەست نەخۆشی یە درمییە جۆراو جۆرەکانەوە بەوەی کە ماوەی چارەسەر کردن درێژ دەبێتەوەو نەخۆش زۆر ماندوو دەبێت لەڕووی تەندروستی و ئابوورییەوە.

لەساڵی ١٩٩٣ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لێکۆڵینەوەیەک ئەنجامدرا بە مەبەستی دیاریکردنی بڕی پاشماوەی دژە زیندەکان لە گۆشتی ئاژەڵە سەربڕاوەکانی ئەو وڵاتەداو ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەش بەم شێوەیە بوو:

| ڕێژەی پاشماوەی دەرمانی | دژە زیندەكان |
|---|---|
| ٪٢٠ | ١- پەنسلین |
| ٪١٠ | ٢- ستربتۆمایسین |
| ٪١٠ | ٣- ئۆكسی تتراسایكلین |
| ٪٩ | ٤- سەلفامیتازین |
| ٪٤ | ٥- تێتراسایكلین |
| ٪٤ | ٦- جێنتەماسین |
| ٪٣ | نیومایسین |

پشكنینی دژە زیندەكان لە تاقیگەدا بۆ دیاریكردنی بڕی پاشماوەی دەرمانەكە بەهۆی (Antibiotic Residue test)و دەێتو بەهۆی دانانی پارچەیەكی بچووك لە ماسولكەو گورچیلەی ئاژەڵەكە لەناوەندی چاندنی كە سپۆری بەكتریای Bacilus subtilis تێدایە.

## كلۆرامفینكۆل: Chloramphenicol

لەم سەردەمەدا زۆربەی وڵاتە پێشكەوتووەكانی جیهانو بەتایبەتی لە وڵاتە پێشكەوتوەكانی جیهانو بەتایبەتی لە وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا دەرمانی كلۆرامفینتۆڵ قە دەغە كراوەو بەمەبەستی چارەسەركردن بەكارناهێنرێت، لەكاتی خواردنی گۆشتی ئاژەڵی چارەسەركراو بە كلۆرامفینیكوڵ لەلایەن مرۆڤەو ئەم دەرمانە ڕۆژانە دوا ی ڕۆژ لە شانەكانی لەشدا كۆدەبێتەوەو دەبێتە هۆی جۆرێك لە كەمو خوێنی كە پیێ ی دەوترێن (Stic Aplasic) چونكە كار دەكاتە سەر مۆخی ئێسقان كە بە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی خانەكانی خوێن دادەنرێتو بەشێوەیەكی گشتیو لەئەنجامدان دەبێتە هۆی كەم بوونەوەی ژمارەكانی خانەكانی خوێن (PanCytopenia) بەمەش لەشەی مرۆڤەكە هیچ جۆرە بەرگرییەكی نامینێتو زۆر بەئاسانی تووشی جۆرەها

نەخۆشی ترسناك دەبێت، واتە كلۆرامفینكۆل . دەبێتە هۆی رێگە خۆشكەركێك بۆ سەرهەڵدانی نەخۆشی لەئەنجامی نەمانی بەرگری سروشتی لە لەشی مرۆڤەكە.

## ئەیڤرمكتین Invermetin

ئایڤرمكتین جۆرێكە لەدژە زیندەكان و لەپزیشكی ڤێتیرنەریدا بەكاردەهێنرێت بۆ چاسەرەكردنی ئەو نەخۆشیانەی كە لە رێگەی مشەخۆرە دەرەكییو ناوەكی یەكانەوە پەیدا دەبن.

میكانیزمی كاركردنی ئایڤرمكتین بریتە لە هاندانی گوێزەروەیەكی دەماری كە پێی دەوترێت : (GABA)

Gamma Amino Butyric Acid

لەكاتی بەكارهێنانی ئایڤرمكتین لەژەهڵدا پێویستە بۆ ماوەیی (٢٨) رۆژ شیرو گۆشتی ئاژەڵی چارەسەركراو لە لایەن مرۆڤەوە بەكارنەهێنێت چونكە لەم ماوەیەدا برێك لە ئایڤرمكتن لەرێگەی بەربوومی ئاژەڵەوە(شیرو گۆشتەوە) دەگوێزێتەوە بۆ مرۆڤو كاردەكاتە سەر فسیۆلۆژی كۆئەندامی دەماری مرۆڤ.

## هۆرمۆنەكان ( HORMONES ):

هۆرمۆنەكان بەشێوەیەكی گشتی لە بواری پزیشكی ڤێترینەری دا بەكاردەهێنرێت بۆ چارەسەركردنی نەخۆشییەكانی كۆئەندامی زاوزیو هەروەها بە مەبەستی قەڵەو كردنی ئاژەڵ. لەكاتی بەكارهێنانی گۆشتی ئاژەڵی چارەسەركراو بە هۆرمۆنەكان لەلایەن مرۆڤەوە دەبێتە هۆی گەشەكردنێكی خێراو ناسروشتیانە، هەروەها لێكۆڵینەوە زانستیەكان لە جیهاندا سەلماندوویانە كە ئەو كەسانەی رێژەی هۆرمۆنەكان لە لەشیاندا زیادی كردووە زیاتر بۆیان هەیە تووشی نەخۆشی یەكانی شێرپەنجە ببن.

**سەرچاوەكان:**


1- Adame, H. R. 1995 Veterinary Pharma Cology znd thera peutics.
2- AHRENS, F. A, 1996. Pharmoaclogy.

٣- پزیشكی ڤێرتینەری.د. فەریدون عبدالستار، بەرگی یەكەم ٢٠٠٤.

# نەخۆشی سەگەناز

## (Canine Distemper)

سەگە هەر وەك ئاژەڵێکی ماڵی بەهاوڕێییەکی بەوەفای مرۆڤ دادەنرێتو بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤ لە زۆر ڕووەوە سوودی لێ وەرگرتووە لەبەر ئەوە سەگ ڕاگرتن یان سەگ بەخێوکردن لە کوردستاندا ساڵ بەساڵ ڕوو لە زیادبوونە لەلایەن ئەو هاوڵاتیانەی کە ئارەزووی سەگ بەخێو کردنیان هەیە کە بەشێوەیەك مەسرەفێکی باشیان دەکەن بەوەی کە سەردانی کلینیکە ڤێتێرنەری یەکان دەکەن بەمەبەستی چاودێریو کوتانیان لەدژی نەخۆشییە جۆرە بەجۆرەکان کە تووشی سەگ دەبن.

سەرەڕای ئەوەی کە سەگ بە دڵسۆزی هاوڕێیەتی مرۆڤ دەکاتو مەڕو ماڵاتی دەپارێزێتو پاسەوانی شوێنەکانیان دەکات، بەڵام لەم سەردەمەدا بەکارهێنانەکانی سەگ لەلایەن مرۆڤە لە فراوانبووندایە بەوەی کە سەگە بەکار دەهێنرێت بۆ هۆکارێکی گرنگ بۆ دۆزینەوەی ماددەی بێ هۆشکەرەکان کە زیان دەگەیەنێت بە تەندروستی مرۆڤو هەروەها دۆزینەوەی تاوانباران لەکاتی ڕوودانی تاواند، ئەمەش بە پێی سەرچاوەکان دەگەڕێتەوە بۆ زۆری ژمارەی دەمارەکانی بۆن" Olifactory nerves" ئەمەش بێ گومان دەبێتە هۆی بوونی بەهێزی هەستی بۆن کردن لە سەگدا بە بەراورد لەگەڵ مرۆڤو ئاژەڵەکانی دیکەدا.

یەکێك لەو نەخۆشییە کوشندانەی کە زەرە دەگەیەنێت بە تەندروستی سەگ، نەخۆشی "سەگ نازە" لەبەر ئەوە بڵاوکردنەوەیە زانیاری دەربارەی ئەم ئەم نەخۆشییە بەکارێکی پێویست دادەنرێت.

سەگە ناز چی دگەیەنێنت: لەنێو کۆمەڵگای کوردەواری بەم نەخۆشییە دەوترێت سەگە نازیان "تاعونیسەگ" لەسەر چاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری پێی دەگوترێت ( Canine Distemper).

سەگە ناز نەخۆشییەکی ڤایرۆسی کوشندەیە توندو تیژەی کە دەبێتە هۆی کە کردنەوەی ئاستی بەرگری لەشی سەگی تووشبوو، بەپێی سەرچاوەکانی دەزگای ڤێتێرنەرییەکان لە کوردستانیشدا نەخۆشی سەگەناز هەیەو بلاوە.

لە نێوەی یەکەمی سەدەمی بیستەمەوە نەخۆشی سەگ ناز بەیەکێك لە نەخۆشیە کوشندەکانی سەگ دادەنرێتو زەرەو زیانێکی گەورەی گەیاندووەو بەپێ ی توێژینەوەکان دەرکەوتووە کە ئەم سالانەی دواییدا لە لە زۆربەی ولاتانی جیهان نەخۆشییە ڕوو لەزیادبووندا.

نەخۆشی سەگەناز نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە زۆربەی ئاژەڵە گۆشت خۆرەکان"Carnivores".

هەستیارن بە تووشبوون بە نەخۆشیەکە کە سەر بەخێزانی "Canidae" لەو ئاژەلانەش وەکو (سەگو گورگو ڕێوی و کەمتیار، هەروەها لەم سالانەی دواییدا دەرکەوتووەلە کالیفۆرنیا سالّی ١٩٩٢،و لە تەنزانیا سالّی ١٩٩٤ شێر و پڵنگ زۆر هەستیارن بۆ ڤایرۆسی نەخۆشی سەگە ناز: ڤایرۆسی نەخۆشی سەگە ناز تووشی سەگ دەبێت، لەهەموو تەمەنەکاندا، بەلام توتکە سەگ Puppises واتە سەگی تەمەن بچووك زۆر هەستارترن لە سەگی تەمەن گەورە ڤایرۆسی نەخۆشییەکە لەگشت دەردراوەکانی سەگی تووشبووەوە دەردرێتەوە دەرەوەی لەش و دەبێتە سەرچاوەی بلاوبوونەوەی نەخۆشییەکەو گواستنەوەی بۆ سەگێکی ساغ دەر دەدرێتە.

## هۆکاری نەخۆشییەکەو چۆنیەتی دروستبوونی نەخۆشی یەکە :

هۆکاری سەرەکی نەخۆشی سەگە ناز دەگەرێتەوە بۆ ڤایرۆسێك کە پێی دەوترێت "Morbilli Virus" کە سەر بەخێزانی Paramyxo Viridae و سەر بە کۆمەڵەی " RNA".

*ڤایرۆسەکە لە دەرەوەی لەش زۆر ناجێگیرەو زۆر بەخێرایی لە چالاکی دەکەوێت.

*ڤایرۆسەکە بەرگەی توێنەرەوە چەورییەکان ناگرێتو ناچالاك دەبێت.

*ڤایرۆسەکە بەهۆی کۆئەندامی هەناسەدانەوە لە سەگێکی نەخۆشەوە دەگوازرێتەوە بۆ یەدێکی ساغ، واتە بەهۆی هەواوە کەهەڵگری ڤایرۆسەکە بێت لەرێگەی هەناسەدانو هەناسە وەرگرتنەوە دەچێتە لەشی سەگەوەو تووش دەبێت، بەرە بەرە ڤایرۆسەکە دەکاتە گرێ لیمفاوییەکان لە لەشەداو زۆر بەخێرایی، بەئەندامەکانی لەشدا بڵاو دەبێتەوە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خانەکانی لمیفۆسایت"Lymphocyte" کە ئەمەش خانەیەکی تایبەتە بە بەرگریکردن لەلەشو لەئەنجامدا دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئاستی بەرگری لەش کەئەمەش بێگومان بە یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکی یەکانی نەخۆشی سەگە ناز دادەنرێت.

دوای شەش ڕۆژ لەتووشبوون لە ڤایرۆسی نەخۆشی سەگەناز دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشی سەگی تووشبوو، ئەمەش کاتێك ڕوودەدات کە ڤایرۆسەکە لە خوێنی دابێت.

دوای دوو هەفتە بۆ سێ هەفتە لە تووشبوونو لە ئەنجامی کەمبوونەوەی ئاستی بەرگری لەش کە دەبێتە ڕێگە خۆشکەرێك بۆ سەرهەڵدانو تووشبوون بە گەلێك نەخۆشی ترسناکی دیکە، سەگی تووشبوو تەندروستی بەرەو قۆناغێکی خراپتر دەچێت.

خانەی لیمفۆسایتو مایکرۆڤەیجی تووشبوو هەڵدەستن بە گواستنەوەی هەرسو هەناسەدانو میزو زاوزێ و ناوەندە کۆئەندامی دەمار، لەکاتی شێوەی توندی نەخۆشییەکە ڤایرۆسەکە تووشی ناوەندی کۆئەندامی دەمار دەبێتو لەئەنجامدا دەبێتە هۆی تێکشاندنی ژمارەیەکی زۆر لە دەمارەخانەکانو بەرە بەرە بەرەو لەناوچوون دەچێت.

## نیشانە دیارەکان:

نیشانەکانی نەخۆشی سەگەناز لەڕووی توندو تیژیو ماوەی دەرکەوتنی نەخۆشییەکە جیاوازی هەیە لە سەگێکەوە بۆ سەگێکی دیکە.

ڕادەی لەناوچوون بەنەخۆشی سەگەناز دەگاتە ٥٠٪ هەندێك لە نیشانەکان هەندێجار بە چاو نابینرێنو تێبینیان ناکرێت.

– لە سەرەتادا نەخۆشیەکە بەوە دەست پێدەکات کە پلەی گەرمی لەشی سەگی تووشبوو بەرزدەبێتەوە لەگەڵ ئەوەی چاوو لووتی نەخۆشەکە سور دەبێتەوەو ئاو دەکات.

– سەگی تووشبوو زۆر بێ هێزو لاواز دەبێتو ئارەزووی خواردنی نامێنێت.

– سەرهەڵدانی نەخۆشی لاوەکی دیکە واتە تووشبوون بە هەندێك بەکتریای لاوەکی کە پێ ی دەوترێت، "Secondary bacterial infection"

ئەمەش ڕوودەدات لەئەنجامی کەمبوونەوەی ژمارەی خانەکانی لیمفۆسایت "Lymphospenia" کە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی بەرگری لەش نەخۆشەکەو دەرکەوتنی نەخۆشیەکانی دیکەی ئەمە لە ئەنجامی زۆربوونو گەشەکردنی ئەو بەکتریایانەی کە بە شێوەیەکی سروشتی لە لەشدا دەژینو بەمەش نیشانەکانی سەر کۆئەندامی هەرسو هەناسەدان دەردەکەوێت.

– شێوەی توندی نەخۆشییەکە ئەو شێوەیەیە کە ڤایرۆسی نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی تووشبوونو تێکشکاندنی دەمارەکانی ناوەندە کۆئەندامی دەمارو ئەم نیشانانەش دەردەکەوێت:

– نا هاوسەنگی یەك لە جووڵەیدا دەکرێت.

– زیاتر سەگەکە دەکەوێتە سەر زەوی.

– ڕەقبوونی ناوچەی ملی نەخۆشەکە.

– هەندێ جار سەگی تووشبوو کوێر دەبێت.

- ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەوە خراپبوون دەچێتو لە ئەنجامدا مردار دەبیچتەوە.

## چارەسەرو کۆنترۆڵ:

هەتاکو ئێستا هیچ چارەسەرێکی گونجاوی بۆ نەدۆزراوەتەوە واتە هیچ دەمارنێکی تایبەتی نییە دژی ڤایرۆسەکە کار بکات.

- بەکارهێنانی دژە ژیانەکان "Antibiotic" ئەمەش بۆ چارەسەر کردن نەخۆشی یە لاوەکیەکان کە بە هۆی بەکتریاکانەوە ڕوو دەدەن.
- بەکارهێنانی شلەمەنی لەکاتی سکچووندا.
- بەکارهێنانی هەندێك دەرمان وەکو خاو کەرەوەی ماسولکەکان
- بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی سەگەناز پێویستە سەگەکان لە تەمەنی (٣) مانگ بەرەو ژوور بە ڤاکسینی نەخۆشییەکە بکوترێن ئەمەش دەبێتە هۆی پاراستنیان لەم نەخۆشییە ترسناکە.

**سەرچاوە:**

1- Appel, M.J.G and summer Distemper: Ourttan status inststitute of Animal Health, College of vertinary Modicine, Comell Yniversity.

2- Aiello, S, E. 1998. The Merk Veterinary manual. 8th edition Merck.co I.N.C Whate house station.

# گیربوونی پزدان

## Retained Placenta

لقی نەخۆشییەکانی زاوزێو زایـین: Theriogenology بـە یـەکێك لـە لقـە گرنگـەکانی زانستی پزیشکی ڤیتێرنەری دادەنرێت، بەوەی کە بایـەخ بـەو دەردو نەخۆشـییانە دەدات کە تووشی کۆئەندامی زاوزێ دەبێت لە قۆناغە جیاجیاکانـدا وەکـو قۆنـاغی هاتنـە کـەڵو قۆناغی زایینو قۆناغی ئاووس بوونو لەئەنجامدا پـەکی دەخـاتو نیگەتیڤانـە کاردەکاتـە سەر پرۆسەی زۆربوون.

گیربوونی یزدان یەکێکە لەو کێشایەکە بە بەردەوامی تووشی ئاژەڵ دەبێت بەتایبـەتی لـە قۆنـاغی زایـینو خـاوەن ئـاژەڵ بـە شـێوەیەکی گـشتی ڕێگەیـەکی زۆر نازانـستیانە دەگرێتەبەر بۆ چارەسەرکردنی، کە کێشەکە زیـاتر ئـاڵۆز دەکـاتو تەندروسـتی ئاژەڵەکـە دەخاتە مەترسییەوە، هەر لەبەر ئەمەش بەپێویستم زانـی کـە چـەند زانیارییـەکی گـرنگ بخەمە پێش چاوی خوێنەران.

### گیربوونی پزدان چی دەگەیەنێت:

پزدان لەئاژەڵداو ویلاش لەمرۆڤ دا زۆر پێویـستە بـۆ بـەردەوامی ژیـانی کۆرپـەلـە (پـز) بەتایبەتی لەماوەی ئاوسی دا چونکە هەر لەڕێگەی پزدانـەوە پـز خۆراکـە بەسـوودەکانی پێ دەگـاتو خـۆری ڕزگـار دەکـات لـە پاشـەڕۆکانو هـەروەها پـزدان پارێزگـاریش لـەپز دەکات.

پـزدان لـە دوی زایـنی مانگـای ئـاوس هـیچ سـودێکی ئـەوتۆوی نامێنێـتو پێویـستە بەشێوەیەکی سروشتی لە دوای (٦– ١٢) سەعات پزدانەکە لە گوێرەکـەدان جیاببێتـەوەو بـچێتە دەرەوەی لەشـی ئاژەڵەکـە، بـەلام بەپێـچەوانەوە گـە ڕپزدانەکـە لـەم ماوەیـەدا جیانەبووەوە لە لەشی دایکەکە ئەوا لە کۆمەڵگای کوردەواریو لەنێو ئـەو خەڵکانـەی کـە

ئاژەڵ بەخێو دەکەن دەوترێت کە پزدانەکە گیر بووە، واتە پزدانەکە بە شێوەیەکی سر شتی نەهاتۆتە دەرەوەی لەش‌و پێویست دەکات کاری بۆ بکرێت بۆ هێنانە دەرەوەی.

بەم پرۆسەیەش دەگوترێت گیربوونی پزدان کە لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێنەری پێ ی دەگوترێت Rentained Placenta لە رووی ئابووری یەوە نەخۆشی گیربوونی پزدان زەرەرێکی لەبەرچاو دەگەیەنێت‌و دەبێتە هۆی:

١- کەمبوونەوەی بەرهەم هێنانی شیر بە رێژەی ٤٠٪.

٢- زیادبوونی خزمەتگوزاری ڤێتێرنەری بە رێژەی ٣٢٪.

٣- رێژەی لەناوبردنی ئاژەڵی تووشبوو بە رێژەی ١٩٪.

٤- درێژبوونەوەی ماوەی نێوان ئاوس بون "Calving interval" بەرێژەی ٩٪.

٥- زیادبوونی مەسرەفی مانگا تووشبووەکان، بەپێی لێکۆڵینەوەیەك لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ هەر مانگایەکی تووشبوو بە گیربوونی پزدان نزیکەی ٢٤٤$ پێویستەو ساڵانە نزیکەی ١٥٤ میلیۆن دۆلاری بۆ تەرخانەدەکرێت، ئەم برە پارەیەش لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازی هەیە.

بەپێی سەرچاوەکان رێژەی تووشبوون بەگیربوونی پزدان دەرکەوتووە کە ئاژەڵی ئاوس نزیکەی ٤- ١١٪و بەپێی توێژینەوەیەکی کلینکی کە لەناوچەی سلێمانی لەساڵی ٢٠٠١ دا لە کۆلێژی پزیشکی ڤیتێرنەری / زانکۆی سلێمانی ئەنجامدا دەرکەوت کە گیروگرفتی پزدان لەمانگای ناوچەی سلێمانی گەیشتە ١٢,٩٨٪.

- بە پێ ی لێکۆڵنەوەکان بە رێژەی ٥٩٪ ئەو مانگایانەی کە تووشی گیربوونی پزدان بوون، بەشێوەیەکی خۆیی لەماوەی (٥- ٧) رۆژدان لەدوای پرۆسەی زایین دا پزدانەکەیان فرێ دەدرێتە دەرەوەی لەش.

## پێکهاتەی پزدان:

لەئاژەڵە کاوێژکەرەکاندا پزدان پێکهاتووە لە:

١- پزدانی پز : Fetal placenta.

٢- پزدانی دایك: Maternal Placenta

بەشێوەیەکی سروشتی پزدانی دایكو پزدانی پز بەیەکەوە لکاون بەهۆی پێکهاتەیەکەوە کە پێ ی دەگوترێت Anchoring system ، Fetal Cotyledon پێکهاتەیەکە لە پزدەلکێت بە پێکهاتەیەکەوە لەپزدانی دایك کە پێی دەگوترێت Meternal Caruncle و لە ئەنجامدا پزدان دروست دەبێت.

مادەی کولاجین:Collagen رۆڵێکی سەرەکی هەیە لە پێکهێنانی Anchoring System کە بێ گومان دەبێتە هۆی توندو تۆڵ کردنی پێوەلکانی هەردوو پێکهاتەی پزدانی پزو پزدانی دایك کە بریتین لە "Cotyledon + Maternal Caruncle" دەرکەوتووە کە پزدانی بەهۆی سیستمی "Anchoring system" کە کۆلاجین رۆڵی سەرەکی دەگێرێت زۆر بەهێزو توندو تۆڵ بەیەکەوە دەلکێن بە مەبەستی ئەنجام دانی فەرمانەکانی کە لە خزمەتی مانەوەی پزە بەزیندوویەتی بەدرێژایی ماوەی ئاوسی "Gestation Period".

لەدوای پرۆسەی زایین بە ٦- ١٢ سەعات پرۆسەی لێکترازانی پێکهاتەی "Fetal Cotyledon" لە پێکهاتەی "Maternal Caruncle" دەست پێدەکاتو لەئەنجامدا پزدانی پز لە پزدانی دایك جیا دەبێتەوە بەم شێوەیە بەرە بەرە پزدانەکە دەچێتە دەرەوەی لەشو ئەم پرۆسەی جیابوونەوەیە ڕوودەداتو بەهۆی پرۆسەی "Collagenolsysis" کە بەهۆی کاریگەری ئەنزیمی "Colagenase" کۆلاجینەیز یارمەتی دەدرێتو ڕوودەدات.

## هۆکاری تووشبوون بە گیربوونی پزدان:

هۆکاری سەرەکی تووشبوون بەگیربوونی پزدان لەدوای زایین بریتیە لە جیانەبوونەوەی

پـزدان لەلەشـی دایکـەوە کـە ئەمـەش بێگومـان دەبێـت لەئـەنجامی ڕوونـەدانی پرۆسـەی Collagenol!ˋsis کە ئەمـەش هۆکارەکـەی بریتیـە لـە پەککـەوتنی ئـەنزیمی کۆلاجینـەز "Collagenase" لەدوای زاییـن داو لەئەنجامـدا گیربـوونی پزدانەکـەو ڕوودانـی گیربـوونی پزدان. واتە هەر هۆیەك بێتەهۆی پەکخستنی ئەنزیمی کۆلاجینەیز دەبێتـە هـۆی ڕوودانـی گیربوونی پزدان، بەپێ ی سەرچاوەکان لەئاژەڵی ساغدا لەکاتی زاییندا چالاکی ئـەنزیمی کۆلاجینەیز زیاد دەکات بەڵام لەکاتی ڕوودانی گیربوونی پزداندا کاری ئەنزیمی کۆلاجینەیز پەکی دەکەوێت.

هەنـدێك هۆکـار هـەن کـە دەبێتـە هـۆی پەکخـستنی ئـەنزیمی Colagenaseو جیانەبوونەوەی پزدان لە لەشی دایك، لەوانەش:

١- ناهاوسەنگی لە هۆرمۆنەکان لە پـێش کـاتی زایـین دا یەکێکە لـەو هۆکارانـەی کـە دەبنە هۆی ڕوودانی گیربوونی پزدان.

هۆرمۆنی پرۆجیسترون یەکێکە لەو هۆرمۆنانەی کە دەبێتە هـۆی پەکخـستنی ئـەنزیمی Collagenase

لەکاتی زیادبوونی برەکەیدا لەکاتی زاییندا دەبێتە هـۆی مانـەوەی پـزدانو گیربـوونی. هـەروەها بـەپێ ی توێژینـەوەکان هۆرمۆنـەکانی کـۆرتیزۆلو پرۆسـتاگارندینیش لـەو هۆرمۆنانەن کە ڕێگە خۆشکەرن بۆ گیربوونی پزدان.

٢- هەر هۆیەك بەهۆی زەبرێکەوە "Trauma" ناوەکی بێت یان دەرەکی دەبێتە هۆی دەردانـی مـاددەی هیپـارین "Heparin" کـە دەبێتـە هـۆی پەکخـستنی پرۆسـەی "Collagenollysis"لە ئـەنجامی پەکخستنی ئـەنزیمی کۆلاجینـەیزو ڕوودانـی گیربـوونی پزدان.

٣- کەم بوونەوەی ژمارەی خڕۆکە سـپی یـەکان " Leukocytes" هۆکـارێکی دیکەیـە کـە ڕێگـە خۆشـکەرە بـۆ ڕوودانـی گیربـوونی پـزدان، چـونکە خڕۆکـە سـپی یـەکان سەرچاوەیەکی گرنگی ئەنزیمی "کۆلاجینەیزە"

## دەرئە نجامەکانی گیربوونی پزدان

زاین

↓

جیانەبوونەوەی پزدان.

↓

گیربوونی پزدان

↓

کۆبوونەوەی بەکتریا نەخۆشخەرەکان

↓

ڕوودانی گۆڕانکاریەکان:

١- دەردانی ژەهر لەلایەن بەکتریاکانەوە.

٢- کەمبوونەوەی بەرگری لەش.

٣- تێکچوونی چینی ناوپۆشی گوێرەکەدان.

٤- کەم بوونەوەی ژمارەی خڕۆکە سپی یەکان.

٥- زیاد بوونی بڕی هەستامین و پرۆستاگلاندین.

- دەرکەوتنی نیشانەکانی:

١- هەوکردنی گوێرەکەدان "Metritis".

٢- کەم بوونەوەی بەرهەم هێنانی شیر.

٣- لە لەوەڕ دەکەوێت وپرۆسەی : Uterine involution دوادەکەوێت.

بەپیتی ئاژەڵەکە کەم دەکات "Low Fertilty"

نیشانە کلینیکی یەکانو چۆنیەتی چارەسەرکردن:

گرنگترینو دیارترین نیشانە لەسەر ئاژەڵی تووشبوو بە گیربوونی پزدان ئەوەیە کە

لەدوای ١٢ سەعات لە زاینی ئاژەڵەکە بە شێك لە پزدانەکە شۆڕ دەبێتەوە بەزیّ ی داو بە شەکەی دیکەی لەناو گوێرەکەدانی ئاژەڵەکە دەمێنێتەوەو گیردەبێت، کە زۆر بە ئاسانی لەلایەر خاوەن ئاژەڵەوە دەبینرێتو بەو شارەزاییە سادەو ساکارەی کە هەیەتی هەوڵ دەدات چارەسەری بکات بەوەی کە بەشی دەرهاتوو لە پزدانەکە بەدەستو بە بەکارهێنانی هێز ڕادەکێشێت بۆ دەرەوە"Manual Removal" یاخود بە شتێکی قورسەوە بیبەستێتەوە بەمەبەستی لێکترازاندنو پچڕاندنی پزدانەکە کە ئەمەش بێگومان ڕێگەیەکی زانستی نیەو کار دەکاتە سەر تەندورستی ئاژەڵەکەو لەوانەیە ببێتەهۆی خوێن بەربوونو لەناوچوونی ئاژەڵەکە، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر پزیشکانی ڤێتێرنەری خاوەن ئاژەڵەکان لە مەترسییەکانی ئەم ڕێگە چارەیە هۆشار بکەنەوە.

– زۆر لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان بەڕێگەیەکی گونجاو دادەنێن بۆ چارەسەرکردنی گیربوون پزدان، لەوانەش ئۆکسی تۆسین ئیسترادایۆلو پرۆستاگلاندین بەمەرجێك بەشێوەیەکی زانستیانە و لە ژێر سەرپەرشتی پزیشکێکی شارەزاوە بەکاربهێنرێت.

## بەکارهێنانی ئەنزیمی Collagenase

بە پێ ی توێژینەوە نوێیەکان بەکارهێنانی ئەنزیمی Collagenase بەگونجاوترین چارەسەر دادەنرێت بۆ چارەسەرکردنی گیربوونی پزدان، ئەم ئەنزیمەش لە سەردەمەدا بەرهەم دەهێنرێت لە ڕێگەی بەکتریای Clostridium histolyticum لە تاقیگەکاندا یەکێکە لە توێژینەکان ئامارەی بەوە کردووە کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی " Collagenase" بۆتە هۆی چارەسەر کردنی ٨٥٪ ئەو مانگایانەی کە تووشی گیربوونی پزدان بوون:

**فەرهەنگۆك:**

١- Theriogenolgy: ئەو زانستەیە کە بایەخ بە نەخۆشیەکانی کۆئەندامی زاوزێ دەدات لە قۆناغە جیاجیاکاندا وەکو لە قۆناغەکانی کەڵو ئاوسس بوونو زایینو هەروەها پرۆسەی کەڵدانی دەستکردو گشت ئەو لایەنانەی کە پەیوەندی بە زۆربوونی ئاژەڵ هەیە"Animal reproduction" لە سەرچاوەی پزیشکی ڤێتێرنەری هەروەك زاراوەیەکی نوێ بەکاردێت.

٢- پز Fetus: زاروەیەکە لە نێو خاوەن ئاژەڵدا بەکاردەهێنرێت، کە لەمرۆڤدا بە کۆرپەلە ناو دەبرێتو دەکەوێتە ناو پزدانەوە لە ناو گوێرەکە دانو لە ڕێگەی پزدانەوە پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکرێت بە درێژایی ماوەی ئاوسی.

٣- ماوەی نێوان ئاووس بوون " Calving interval" ئەو ماوەیەی لەنێوان ئاووسبوونو ئاوسبوونێکی دیکەدا لە هەمان ئاژەڵدا، ئەمەش وەکو پێوەرێك بەکاردەهێنرێت بەوەی ئەو ماوەی چەند کورت بێت باشترە لە ڕووی ئابوورییەوەو چەند درێژبێتە زەرەر دەگەیەنێت بە خاوەن ئاژەڵ.

٤- پزدان:Placenta : زاراوەیەکە لە نێو خاوەن ئاژەڵەدا زۆر بە بڵاوی بەکاردەهێنرێت کە لە مرۆڤدا بە وێلاش ناودەبرێتو لە گوێرەکەدان پزدادەپۆشێت.

٥- Anchoring System: ئەو سیستەمەی کە بەهۆیەوە پزدان بەهێز دەبێتو پزدانی دایكو پزدانی پز بەیەکەوە دەلکێنێتو توندو تۆڵی دەداتێ ئەمەش بەهۆی ماددەی کۆلاجین "Collagen" وە دەبێت.

٦- Fetal Cotledon: ئەو پێکهاتە گرنگەی پزدانی پزە کە لە ڕێگەیەوە دەلکێت بە پێکهاتەی پزدانی دایك بۆ دروستبوونی پزدان.

٧- Maternal Cotyiedon: ئەو پێکهاتە گرنگەی پزدانی دایکە کە لە ڕێگەیەوە دەلکێت بە پێکهاتەی پزدانی پز بۆ دروستبوونی پزدان.

**سەرچاوە:**

١- پەیوەندی کردن بە بەشیو زمانو ئەدەبی کوردی لە کۆلێژی زمان لە زانکۆی سلێمانی بە بەرێز د. هۆگر محمود فرج کە زۆر سوودم وەرگرت لە پێشنیارەکانی سەبارەت بە هەندێك زارەوەی کوردی.

2- Young quist, R. S , and shore, M.D. 1997. retained placenta. In current Therapy in large animal theriogenology. 1st ed. W.B. Sounders Company, U.S. A PP: 340- 347.
3. Miller GY, Dorn CR; Costs of dairy Cattle diseases to producers in ohio. Prev. vet. Med. 1990; 8. 171.
4. Amin, R.A.SM. 2001. Clinical and Abattoir study of reproductive problems in local breed Cows in Sulaimani district.
"M.V. Sc" theise in Sulaymani university

# هێلکەدانی ناچالاك
## Invactive Ovaries

بە شێوەیەکی گشتی لەشی زیندەوارن لە کۆمەڵێك کۆئەندام پێکهاتووە کە بە هاوئاهەنگی و هاوکاری یەکتر چالاکیە جۆر بەجۆرەکانی لەش ئەنجام دەگەیەنن و بەردەوامی دەدەن بە ژیانی ئەو زیندەوارنە. کۆئەندامی زاوزێ لە ئاژەڵدا بە یەکێك لە کۆئەندامە گرنگەکان دادەنرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە لێپرسراوی پرۆسەی زۆربوون"Reproduction" دادەنرێت و هەر لە ڕێگەی کۆئەندامی زاوزێوە ئاژەڵەکان ژمارەیان زۆر دەبێت و بەدەوامیان دەبێت لەژیاندا، لەبەر ئەوە پەککەوتنی یەکێك لە ئەندامەکانی کۆئەندامی زاوزێ لە ئاژەڵدا دەبێتە هۆی پەککەوتنی پرۆسەی زۆربوون و لەئەنجامدا کاردەکاتە سەر ئاستی ئابووری خاوەن ئاژەڵ و هەروەها زیان دەگەیەنێت بە ئابووری وڵات.

نەهاتنە کەڵ"Anestrus" بەکێشەیەکی گەورەی ئاژەڵ دادەنرێت و خاوەن ئاژەڵ بەدەست ئەم کێشەیەوە بە بەردەوامی دەناڵێنێت، چونکە زیانی ئابووری پێی دەگەیەنێت.

نەهاتنەکەل لە کێشە سەرەکییەکانی کۆئەندامی زاوزێیە لەئاژەڵداو بەتایبەتیش لە مانگادا زۆر باوە کە دەبێتە هۆی نەزۆکی "infertiltiy" بە شێوەیەکی کاتی..

هێلکەدانی ناچالاك بەیەکێك لە شێوەکانی نەهاتنەکەڵ دادەنرێت و لەکوردستانداو لەمانگاکانی ناوچەی سلێمانیدا زۆر باوەو بەپێ ی توێژنەوەکان ڕێژەی تووشبوون بەهێلکەدانی ناچالاك بەرزە لەنێو مانگاکانی ناوچەی سلێمانی کە ئەمەش بێگومان نێگەتیڤانە کاردەکاتە سەر بەرووبوومی ئاژەڵەکان، لەبەر ئەوە ڕوونکردنەوەی لایەنەکانی ئەم کێشەیە بەکارێکی پێویست دادەنرێت کە بەهیوام لە خزمەتی خاوەن ئاژەڵ و زانستخوازاندا بێت.

**سوڕی هاتنەکەڵ: Estrous cycle**

'،خەسڵەتە گرنگو جیاکەرەوەکانی ئاژەڵی مێ بەشێوەیەکی گشتیو مانگا بەتایبەتی بونی سوڕی هاتنەکەڵە "estrous cycle یان سوڕی زۆربوونو لە هەندێك سەرچاوە پێی دەوترێت سوڕی هێلکەدان، بەپێ ی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری ماوەی سوڕی هاتنە کەڵ لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی دیکە دەگۆڕێت.

لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژیانەی کە بەسەر هێلکەداندا دێت، سوڕی هاتنەکەڵ بەچەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەکدا تێدەپەڕێت لەژێر چاودێری ڕاستەوخۆی ناوەندە کۆئەندامی دەمارو ژێر مێشکە ڕژێن.

**قۆناغەکانی سوڕی هاتنە کەڵ پێك دێن لە:**

١- قۆناغی پێش کەڵ. Proestrous Phase

٢- قۆناغی هاتنە کەڵ: Estrous phase

٣- قۆناغی دوای کەڵ : Metestrous phase

٤- قۆناغی تەنە زەردە Diestrous phase

درێژی ماوەی سوڕی هاتنە کەڵ مانگادا نزیکەی بیستو یەك ڕۆژەو لەنیشانە دیارەکانی مانگایەکی بەکەڵ بریتیە لە:

١- مانگای بەکەڵ دەوەستێتو کلکی بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی گایەکەوە کەڵ بدرێت. ئەمەش بە سەرەکیترین نیشانە دادەنرێت.

٢- مانگای بەکەڵ بێ ئارام دەبێتو دەبۆڕێنێتو کۆنترۆڵ کردنی لەلایەن خاوەنکەیەوە زۆر زەحمەت دەبێت.

٣- شلەیەکی سافو خاوێنو لینج بە زێدا دێتە خوارەوە.

٤- بەرهەمی شیری کەم دەکاتو پرۆسەی دۆشینی لەلایەن خاوەنکەیەوە زەحمەت دبێت.

٥- ئاوسانو سورِبوونەوەی زۆربەی ئەندامەکانی کۆئەندامی زاوزێ لەگوێرەکەدانو نێ.

لە کۆمەڵگای کوردەواری خاوەن ئاژەڵەکان شارەزاییەکی باشیان پەیداکردووە لە ناسینەوەی مانگا بەکەڵەکان لەڕێگەی نیشانە دیارەکانەوە، لەبەر ئەوە نەهاتنەکەڵی ئاژەڵەکانیان بە کێشەیەکی گەورە دەزانن بەوەی کە مانگاکانیان نایەنە کەڵ ئەمەش بەوەی کە هیچ نیشانەیەکی کەڵیان لەسەر دەرناکەوێت.

## هێلکەدانی ناچالاك: Inactive Ovaries

هێلکەدانی ناچالاك یەکێکە لە شێوەکانی نەهاتنە کەڵو لەهەندێك سەرچاوە پێی دەوترێت نەهاتنە کەڵی ڕاستەقینە "True anestrous"و مانگا بەشێوەیەکی گشتی پێویستە هەموو بیستو یەك ڕۆژ جارێك بێتەکەڵ بەڵام کاتێك تووشی هێلکەدانی ناچالاك دەبێت، نیشانە سەرەکی یەکانی کەڵی لەسەر دەرناکەوێتو لەئەنجامدا دوا دەکەوێت لەبەرهەم هێناندا.

هێلکەدانی ناچالاك لەو کێشانەیە کە تووشی هێلکەدان دەبێتو لەئەنجامدا بەشێوەیەکی فسیۆلۆژی کارناکاتو لەکار دەکەوێتو دەبێتە هۆی نەزۆکی بەشێوەیەکی کاتی"Infertility"

هێلکەدانی چالاك ئەو جۆرە هێلکەدانەیە کە بە شێوەیەکی سروشتی هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی فەرمانەکانی، لە فەرمانە سەرەکییەکانی هێلکەدان بریتیە لە بەرهەمهێنانی هێلکە"Ovum" کە ئەمەش ڕوودەدات لە ئەنجامی گەشەکردنی چیکڵدانەکانو ڕوودانی پرۆسەی هێلکەدانان "Ovulation"و هەروەها بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکان وەکو (پرۆجیسترۆنو ئیسترۆجینو ریلاکسینو ئینهیبین"Inhibin" و ئەکتڤین "Actvin"و فۆلستانین "Follistatin" لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژیانەی کە بەسەر هێلکداندا دێت سوڕی هاتنەکەڵ بەچەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەکدا تێدەپەڕێت لەژێر

چاودێری‌و کۆنترۆڵی ڕاسته‌وخۆی ناوه‌نده کۆئه‌ندامی ده‌مارو ژێر مێشکه ڕژێن، به‌ڵام له‌کاتی ڕوودانی هێلکه‌دانی ناچالاك واته هێلکه‌دان توانای نامێنێت له ئه‌نجامدانی فه‌رمانه‌کانی له له‌به‌رهه‌م هێنانی هێلکه‌و هۆرمۆنه جۆره‌به‌جۆره‌کان‌و له ئه‌نجامدا هیچ گۆڕانکارییه‌کی فسیۆلۆژی به‌سه‌ر هێلکداندا ڕوونادات‌و ئاژه‌ڵه تووشبووه‌که نایه‌ته که‌ڵ‌و تووشی نه‌زۆرکی ده‌بێت‌و دواده‌که‌وێت له به‌رهه‌مهێناندا.

## هۆکاری تووشبوون به هلکه‌دانی ناچالاك:

به‌پێ ی زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌کانی پزیشکی ڤێتێرنه‌ری هۆکاری سه‌ره‌کی ڕوودانی هێلکه‌دانی ناچالاك ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ که‌می بڕی به‌رهه‌م هێنانی هۆرمۆنه‌کانی گۆنادۆترۆفین "gonadortophins"، له‌لایه‌ن ژێر مێشکه ڕژێنه‌وه "Pituitary gland" که ئه‌مه‌ش بێگومان ده‌بێته هۆی ڕوونه‌دانی پرۆسه‌ی دروست بوونی چیکڵدانه‌کان "Folliculogenesis" که‌ئه‌مه‌ش واده‌کات چیکڵدانه‌ی گراف Grafin foilicle که چیکڵدانه‌یه‌کی پێگه‌یشتووه دروست نه‌بێت‌و له‌ئه‌نجامدا پرۆسه‌ی هێلکه‌دانان په‌کی ده‌که‌وێت‌و ڕوونادات‌و ته‌نه زه‌رده Corpus Luteum نایه‌ته پێکهاتن.

به‌شێوه‌یه‌کی گشتی گۆڕانه‌کان به‌سه‌ر هێلکه‌داندا ڕوونه‌داوت له ئه‌نجامی ئه‌مه‌ش سوڕی هێلکه‌دان ڕوونادات‌و له‌ئه‌نجامی ئه‌مه‌ش سوڕی هاتنه که‌ڵ په‌کی ده‌که‌وێت‌و ئاژه‌ڵه‌که نایه‌ته‌که‌ڵ.

به پێی بۆچوونه‌کانی (Roberts،١٩٨٦ ) هۆکاری سه‌ره‌کی که‌م بوونه‌وه‌ی به‌رهه‌م هێنانی هۆرمۆنه‌کانی گۆنادۆترۆفین ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ نه‌بوونی هاوسه‌نگییه‌ك له پێکهاته سه‌ره‌کییه‌کانی خۆراکدا له (پرۆتین‌و کاربۆهیده‌رێت‌و چه‌وری‌و ڤیتامینه‌کان‌و کانزاکان‌و ئاو)، واته زۆر جار که‌می ئاستی مادده‌ی پرۆتین له ئالفدا هۆکارێکی کاریگه‌ره بۆ ڕوودانی هێلکه‌دانی ناچالاك، چونکه ده‌بێته هۆی که‌م بوونه‌وه‌ی به‌رهه‌مهێنانی وزه‌ی پێویست‌و هه‌روه‌ها زۆربه‌ی هۆرمۆنه‌کانی گۆنادۆترۆفین له پێکهاته‌یاندا له‌مادده‌ی پرۆتین

پێکهاتوون، لەبەر ئەوەی کەمی ئاستی پرۆتین لەئالفدا دەبێتە هۆی کەمی بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکانو لە ئەنجامدا ڕێگە خۆشکردن بۆ ڕوودانی هێلکەدانی ناچالاك، لەکاتی پشکنیندا لە قەسباخانەکاندا ئەو هێلکەدانانەی کە تووشی ناچالاکی بوون بەقەبارە زۆر بچووك دەبنیرێنو هیچ پێکهاتەیەکیان لەسەر نابینرێت وەکو چیکلدانەکانو تەنە زەردە ئەمەش بە باشترین بەلگە دادەنرێت لەسەر ناچالاکی هێلکەدان.

بەپێ سەرچاوەکان هەندێك هۆکاری دیکە هەنە کە پەیوەندییان هەیە بە ناچالاکی هێلکەدانەوە لەوانەش:

درێژ بوونەوەی ماوەی شیرپێدان" Sucking Period" زۆربەی بەرهەمهێنانی شیر لەدوای زاینەوەو هەروەها کێشەکانی وەکو بەراوێتەبوون "Abortion" و هەوکردنی گوێرەکەدان، " Metritis" کۆمەلێك هۆکارن کە ڕێگە خۆش دەکەن بۆ ڕوودانی هێلکەدانی ناچالاك.

## توێژینەوەیەك دەربارەی هێلکەدانی ناچالاك:

بەپێی توێژینەوەیەکی کلینیکی کە لە ساڵی ٢٠٠١ لە کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرنەری / زانکۆی سلێمانی ئەنجامدا لە ژێر ناونیشانی (توێژنیەوەیەکی کلینیکیو توێکاری لەسەر کێشەکانی زاوزێ لەمانگای ناوچەی سلێمانی) ڕێژەی ڕوودانی هێلکەدانی ناچالاك لەنێو مانگای ناوچەی سلێمانی گەیشتە ٢٢,٢٦ ٪و بەپێ ی لایەنی دووەمی توێژینەوەکە کە لە قسابخانەی سلێمانی ئەنجامدا بوو دەرکەوت کە ڕێژەی هێلکەدانی ناچالاك گەیشتە ١٦,٩٣ ٪ ئەم ڕێژانەش بە بەراورد لەگەڵ توێژینەوەکانی دیکە لەناوچە جیا جیاکاندا بەزرترە هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ چەند لایەنێك.

یەکەم: پێنەدانی ئالفێکی هاوسەنگ لە پێکهاتەکانیدا بەمانگاکانو واتە پێویستە ئالفی ئاژەڵ گشت پێکهاتە سەرەکییەکانی خۆراکی وەکو (پرۆتین– کاربۆهیدرات– چەوری –ڤیتامینەکان– کانزاکان– ئاو)ی تێدابێت بە بڕی گونجاوو بەپێ ی بەرنامەیەکی

خۆراكی كه لەلایەن پسپۆرانەوە دانراییێت.

كەواتە مانگاكانی ناوچەی سلێمانی هەروەك لەم توێژینەوەیەدا ڕوون كراوەتەوە لەسەر لەوەڕگایەكی هەژار دەلەوەڕێن( ڕێژەی باران باران لەم ماوەیەدا زۆر كەم بووە)و هەروەها ئالفێكی هەژاریان دەدرێتێ بەوە تێبینیكرا كە زیاتر پێكهاتووە لە(كاو نانەڕەقە) كەئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی وزەیەكی كەمو ناتەواو كە لەڕو لاوازیان پێوەدیارەو ئەمەش وادەكات زیاتر هەستیاربن بۆ تووشبوون بەهێلكەدان ناچالاك.

دووەم: پرۆسەی دۆشینی مانگاكانی ناوچەی سلێمانی لە ڕۆژێكدا دوو جار ئەنجام دەدرێت لەكاتی بەیانیان وئێواران‌و هەروەها درێژبوونەوەی ماوەی شیرپێدانی گوێرەكە ساواكان، كە بەپێی بۆچوونەكانی (Markusfel, 1987- El –Azab, 1992) پەیوەندییەكی ڕاستەخۆیان هەیە بە دابەزینی ئاستی چالاكی هێلكەدان.

سێیەم: تووشبوونی مانگاكانی سلێمانی بە ژمارەیەكی زۆر لە مشەخۆرە دەرەكییەكانی وەكو گەنە "Ticks" ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ كەمتەرخەمی و لاوازی هۆشیاری پزیشكی ڤێتێرنەری لەنێو خاوەن ئاژەڵەكان كە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی كەم لەوەڕی‌و كەمی بەرهەمهێنانی وەزەی پێویست‌و هاتنە خوارەوەی چالاكی هێلكەدان‌و نەهاتنەكەڵی مانگاكان.

چوارەم : مانگاكانی ناوچەی سلێمانی زیاتر بەدەست نەخۆشیە جۆربەجۆرەكانی دوای زایینەوە "Puer Peral diseases" دەناڵێن، وەك گیربوونی پزدان‌و تای شیرو هەوكردنی گوێرەكەدان كە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان هەیە بە هێلكەدانیناچالاكەوە.

**چارەسەركردن:**

**پێویستە ڕەچاوی ئەم خالانە بكرێت:**

یەكەم: بە مەبەستی چارەسەركردنی هێلكەدانی ناچالاك پێویستە لایەنی خۆراكی چاك بكرێت هەروەك هەنگاوی یەكەم، ئەمەش دەبێت بە گرتنەوەو پێدانی ئالفێك بە ئاژەڵەكان كەهاوسەنگییەك هەبێت لە پێكهاتەكانیدا وەكو (پرۆتین –كاربۆهیدرت‌و چەوری‌و

ڤیتامینەکان‌و کانزاکان‌و ئاو) بەڕێژەی گونجاوو بەپێی بەرنامەیەکی خۆراکی کە لەلایەن پسپۆرانی خۆراکەوە دانرابێت‌و پێویستە ڕەچاوی تەمەنی جیاوازەکان بکرێت‌و هەروەها پەیداکردنی و پێدانی ئالفی سەوزە بە بەردەوامی ئەمەش دبێت بە بایەخدان بە لەوەڕگاکان، چونکە ئالفی سەوز لەهەر چوار وەرزی ساڵدا پێویستە بۆ گەشەکردن‌و بەرهەمهێنانی وزەو پڕکردنەوەی پێداویستیە خۆراکییەکانی ئاژەڵەکان‌و لە ئەنجامدا هاتنەکەڵی مانگاکان بە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك لە ئەنجامی چالاکی هێلکەدان.

دووەم: سنوردانان بۆ ماوەی شیرپێدانی گوێرەکە ساوکان (لە شیر بڕینەوە) کەئەمەش بەپێی بۆچوونی (Arthur et. al. 1996) پێشنیازی ئەوە دەکات کە سنورێك بۆ شیرپێدان دابنرێت واتە دوای ماوەیەکی دیاریکراو گوێرەکە ساواکە لە شیر ببڕێتەوە، بە مەبەستی ئەوەی کە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی چالاکی هێلکەدان‌و دەستپێکردنەوەی سوڕی هاتنەکەڵ.

سێیەم: چارەسەرکردن‌و کۆنترۆڵکردنی کێشەکانی دوای پرۆسەی زایین لە ئاژەڵداو هەروەها قەلاچۆکردنی مشەخۆرە دەرەکییەکان بە بەردەوامی کە بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی بەردەوامی دان بە چالاکی هێلکەدان.

چوارەم: دوای چاك کردنی باری خۆراکی ئاژەڵە تووشبووەکان پێویستە بیر لە بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان بکرێتەوە.

بەپێ ی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری گونجاوترین هۆرمۆن برتیە لە " Pregnant mare PMSG” Serum gonadotophin کە یەکێکە لە هاوشێوەکانی هۆرمۆنی هاندەر چیکڵدانە" Folliele “FSH”” Stimulating hormone"

کە مەبەست لە بەکارهێنانی لەکاتی ڕوودانی هێلکەدانی ناچالاك بریتی یە لە چالاکردنەوەی هێلکەدان بەهاندانی گەشەکردنی چیکڵدانەکانی لە ڕێگەی هاندانی

پرۆســەی "Folliculogenesis" دروســت بــوونی چــیکڵدانە پێگەیــشتوو لەئەنجامــدا بەرهەمهێنانی هێلکەو دەستپێکردنەوەی سوڕی هاتنەکەڵ.

**سەرچاوە:**


1- Roberts. S. J. 1986 Veterinary Obstertries and Genital disease 3th edition.
2- El- Azab, M. A. Badr, A. El.
Sadawy, H.A,. Shawki, G., and Barakat T. M., 1992. Some contributing biochemical change sin relation post- Partum Ovarian Acyclicity in dairy Cows. Egypt . J. Appl. Sci 7:798- 808.
3- Markusfeld, O.1987. Inactive Ovaries in high- yielding dairy Cows bedofe service. Aetiology and effect on Conception Vet. Rec. 121: 149- 153.
4- Arthur G. H., Noakes D.E. Pearson, H. and Parkinso n, T.J. 1996. Veterinary Reproduciton And Obsterics, 7th edition.


ماستەر نامە بەناونیشانی:

توێژینەوەیەکی کلینیکیو توێکاری لەسەر کێشەکانی زاوزێ لەمانگای ناوچەی سلێمانی لەلایەن دکتۆر فەرەیدون عەبدولسەتار ساڵی ۲۰۰۱- زانکۆی سلێمانی.

# نەخۆشی دەردە گا

## Rinder Pest

ڕەشەولاخ لە کۆمەڵگای کوردستان بەگاو مانگاو گامێش دەوترێتو بەخێو کردنیـان لـە کوردستاندا مێژوویەکی دێرینی هەیە بەشێوەیەك لە گوندو شارەکاندا خـاوەن ئـاژەڵی وا هەیە کە شارەزاییەکی باشیان پەیدا کردووە لـە چۆنیەنی بـەخێوکردنو بـەڕێوەبردنو زۆربوونانـدا. ڕەشـە ولاخ بـە سەرچـاوەیەکی سـەرەکی شـیرو گۆشـتی سـور دادەنرێـتو خەڵکی کوردستانیش ئارەزووی خواردنی بەرهەمەکانی شیرو گۆشتی سوریان هەیە.

زۆر نەخۆشی هەیـە کـە دەبنـە هـۆی پەکخستنی گەشـەکردنو زۆربـوونی ڕەشـەولاخو لەئەنجامدا دەبێتە هۆی بەربەستێك لەبەردەم گەشەکردنی ئابووری کوردستان.

دەردە گا یەکێکە لەو نەخۆشییانەی کە تووشی ڕەشەولاخ دەبێـتو زیـانێکی گـەورەی پێدەگەیـەنێت، دەردە گـا زۆربـە ئاسانی لەولاتێکـەوە بـۆ ولاتێکـی دی دەگوێزرێتـەوەو تەشەنە دەکات بەمەش هەڕەش لە سامانی ئـاژەڵ دەکـات لـە زۆربـەی ولاتـانی جیهـان، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە گشت ولاتانی جیهانی هاوکاری یەکتر بکەن بـۆ کـۆنترۆڵ کـردنو بنبڕکردنی.

هەرچـەندە بـەپێ ی دۆکیۆمێنتـەکانی ڕێکخـراوی FAO و بەڕێوەبەرایەتییـەکانی ڤێتێرنەری لە کوردستان نەخۆشی دەردە گا لەم دەساڵەی دواییدا لەناوچـە جیاجیاکـانی کوردستاندا تۆمار نەکراوە بەڵام لەبەر توندو تیژی ترسناکی نەخۆشی یەکـە بـە پێویستم زانی کە چەند زانیاریەکی گرنگ دەربارەی دەردە گا بخەمە پێش چاوی خوێنەران.

### نەخۆشی دەردەگا:

لـە کۆمـەڵگای کـوردەواری بـە تایبـەتی لـەنێو خـاوەن ئـاژەڵو گونـد نیـشینەکان بەنەخۆشـیەکە دەوترێـت، دەردە گـا، هـەروەها پێـشی دەوترێـت تـاعرنی ڕەشـە ولاخ، Cattle Plague، لـە سەرچـاوەکانی پزیـشکی ڤێتێرنـەری پـێ ی دەوترێـت " Rinder

."Pest

[1]ـە ڕووی مێژوویـەوە نەخۆشـی دەردە گـا بـە یـەکێك لـە نەخۆشـیە ترسـناکەکان دەژمێر-رێتو لەئەنجامی جەنگەکاندا لەسەردەمە جیا جیاکانی مێـژوودا بڵاوبۆتـەوەو بـە گشت وڵاتانی جیهاندا تەشەنەی کردووە، کە لەسەرەتاوە لە وڵاتانی کیـشوەری ئاسـیاوە دۆزراوەتەوە بۆ وڵاتانی کیشوەری ئەوڕوپاو لە دواییدا بۆ ناوچـەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت لـە ئەنجامـدا گەیـشتۆتە کیـشوەری ئـەفریقیا. لەبـەر ئـەوە بـە مەبەسـتی بـەرگرتن لـە بڵاوبوونەوەی زیاتری نەخۆشییەکەو دانانی سنورێك بۆ تەشەنەکردنی لـە سـاڵی ١٧٦٢ زا یەکەم قوتابخانەی ڤێتێرنـەری لەشـاری لیـۆن لـە وڵاتـی فەڕەنـسا دامـەزاروە لەئەنجامـدا کاتێك توێژینەوەی زانستی دەربارەی نەخۆشی دەردەگا تیایدا ئـەنجام درا، کـە ئەمـەش بووە هۆی ئەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەدا لەهەنـدێك وڵاتـانی جیهانـدا کـۆنترۆڵ بکرێتو بنبڕبکرێت بەتایبەتی لە وڵاتانی کیشوەری ئـەوڕوپاو باشـووری ئـەفریقیاو وڵاتـی صین.

بەپێ ی سەرچاوەکان دەردەگـا زیـاتر تووشـی ئاژەڵـە دوو سمـەکان دەبێـتو ئاژەڵـە کاوێژکەرەکانو بەراز زۆر هەستیارن بۆ ڤایرۆسـی نەخۆشـییەکەو زۆر بـە ئاسـانی تـووش دەبن.

ڕەشە وڵاخ(گاو مانگاو گامێش) لە هەموو تەمەنەکاندا بە شێوەیەکی سروشتی تووشـی ڤایرۆسـی دەردەگـا دەبـنو نیـشانەکانی سروشـتی تووشـی ڤایرۆسـی دەردەگـا دەبـنو نیشانەکانی نەخۆشییەکە بە ئاشکرا لە سـەریان دەردەکـەوێتو دەرکـەوتووە کـە ئاژەڵـە کێویەکانیش تووشی دەردەگـا دەبـنو زیانیـان پـێ دەگەیـەنێت. بـەپێ ی سەرچـاوەکان دەرکەوتووە ڕاددەی تووشـبوون Morbidity rate دەگاتـە ١٠٠٪ و ڕاددەی لەناوچـوون: Mortality rate دەگاتە ٥٠٪.

نەخۆشی دەردە گا بەهیچ شـێوەیەك ناگوێزرێتـەوە بـۆ مـرۆڤو ترسـناکی ڕاسـتەوخۆی لەسەر تەندرسوتی مرۆڤ نییە.

## چۆنیەتی گواستنەوەی نەخۆشی دەردەگا:

تێکەڵبوون و پەیوەندی ڕاستەخۆ لەنێوان ئاژەڵی تووشبو بەنە خۆشییەکە لەگەڵ ئاژەڵی ساغ دا بەڕێگەیەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ گواستنەوەی نەخۆشییەکە لەنێو ئاژەڵدا، ڤایرۆسی نەخۆشییەکە بە ژمارەیەکی زۆر هەیە لە دەردراوەکانی وەکو لیک و پاشەڕۆو شیرو تۆو ئاوی لوت و چاوی ئاژەڵی تووش بوو.

بەڕێگەی هەناسەدان و هەناسە وەرگرتن ڤایرۆسی نەخۆشییەکە دەگوێزرێتەوە، زیاتر نەخۆشییەکە تەشەنە دەکات کاتێك ڕاددەی شێ لە دەورو بەردا بەرزدەبێتەوەو پلەی گەرمیش نزم بێتەوەو کاتێك کاریگەری تیشکی ڕۆژ کەم دەبێتەوە.

– گواستنەوەی ئاژەڵ لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە بەتایبەتی لە سنورەکاندا بە ڕێگەیەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ گوێزانەوەی نەخۆشی دەردەگا.

– لەڕێگەی بەکارهێنانی ئاوو خۆراکی پیس بوو بە ڤایرۆسی نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکە.

– دەرکەوتووە بەهۆی مێش و مەگەزەوە ڤایرۆسەکە ناگوازرێتەوە.

## هۆکاری نەخۆشی دەردەگا:

هۆکاری نەخۆشیی دەردە گا دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسێك پێ ی دەوترێت " Morbilli virus " کە سەر بە خێزانی "Para myxo viridae" سەر بە کۆمەڵەی RNA Virus.

– ڤایرۆسەکە چەند جۆرێکی هەیەو جیاوازیان لەنێوانیدا لەڕووی توندو تیژییەوە "Virulencity". بەڵام پەیوەندیەکان بەیەکەوە هەیەو بەم پەیوەندییەش دەوترێت" Antigenic relationship" کە ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی ڕوودانی دیاردەی "Cross- immunity" ئەم دەیاردەیەش سوودی هەیە لەکاتی پرۆسەی کوتان، واتە لەکاتی بەکارهێنانی جۆرێك لە جۆرەکانی ڤایرۆسەکە وەك ڤاکسین بۆ کوتانی ئاژەڵە ساغەکان کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئاژەڵە کوتراوەکان بەرگری پەیدا دەکەن و پارێزراو

دەبن لە توشبوون بە نەخۆشی دەردەگا بە جۆرەکانی دیکەی ڤایرۆسەکە، ئەمەش بە خ ـڵەتێکی دیکەی گرنگی ڤایرۆسە دادەنرێت کە لە خزمەتی پرۆسەی کوتانە "Vaccination".

– ڤایرۆسی نەخۆشی دەردە گا لەڕووی پێکهاتەیەوە زۆر پەیوەندی هەیە بە ڤایرۆسی نەخۆشی تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان"PPR" لەمەڕو بزندا، هەروەها نەخۆشی سورێژە"Measles" لەمرۆڤداو نەخۆشی تاعونی سەگ" Canine distemper" لە سەگدا.

– ڤایرۆسەکە توانای مانەوەی هەیە بە چالاکی لە چوار پلەی سەدیداو هەروەها لە پلەی ترشێتی (٧,٢ – ٧,٩) بەلام پەکی دەکەوێتو لەکار دەکەوێت لەپلەی ترشێتی "٥,٦"و زیاتر لە ٩,٦".

– ڤایرۆسەکە پەکی دەکەوێتو لەکاردەکەوێت لەژێر کاریگەری ڕاستەخۆی تیشکی ڕۆژو دەوربەرێکی وشکدا.

– توانای مانەوەی هەیە بەچالاکی لە شیری ئاژەڵێکی تووشبوودا بۆ ماوی ١– ٢ ڕۆژ.

## نیشانەکان:

نیشانەکانی نەخۆشی دەردەگا بەشێوەیەکی گشتی بەندە لەسەر:

١– توندو تیژی جۆری ڤایرۆسەکە.

٢– ڕادەی هەستیاری خانە خۆیکە بۆ ڤایرۆسەکە.

٣– ئاستی بەرگری لەشی خانەخۆیەکە.

٤– ڕێگای تووشبوون بە نەخۆشیەکە.

٥– بوونی نەخۆشی دیکە لەخانە خۆیکە.

بەپێ ی سەرچاوەکان دەردە گا چەند شێوەیەکی هەیەو باوترین شێوەیان شێوەی تیژی نەخۆشیەکەیە"Acuteform" کە ماوەی نێوان تووشبوون بە نەخۆشییەکەو تا

دەرکەوتنی نیشانە کلینیکی یەکان نزیکەی (٦- ٩) رۆژ دەخایەنێت.

نیشانەکانی نەخۆشی دەردەگا زۆر بە ئاشکرا لەسەر رەشە ولاخ دەردەکەوێت بە تایبەتی لەسەر گاو مانگای تووشبوو.

- پلە گەرمی لەشی ئاژەڵی تووشبوو بەرز دەبێتەوە کە دەگاتە (٤٠,٥- ٤١,٥) پ.س و لە لەوەڕ دەکەوێت و بەرهەمی شیری زۆر کەم دەکات.

- چاوو لووتی ئاژەڵی تووشبوو ئاو دەکات و سوور دەبێتەوە.

- لە نیشانە سەرەکییەکانی ئەوەی دوای ماوەیەك لینجە پەردە بۆشایی دەم و لووتی تووشبوو هەو دەکات و لینجە پەردەی زێ ئاژەڵەکە سور دەبێتەوە دوای ئەوە نیشانەکان چڕ دەبنەوە بەوەی چەند پەڵەیەکی ڕزیوی وورده وورده "Necrotic Lesions" لە بەشی ناوەوەی لێوەکان دەردەکەون و هەروەها لەسەر پووك و زمانی ئاژەڵی تووشبوو بڵاودەبێتەوە بە جۆرێك رۆژ لەدوای رۆژ قەبارەیان گەورە دەبێت و بەشەکانی دیکەی بۆشایی دەم و سەر زمان و ژێر زمان دەگرێتەوەو لەئەنجامدا ئەو پەڵانە یەکدەگرنەوەو لە شێوەی پەردەیەکی تەنکدا دەردەکەوێت و دوای ئەوە بەهۆی جوڵانی زمانەوە پەردەکە لادەچێت و شوێنێکی برینداوی رەنگ سوری خوێناوی " Ulecrative stomatitis" بەجێدەهێڵێت، لەئەنجامی ئەمەشدا ئاژەڵێ تووشبوو لیکێکی زۆر دەکات کە پەڵەی خوێناوی پێوەیە، ئەم نیشانەیە بە نیشانەیەکی جیاکەرەوەی نەخۆشی دەردەگا دادەنرێت و بەکاردەهێنرێت بۆ جیاکردنەوەی نەخۆشی یەکە لەگەڵ نەخۆشی یەکانی دیکە.

- ئاژەڵی تووشبوو تووشی سکچوونێکی توندە دەبێت و هەندێك جار بەشێوەیەکی شل و خوێناوی دەبێت.

- ئاژەڵی ئاوس لەئەنجامی تووشبوون بەم نەخۆشیە بەراوێتە دەبێت.

- دوای چەند رۆژێك لە سکچوونەکە پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵە نەخۆشەکە دێتە خوارەوەو هەندێك نیشانەی دیکەی وەکو تەنگە نەفسی و کۆکەی لەسەر دەردەکەوێت و

ئاژەڵەکە بێ هێزو لەڕو لاواز دەبێت و ووشك دەبێتەوەو ئازارێکی زۆری لێ پەیدا دەبێت ئەنارچەی سك داو لەئەنجامدا ئاژەڵەکە دەکەوێتە سەر زەوی و پلەی گەرمی لەشی زیاتر نزم دەبێتەوەو لەئەنجامدا مردار دەبێتەوە.

- بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری هەندێك جار شێوەیەکی دیکەی نەخۆشی یەکە کە پێی دەوترێت ژێر توند"Subacute" کە کاریگەریەکی ئەوتۆی نیە لەسەر ئاژەڵی تووشبوو.

شێوەیەکی دیکەی نەخۆشی دەردەگا هەیە کە پێی دەوترێت شێوەی پێست " Skin Form" کە بەوە دەناسرێتەوە کە هەندێك گرێ لە ناوچەی سەرشان و مل و ناو ماسولکەی ڕان و ناو تورەکەی گوون "Scrotum" دەردەکەوێت و دوای ماوەیەك لە خۆوە چاك دەبێتەوە، بەڵام لەلایەکی دیکەوەو لەئەنجامی تێك شکاندنی ژمارەیەکی زۆر لەناخەی لیمفوسایت" Lymphocyte" دەبێتە هۆی چالاك کردنی هەندێ زیندەوەری سەرەتایی کە بە شاراوەیی لە لەشدا ماونەتەوە"Latent infections" کە بەژمارە کەمن وەکو زیندەوری سەرەتایی:

"Anaplasma Marginalae"

لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی تووشبوون بەم زیندەوەرە سەرەتاییەو شاردنەوەی نیشانەکانی نەخۆشی دەردەگا.

دەست نیشان کردن و جیاکردنەوەی لە نەخۆشی یەکانی دیکە:

دەست نیشان کردنی نەخۆشی دەردە گا پەیوەندیی هەیە بە مێژووی سەرهەڵدانی نەخۆشی یەکە لە ناوچەکەداو هەروەها نیشانە دیارەکانی نەخۆشی یەکەو هەروەها هەندێك نەخۆشی دەردەگا لەگەڵ ئەو نەخۆشیانەی کە نیشانەکانیان نزیکە لە یەکتری لە وانەش:

١- نەخۆشی تەبەق(FMD):

نیشانەکانی زیاتر لەدەم و قاچدایە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە گۆڤاری زانستی سەردەم

ژماره(۹).

٢- تاعونی کاوێژکەرە بچووکەکان (PPR):

زیاتر ئەم نەخۆشی یە تووشی مەڕو بزن دەبێت لە نیشانە دیارەکانی بۆشیایی دەمیان تووشی هەوکردنێك دەبن کە پێی دەوترێت"Necrotic Stomatitis" کە بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێ دێتو کەفێکی زۆر دەکات.

٣- نەخۆشی کلاوە ڕەش (CBPP):

نەخۆشی یەکە تووشی کۆئەندامی هەناسەدان بەتایبەتی سی یەکان دەبێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە گۆڤاری زانستی سەردەم ژمارە(٢٣).

**چارەسەر کردن و کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی یەکە :**

نەخۆشی دەردە گا بەپێی توێژینەوەکانی پزیشکانی ڤێتێرنەری هیچ چارەسەرێکی تایبەتی نی یە، بەڵکو پێویستە چەند ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ خۆپاراستن و بەرگرتن لە بڵاوبوونەوەو تەشەنکردنی نەخۆشییەکە.

هەرچەندە بەپێ ی دۆکیۆمێنتەکانی ڕێکخراوی (FAO)و بەڕێوەبەرایەتی یەکانی ڤێتێنەری کوردستان نەخۆشی دەردەگا لەم دە ساڵەی دواییدا لە ناوچەکانی کوردستان و لە وڵاتانی دراوسێدا تۆمار نەکراوە، بەلام پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت.

یەکەم: لە سنورەکاندا جمو جۆڵی ئاژەڵەکان سنوردار بکرێت و پێویستە بنکەی ڤێتێرنەری سەر سنورەکان هەستن بەپشکینی هەموو جۆرە ئاژەڵێك کە دێنە ناو خاکی کوردستانەوە.

دووەم: لە م وڵاتانەی کە بەم نزیکانە نەخۆشی یەکەی تیدا تۆمار کراوە پێویستە بەهیچ شێوەیەك بەربوومی ئاژەڵیان لێ نەهێنرێتە کوردستانەوە.

سێیەم: پێویستە بەڕێوەبەرایەتی پزیشکی ڤێتێرنەری لە شارەکانی کوردستان ساڵانە

بەدواداچوونی، هەبێت بە وەرگرتنی نمونـەی خـوێن لـە ئاژەڵـەکان بەتایبـەتی گونـدەکانی نزیك سنورەکان بە مەبەستی دیاریکردنی ئاستی بەرگری لەشی ئاژەڵەکان.

چوارەم: کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی نەخۆشی دەردەگا لەلایـەن بەڕێوەبەرایـەتی یەکانی ڤێتێرنەری لە کوردستان سەبارە بە ئاستی بوونی نەخۆشییەکە لە وڵاتانی جیهـان بەگشتیو وڵاتانی دراوسێ بەتایبەتی.

پێنجەم: بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری خاوەن ئاژەڵەکان لەگوندو شارەکاندا بەوەی بازرگانی نەکەن بە ئاژەڵی نەخۆشەوەو بەرژەوەندی گشتی ڕەچاو بکەن،

**سەرچاوەکان:**


- Rinder Pest, Contingency plan for Erbil, Duhok and Sulaimaniyah governorate. Field document ; FAO 1999.

2- Radostits , O, M, Gay, CC, Blood, D.C. and Hinchliff, K, W, 2000, Veterinary Medicine 9th edi.

# نەخۆشی کلاو ڕەش

## Contagious Caprine Pleuro Peneumania CCPP

کوردستان خاوەنی سروشتێکی شاخاوی یەو بە وڵاتی بەفرو چیا ناسراوەو خەڵکی کوردستانیش هەر لەدێر زەمانەوە خۆیان گونجاندووە لەگەڵ ئەم سروشتە شاخاویە، لەهەمان کاتیشدا ئاژەڵی ئەم وڵاتەش بەهەمان شێوە خۆیان گونجاندووە لەگەڵ ئەم سروشتە شاخاویەی کوردستان.

بزن یەکێك لەو گیانلەبەرانەی کە زیاتر لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان بەخێو دەکرێت لەلایەن گوندنشینەکانەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی بزن توانایەکی باشی هەیە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ سروشتە سەختەکەی کوردستانو لەبەر ئەوە بە ئاژەڵێکی شاخاوی ناسراوە، گەلێك نەخۆشی هەیە کە تووشی ئەم ئاژەڵە شاخاوییە دەبێتو یەکێك لەو نەخۆشییانە کە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری بایەخی پێ دەدات،نەخۆشی "کلاوڕەش)ە کەبەدوژمنێکی سەرەکی ئەم ئاژەڵە دادەنرێتو ساڵانە زەرەرێکی گەورەی پێ دەگەیەنێت.

### نەخۆشی کلاو ڕەش:

یەکێك لەو نەخۆشی یە کوشندانەی کە بەشێوەیەکی سەرەکی تووشی بزن دەبێتو لە کوردەواریدا پێی دەوترێت (کلاو ڕەش)و لە سەرچاوەکاندا پێی دەوترێت:

((contagious Caprine Pleuro Pneumonia ))(CCPP)

– ئەم نەخۆشی یە زیاتر لە (٢٣) وڵات لە جیهاندا تۆمار کراوەو زیاتر لە وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقیادا هەیە، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کە دراوسێ عێراقن لەوانە تورکیاو ئێرانو سعودیەو ئوردن.

نەخۆشی کلاو ڕەش زیانێکی گەورە بە سامانی ئاژەڵ دەگەیەنێت لەبەر ئەوەی ڕادەی تووشبوون دەگات (١٠٠٪)و ڕادەی لەناوچوون دەگاتە(٥٠٪)و هەروەها یەکێکە لە

نەخۆشییە ترسناکەکان چونکە ئەو ئاژەڵانەی کە هەڵگری هۆکاری نەخۆشییەکە بە سەرچاوەیەکی سەرەکی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کڵاو ڕەش دادەنرێت لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە یان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەو بێ گومان بەپێ ی سەرچاوەکانی بەڕێوەبەرایەتی سامانو دروستی ئاژەڵ نەخۆشی یەکە لەکوردستانیشدا تۆمار کراوەو زیانی گەورە بە بزنی ئەم وڵاتە دەگەیەنێت.

**- هۆکاری نەخۆشییەکە:**

هۆکار نەخۆشی کڵاو ڕەش دەگەڕێتەوە بۆ زیندەورێکی وردبین کە پێی دەوترێت: مایکۆپلازما (Mycoplasma) کە زیاتر لە حەفتا جۆری هەیەو لە ئاژەڵو مرۆڤیشدا نەخۆشی دروست دەکات، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٨٩١ لەلایەن زانا(E.nocard) مایکۆپلازما دۆزرایەوە بەتایبەتی لەو مانگا لاوازو بێ هێزانەی کە تووشی نەخۆشی(Contagious Bovie Pleuro Pneumonia) (CBPP)بوون.

- مایکۆپلازما بەشێوەیەکی گشتی چەند خەسڵەتێکی هیەە:

یەکەم: بۆ یەکەم جار بە زیندەوەری مایکۆپلازما دەوترا (Pleuro Pneumonia like Organism) (PPlo) واتە ئەو زیندەوەرەی دەبێتە هۆی نەخۆشی هەوکردنی سییەکانو پلورا لەبۆشایی سنگدا.

دووەم: مایکۆپلازما بەچەند شێوەیەك دەردەکەوێت واتە یەك شێوەی جێگیری نی یە لەوانەیەش: شێوەی خڕی هەیەو درێژکۆڵەو....هتد کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مایکۆپلاما بەشێوەیەکی گشتی توانای گۆڕینی شێوەی خۆی هەیە کە ئەمەش بەهۆی بوونی جۆرێکی تایبەت لە پرۆتینە لە پێکهاتەیدا.

سێ یەم: پەردەی مایکۆپلازما لە سێ توێژ پێکهاتووە.

(Trilaminar)و نەبوونی ماددەی گرنگ پێپتایدۆ گلایکان (Peptidogly Can) لە پێکهاتەی دیواری خانەی مایکۆپلازمادا، لەگەڵ ئەوەی ئەم مادەیە بە پێکهاتەیەکی سەرەکیو بنەڕەتی دیواری خانەی زیندەوەرەکان دادەنرێت، هەر لەبەر ئەمەش دژە

ژیانەکانی کۆمەڵەی ((B- lactaman tibiotics)) وەکو پەنسلین‌و سیفالۆسپۆرین هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر زیندەوەری مایکۆپلازما نی یەو بە مەبەستی چارەسەر ،ەکارناهێنرێن بۆ ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی مایکۆپلازماوە دروست دەبێت.

**- جۆرەکانی مایکۆپلازما :**

١- Mycoplasma Agalctia دەبێتە هۆی نەخۆشی Contagious agalactia لەمەڕو بزندا.

٢- My coplasma my codies subsp. Capri دەبێتە هۆی نەخۆشی کلاو ڕەش لەبزندا.

٣- Mycoplasma my coidessubsp دەبێتە هۆی نەخۆشی کلاو ڕەش لە مانگا.

٤- Mycoplasma hyopneumoniae دەبێتە هۆی هەوکردنی سی یەکان لە بەرزادا.

٥- Mycoplasma galliseptieum دەبێتە هۆی نەخۆشی هەوکردنی تورەکە هەواییەکان Airsacculitisلە پەلەوەردا.

٦- Mycoplasma Penumonae دەبێتە هۆی هەوکردنی سی یەکان لە مرۆڤدا.

**لە نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکە :**

نەخۆشی کلاوڕەش بەوە دەست پێدەکات کە پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵی تووشبوو بەرز دەبێتە (٤٠- ٤١) پ.س.

- ئاژەڵی نەخۆشی دەکۆکێت‌و تەنگە نەفەسی پیوە دیارە.

- هەندێك جار ئاژەڵی تووشبوو بە لایەکدا دەکەوێت‌و بۆ ماوەیەك دوای ئەوە هەڵدەستێتەوەو دەست دەکاتەوە بەڕۆیشتن.

- زۆر جار ئاژەڵی تووشبوو بەدەم هەناسە دەدات‌و زمانی دەردەکەوێت‌و دەمی کەف دەکات‌و لە کۆتایی دا مردار دەبێتەوە.

- لەنیشانە گرنگەکانی دوای مرداربوونەوەی ئاژەڵی تووشبوو:

نیشانەکانی دوای مرداربوونەوەی ئاژەڵەکە ( Cross Lesions) زۆر گرنگە بەلای پزیشکانی ڤێتێرنەرییەوە چونکە لە ڕێگایانەوە دەگەنە دیاری کردنێکی تەواوی نەخۆشی یەکە ( Diagnositc) نیشانەکانی زیاتر لە بۆشایی سینگیدا دەردەکەون بەتایبەتی لەسەر سی یەکانداو هەمیشە نیشانەکانی لایەکی سنگ دەگرێتەوە (Unilatral).

– لە بۆشایی پلورا (Pleural Cavity) برێکی زۆر شلەی تێدایە کە ماددەی فبرینی تێدایەو لەئەنجامدا ئەم ماددەی فبرینە لەسەر ڕووی سی تووشبوو دەنیشێت.

– سی تووشبوو ڕەق دەبێت (Consolidation)و شێوەکەی لەجگەر دەچێت (Hepatization).

– توێژی پلۆرا هەو دەکات ( Pleuitis).

– سی تووشبوو لە ئەنجامدا ڕەنگەکەی ڕەش هەڵدەگەڕێتو هەر لەبەر ئەمەش لەناو خاوەن ئاژەڵەکداندا پێی دەوترێت نەخۆشی کڵاو ڕەش.

– سی تووشبوو لەڕێگەی پلورای هەوکردووەوە بە دیواری ناوەوەی پەراسووەکانەوە دەنووسێت (Adhesion) کە ئەمەش بێگومان بە نیشانەیەکی جیاکەرەوەی نەخۆشی یەکە دادەنرێت.

– زۆربەی گرێ لیمفاویەکان گەورە دەبنو دەئاوسێن.

– دیاری کردنی نەخۆشی یەکە: دەبێت بەهۆی:

١– مێژووی نەخۆشیی یەکە (case history).

٢– نیشانە دیارەکان لەپێش و دوای مرداربوونەوە.

٣– لە ڕێگەی تاقیگەوە بۆ دەستنیشان کردنی هۆکاری نەخۆشییەکی.

**چارەسەرکردن:**

لە قۆناغە سەرەتاییەکانی نەخۆشیی یەکە بەکارهێنانی دژە ژیانی تایلۆسین ( Tylosin) سودی هەیە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی مردارەوە بوون لەنێو ئاژەڵی تووشبوودا.

## سەرچاوەکان:

1- Radostits, O.M, Gay. C.C, Blood, D.C. and Hincheliff, K, W, 2000. Veterinry Medicine qth edition.
2- Timoney, J.F, Gillespie, J.H, Scott, F.W and Barlough, J. E. 1992 Hagan and Bruner's Microbiology and infectious disease of Domastic Animal's 8th edition

٣- الامراض المعدية ١٩٨٣.

- د. سعدی احمد غناوی.

- د. عبدالاحد توما.

- د. احمد محمد خلف.

# نەخۆشی سەرەڕەشە

## Black head disease or Histomoniasis

باڵندە بەشێوەیەکی گشتی بە سەرچاوەیەکی گرنگی خۆراکی مرۆڤ دادەنرێت چونکە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی گۆشتی سپی یەو بڕێکی زۆر باش پرۆتینی تێدایە.

قەل و مریشك و قازو مراوی لەو باڵندانەن کە لەدێر زەمانەوە لە کۆمەڵگای کوردەواری ماڵی کراون و هەروەك سەرچاوەی ئابووریش سودیان لێوەرگیراوەو هەتاکو ئەم سەردەمەش خەڵك لە کوردستان بەتایبەتی گوندنیشینەکان بە بەخێوکردنیانەوە خەریکن. قەل هەروەك باڵندەیەکی ماڵی زۆر بایەخی پێدەدرێت و بەخێو دەکرێت لەبەر ئەوەی خەڵکێکی زۆر ئارەزووی خواردنی گۆشتەکەی دەکەن و لە بازاڕدا نرخەکەی لە گۆشتی باڵندەکانی دی زیاترە.

گەلێك لەدەردو نەخۆشی هەیە کە تووشی قەل دەبێت و لەئەنجامدا لاوازی دەکات و زیانی پێدەگەیەنێت و بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی بڕی پرۆتینی پێویست و لەئەنجامدا مرۆڤیش زەرەرمەند دەبێت.

لەو نەخۆشییە ترسناکانەی کە تووشی قەل دەبێت و ساڵانە بە بەردەوامی پێوەی دەناڵێنێت بێگومان نەخۆشی سەرە رەشەیە کە دەبێتە هۆی لەناوچونی ژمارەیەکی زۆرو زیانگەیاندن بە ئابوری وڵات و هەروەها دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە.

لەبەر ئەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەم نەخۆشییە بە کارێکی پێویست دادەنرێت.

قەل لە هەندێك ناوچەدا پیێ ی دەوترێت قەلەمون یان عەلەشیش و لە وڵاتانی عەرەبی دا پیێ ی دەوترێت (دیك الرومی) دیك الحبش.

قەل یەکێکە لەو جۆرە گرنگانەی پەلەوەڕ کە قەبارەکەی لە جۆرەکانی دیکەی پەلەوەر گەورەترە لەبەر ئەوە بەکاردەهێنرێت. بۆیە بەرهەمهێنانی گۆشتو گۆشتەکەی نرخەکەی بەرزترە لە گۆشتی جۆرەکانی دیکەو بەڕێوەبردن و بەخێوکردنی کارێکی

ئاسانترە بە بەراورد لەگەڵ بەخێوكردنی پرۆژەكانی مریشكدا.

بۆ یەكەم جار لەساڵی ١٥٣٠ قەل هەروەك باڵندەیەكی ماڵی لە ئەوروپا دەركەوت‌و لەدوایشدا گوێزراوەتەوە بۆ ئاسیا. قەل هەروەك باڵندەیەك چەند خەسڵەتێكی تایبەتی هەیە كەوای كردووە بایەخی زیاتر پێ بدرێت، لەوانەش:

یەكەم: قەل سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندی گۆشتە بە بەراودر لەگەڵ جۆرەكانی دیكەی پەلەوەر.

دووەم: گۆشتی قەل بڕێكی كەم لە چەوری‌و كۆلسترۆڵی تێدایە، واتە لە جۆرەكانی دیكە گونجاوترە بۆ خواردن.

سێ یەم: گۆشتی قەل بڕێكی باش لەپرۆتین‌و ڤیتامینی تێدایە.

چوارەم: لەزۆر شوێندا دەتوانرێت بەخێو بكرێت چونكە قەل لەو باڵندانەیە كە زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ژینگەدا.

پێنجەم: لە زۆر وڵاتانی جیهان لەبۆنەو ئاهەنگەكاندا داواكاری زیاتر دەبێت لەلایەن خەڵكەوە.

هەرچەندە لە وڵاتی ئێمە بەخێوكردنی قەل شێوەیەكی فراوانی وەرنەگرتووە، بەڵام هیواداریـن لەدوارۆژدا بیر بكرێتە لە پرۆەی بەخێوكردنی قەل بە شێوەیەكی گەورەو فراوان.

بەپێ ی سەرچاوەیەكی پزیشكی ڤێتێرنەری قەل بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن دەكرێت. .

Class: aves
Subclass: cairnalae
Order: Galliformes
Suborder: Galli
Family : Phasiandidae.
Subfamily : meleagris.
Species : Meleagris gallopavo.

نەخۆشـی سەر،ڕەشــە: لــە زۆربــەی سەرچـاوەکان بــە نەخۆشــی یەکــە دەوترێــت : (Hitomoniasis) یان (infectious enterohepatitis)، هەروەها لە بەر ئـەوەی سـەری باڵنـدەی تووشـبوو هەڵدەگرێت پـێ ی دەوترێـت (Black head disease)، هـەر لەبـەر ئەمەش لە کوردەواریدا پێی دەوترێت (سەرە ڕەشە).

بۆ یەکەم جار سـەرە ڕەشـە لـە سـاڵی (١٨٩٥)ز دۆزراویـەوە هـەروەها هۆکارەکەشـی دەست نیشان کرا کە زیندەوەرێکی سەرەتایی (Proto Zoa).

نەخۆشی سەرەڕەشە بەشێوەیەکی گشتی تووشـی باڵنـدە دەبێت بەتایبـەتی تووشـی قەل‌و مریشك دەبێت بەلام زیاتر قەل هەستیار ترە بە نەخۆشی یەکە.

– کرمی زەوی (earth worm) و هەروەها ڕێکخۆڵە کوێرە ڕۆڵێکـی گرنگیـان هەیـە لـە گواستنەوەی زیندەوەری سەرەتایی کە بۆ لەشی باڵندەکە چونکە هۆکـاری نەخۆشـیەکە قۆناغێکی لە قۆناغەکانی سوری ژیانی لە لەشی کرمەکاندا بەسەر دەبات.

## هۆکارەکانی نەخۆشییەکە:

هۆکـاری سـەرەکی نەخۆشــی سەرەڕەشــە دەگەڕێتــەوە بـۆ زینـدەورێکی سـەرەتای (Protozoa) کـە پــێ ی دەوترێــت: Histomonas Meleagridis سـوڕی ژیـانی ئـەم زینـدەوەرە سـەرەتاییە پەیوەنـدیی بـەبوونی دوو جـۆر کرمـەوە هەیـە کـە لـە ژینگـەی پەلەوەردا هەیە بە بەردەوامی ئەویش بریتین لە کرمەکانی زەوی‌و کرمی ڕیخۆڵە کوێرە لە جـۆری (Heterakis gallinarum) واتــە قۆناغێــك لــە قۆناغــەکانی ســوڕی ژیــانی زیندەوەرەکە لە لەشی ئەو کرمانەدا بەسەر دەبات، لەبەر ئەوە بونیـان زۆر پێویـستە بـۆ تەواو کردنی قۆناغەکانی سوڕی ژیانی زیندەوەرەکە.

هۆکاری نەخۆشی یەکە تووشی زۆر جۆرە باڵندە دەبێت‌و قـەل بەشـێوەیەکی تایبـەتی زۆر هەستیارە بۆ زیندەوەرکەوە دەبێتە هۆی لەناوچوونی خانەخۆی کە زیاتر لە تەمـەنی (٣- ١٢)هەفتە تووش دەبێت.

کرمەکانی ڕیخۆڵە کوێرە زیندەوەرە سەرەتایی کـە دەگوێزنـەوە لـە باڵندەیەکـەوە بـۆ

باڵنددەیـەکی دیکـەو بـەپێی سەرچـاوەکانی پزیـشکی ڤێتێرنـەری هەنـدێك لـە مێـروو جومگـەدارەکانی وەکـو مـێش‌و مێـشوولە ڕۆڵیـان هەیـە لەگواسـتنەوەی هۆکـاری نەخۆشییەکە.

هۆکاری نەخۆشیی سەرەڕەشە دوای چونە ژوورەوەی بۆ ناو لەشی باڵندەکە دەچێتە ڕیخۆڵە کوێرەوە ((CeCum). چونکە زیاتر ئارەزووی ژیان دەکات لـە ڕیخۆڵـە کـوێرەو لەوێدا لەخانەکانی ڕیخۆڵە کوێرە دابەش دەبێت‌و ژمارەیان بەرە بـەرە زیـاد دەکـات‌و لـە ئـەنجام دا دەچـێتە سـوڕی خوێنـەوە لەڕێگـەی خوێنـەوە دەگاتـە جگـەرو لـە جگـەدا دەمێنێتەوە.

## نیشانە دیارەکانی نەخۆش یەکە:

نیـشانەکان بـە شـێوەیەکی دیـار زیـاتر لـە سـەر قـەڵی تووشـبوو دەردەکـەوێت وەك باڵندەیەکی دیکە، ئەویش لەبەر ئەوەی قەل لە گشت جۆرەکـانی دیکـە هەسـتیارترە بـۆ نەخۆشـــییەکەوە نیـــشانەکانی دوای (٧- ١٢) ڕۆژ لـــەدوای تووشـــبوونی باڵندەکـــە دەردەکەویێ‌و لە نیشانە دیارەکانی نەخۆشییەکە:

- باڵنـدەی تووشـبوو تووشـی سـکچوون دەبێـت‌و ڕەنگەکـەی شـلەیەکی زەردبـاوی کەفاویە کە بێگومان ئەمەش بە نیشانەیەکی گرنگی نەخۆشی یەکە دادەنرێت.

باڵندەکـە بێهێـزو خـەوالو دەبێـت‌و تووشـی باڵـە شـۆڕی دەبێـت، چـاوی باڵندەکـە دەنوقێت‌و سەری شۆڕ دەکاتەوە بۆ خـوارەوە بـەرە بـەرە لـەخواردن دەکـەوێت، سـەری باڵندەی توشبوو بەرە بەرە ڕەش هەڵدەگەڕێت (cyanotic) کە ناوی نەخۆشیەکەش هەر لەم نیشانەیەوە وەرگیراوە.

هەندێك جار ڕادەی لەناوچون Mortality rate لەقەلدا دەگاتە ١٠٠٪.

مریـشك توشـی نەخۆشـیەکە کـەمتر نیـشانەکانی لەسـەر دەردەکـەوێت.و لـە نیـشانە دیارەکانی دوای مردار بوونەوەی باڵندەی تووشبوو کە زیـاتر نیـشانەکان لەسـەر ڕیخۆڵـە کوێرەو جگەردا دەردەکەوێت کە بەم شێوەیە:

دیواری ڕیخۆڵە کوێرە ئەستورە دەبێتو سوردەبێتەوە. ڕیخۆڵە کوێرە فراوان دەبێت پڕ دەبێت لە شلەی دەردراوی هەروەها دروست بوونی برین لە دیواری ڕێخۆڵە کوێرەو هەندێك جار دەبێتە هۆی کون بوونی دیوارەکە.

لە جگەردا برینی شێوە خڕ خڕ دروست دەبێت کە تیرەکەی نزیکەی ١سمو قەبارەی جگەر گەورە دەبێتو ڕەنگەکەی سەوزباو دەبێت.

## چارەسەرو کۆنترۆڵ:

باشترین ڕێگە چارە بۆ کۆنترۆل کردنی نەخۆشییەکە یاخود کەمکردنەوەی ڕوودانی نەخۆشییەکە ئەویش دژایەتی کردنو نەهێشتنی هۆکارە گوێزەرەوەکانی وەکوکرمی زەوی‌و کرمەکانی ڕێخۆڵە کوێرە.

وە دەرمانەکانی بەکار دەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکە ئەمانە:

١- Nitro furan

٢- Nitroimidazcle

٣- Fura zolidone

تێبینی / بۆ یەکەم جار لە شاری سلێمانی لەلایەن بەڕێز دکتۆر ئیسماعیل ئەمین/ پسپۆڕی نەخۆشییەکانی پەلەرەوەرە نەخۆشی سەرەڕەشە تەشخیص کراوە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا.

### سەرچاوە:

١- Calnek, B. W. Dosease Poultry, 10th edition1997

٢- تربية الدواجن،(الجزء الثاني) ١٩٩٥- ١٩٩٧٦. الدكتور غسان غادرى، الدكتورى محمد الحلبى.

٣- د. اسماعيل امين/ پزیشکی ڤێتێرنەری شارەزا.

# له كێلگه‌كانی به‌خێوكردنی په‌له‌وه‌ره‌وه‌

## هه‌ڵه‌ی به‌خێوكه‌ر

– په‌یڕه‌وكردن‌و پراكتیزه‌كردنی بڕیاری ژماره (٩٨٦)ی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان كه ناسراوه به (نه‌وت به‌رامبه‌ر به خۆراك)و هه‌روه‌ها داڕشتنی به‌رنامه‌یه‌كی گونجاوو له‌بار له‌لایه‌ن وه‌زاره‌تی كشتوكاڵ‌و ئاودێر/ حكومه‌تی هه‌رێمی كوردستان بووه هۆی بوژاندنه‌وه‌و گه‌شه‌سه‌ندنێكی به‌رچاوی سامانی ئاژه‌ڵ به‌گشتی‌و پیشه‌سازی په‌له‌وه‌ر به‌تایبه‌تی كه به شێوه‌یه‌ك ڕۆژ له‌دوای ڕۆژ ژماره‌ی كێڵگه‌كانی به‌خێو كردنی په‌له‌وه‌ر(گۆشت‌و هێلكه) ڕوو له زیاد بوونه‌وه به‌مه‌ش به سه‌رچاوه‌یه‌كی پرۆتینی گرنگ داده‌نرێت‌و له‌ئه‌نجامدا مرۆڤ سوودی لێ وه‌رده‌گرێت.

به‌ڵام ئه‌م زیاد بوونه‌وه‌ی ژماره‌ی كێڵگه‌كان بێ كێشه‌و ته‌نگوچه‌ڵه‌مه نین‌و به‌هام شێوه له‌گه‌ڵ زیاد بوونی ژماره‌ی كێلگه‌كان كێشه‌و ته‌نگو چه‌ڵه‌مه یان ڕوو له‌زیاد بوونه، ئه‌مه ته‌نگوچه‌ڵه‌مانه‌ش چه‌ند شێوه‌یه‌كی جیاواز جیاواز وه‌رده‌گرێت‌و له‌ئه‌نجامدا ده‌بێته هۆی به‌ربه‌رستێك له‌به‌رده‌م پێشكه‌وتنی پیشه‌سازی په‌له‌وه‌ردا.

**له‌و كێشه‌و ته‌نگو چه‌ڵه‌مانه‌ش:**

*ڕێگه خۆشكردن بۆ بلاوبوونه‌وه‌ی نه‌خۆشی یه ترسناكه‌كانی په‌له‌وه‌رو گواستنه‌وه‌ی بۆ كێلگه‌كانی تر.

*كێشه‌ی ئابوری.

*كێشه‌ی به‌ڕێوه‌بردن.

زۆربه‌ی ئه‌م كێشانه ڕووده‌دات له ئه‌نجامی هه‌ڵه‌ی به‌خێوكه‌ره‌وه( خاوه‌ن كێلگه‌وه)، واته هه‌موو كه‌م‌و كورتی‌و ته‌نگ‌و چه‌ڵه‌مه‌یه‌ك له‌ئه‌نجامی كه‌مته‌رخه‌می خاوه‌ن كێڵگه‌و په‌یدا ده‌بێت‌و له‌ئه‌نجاما ده‌بێته هۆی ڕوودانی كاره‌ساتی گه‌وره‌ترو زه‌ره‌رو زیانێكی گه‌وره‌تر، وه به‌پێ ی ئه‌و شاره‌زاییی یه‌ی له‌م چه‌ند خاڵه‌ی خواره‌وه‌دا ڕون بكه‌مه‌وه‌و

بەهیوام کە لە خزمەتی گشتی دابێت.

یەکەم: پەیڕەو نەکردنی ئامۆژگاریەکانی پزیشکی سەرپەرشتیار لەلایەن خاوەن کێڵگەکانەوە، واتە حاوەن کێڵگەکان زۆر جار بەپێ ی ئەو شارەزایی سادەو ساکارەی کە هەیانە کاردەکەن‌و جاری واش هەیە تا کۆتایی ماوەی بەخێو کردنی مریشکەکە سەردانی پزیشکی سەرپەرشیتار ناکەن‌و لەئەنجامدا سەرکەوتوو نابن زەرەر لەخۆیان‌و وڵاتەکەیان دەگەیەنن. چونکە خاوەن کێڵگەکان پێویستە بە بەردەوامی سەردانی پزیشکی سەرپەرشیتار بکەن‌و ئامۆژگاریان لێ وەربگرن‌و بەبێ پرسی پزیشك هیچ دەرمانێك‌و ئاکسنێك بەکارنەهێنن.

دووەم: گۆڕینی کرێکاری کێڵگەکان بەشێوەیەکی بەردەوام لەکاتی بەخێوکردنی وەجبەیەکدا، کە ئەمەش بێ گومان زیان بە خاوەن کێڵگەکان دەگەیێنێت، چونکە فێرکردنی هەموو کەسێك ماوەیەکی درێژی دەوێت‌و ئیش کردن لەهۆڵەکانی بەخێوکردنی پەلەوەڕدا کارێکی ئاسان نیەو پێویستە ئەو کرێکارانەی کە لە هۆڵەکاندا کار دەکەن کرێکاری شارەزا بن لە سروشتی کارەکە.

سێ یەم: ناکۆکی لەنێوان خاوەنەکانی کێڵگەکە(لە کاتێکدا ئەگەر دوو شەریك بن یان زیاتر) واتە ئەم دوو شەریکە بێ هیچ ڕێکەوتنێك کار بکەن‌و کەسیان گوێ لەوی تریان نەگرێت‌و بێگومان ئەمەش پرۆژەکە دوا دەخات‌و پێش ناکەوێت هەردوو لا زەرەرو زیانێکی گەورە دەکەن.

چوارەم: دابەشنەکردنی کارە جۆربەجۆرەکانی کێڵگەکانی بەخێو کردنی پەلەوەڕ بەسەر چەند کەسیچکدا، واتە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی کارە جۆرەبەجۆرەکانی کێڵگە لە سەرپەرشتی کردنی هۆڵەکەو پەیداکردنی دەرماون ئالفو سەردانی بازاڕو زیان ئەگەیەنێتە پرۆژەکە چونکە پرۆژەی بەخێوکردنی پەلەوەر خۆی لەخۆیدا بەکۆمەڵێك کەس دەڕواتە ڕێوە.

پێنجەم: ئامادەنەکردنی ئالف پێش هێنانی جووجکە بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و بەپێ ی خشتەی پزیشکی سەرپەرشیتار، واتە لە ڕۆژی هێنانی جووجکەدا بەپەلەو بەبێ هیچ

بەرنامەیەکی زانستی ئالف ئامادە دەکەن و دابەشی دەکەن بەسەر جووجکەدا، بۆ نموونە هۆڵێك (١٠٠٠٠) دە هەزار جووجکەی تێدایەو ئالفی بەشێوەی (٢٠٠کغم) یان (٤٠٠کغم) بۆ دەکرێتەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆربەی کات ئالفیان لەبەردەم نەبێت و جووجکەکان برسیان بێت و لەئەنجامدا لەڕو لاوازوکێشیان کەم دەکات.

شەشەم: گوێ نەدانە ڕادەی شێ لەهۆڵەکاندا بەتایبەتی لەوەرزەکانی پایزو زستان و بەهاردا، ئەویش بەچاك نەکردنی بەلوعەو مناهلەکان کەئەمەش دەبێتە ڕێگەخۆشکەرێك بۆ بڵاوبوونەوەو تەشەنە کردنی نەخۆشی یە ترسناکەکان.

حەوتەم: ئامادە نەکردنی جلو بەرگی تایبەت بۆ کرێکارەکان و خاوە کێڵگەکان بە باشترین ڕێگا دەژمێردرێت بۆ تەشەنەکردنی نەخۆشی یەکان لەکێڵگەیەکەوە بۆ کێڵگەیەکی تر یان لە بازارشوە(شوێنی مریشك فرۆشتن) وە بۆ کێڵگەکان.

هەشتەم: قەلاچۆنەکردنی باڵندەی کێوی و مشك و جرج دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یەکانی پەلەوەر.

نۆیەم: ئامادە نەکردنی ژمارەی گونجاوو تەواو لە مناهل و معالف لە هۆڵەکاندا. دەبێتە هۆی قەرەباڵغی و شەڕ کردن لەسەر ئالف و ئاو لە ئەنجامدا کێشیان کەم دەکات.

دەیەم: بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی کە دووکەڵ بەرهەم دێنن وەکو بەکارهێنانی پەرەمێز بۆ گەرم کردنەوەی هۆڵەکان لەئەنجامد هۆڵەکە پڕدەبێت لە دووکەڵ و مریشکەکان دەخنکێن و مردار دەبنەوە.

– لەبەر ئەوە هەڵەی بەخێو کەر زۆر زۆرن و بەهیوام خاوەن کێڵگەکانی بەخێو کردنی پەلەوەڕ لەم خاڵانەی سەرەوە سوود وەربگرن و بەخۆیانا بچنەوە بە مەبەستی پێشکەوتن لە ئیشەکەیانداو قازانج گەیاندن بە خۆیان و بە وڵاتەکەیان.

# نەخۆشیەکانی بەرھەمهێنان

## Production disease

بەرھەمهێنان (production) یەکێکە لە مەبەستە سەرەکیەکانی بەخێو کردنی ئاژەڵو پاراستنی سامانی ئاژەڵو هەوڵدان بۆ گەشە کردنو پێشکخستنی لە گشت ڕوویەکەوە. زیادکردنی بەرھەمی ئاژەڵ لە گۆشتو شیر پێویستی بە خزمەت کردنی ئاژەڵ هەیە لەسەر بنەمایەکی زانستی بەمەبەستی ئەوەی کە گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەردا بێت لەڕووی چەندێیەتیو چۆنایەتیەوەو لەئەنجامدا پڕ کردنەوەی پێداویستی یە خۆراکییەکانی مرۆڤ.

لە ڕووی ئابووریەوە ئاژەڵ یەکەیەکی ئابووری بەرھەمهێنەرە کە مرۆڤ لە ڕووی ئابووریەوە پشتی پێدەبەستێتو هۆکارێکە بۆ ئاوەدانکردنەوە چونکە مرۆڤ بەهۆی بەخێو کردنی ئاژەڵو سوود وەرگرتن لە بەرھەمەکانی لە گۆشتو شیرو خوری گوندەکان ئاوەدان دەکاتەوەو ژیان دەبەخشێت بەو ناوچانە، هەر بەهۆی ئاژەڵەکانیانەوە لەو ناوچانەدا جێگیر دەبنو بەردەوامی دەدەن بە ژیان، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە لە ڕابردوودا دوژمنانی کورد کاریان دەکرد بۆ کوشتنو بەتاڵانبردنی مەڕو ماڵاتو ڕەشەوڵاخی گوندنیشینە کوردەکان لە لایێکاندا لە بەر ئەوەی دەیانزانی کە ئاژەڵ هۆکارێکە بۆ مانەوەی گوندنیشینەکان لە ناوچەکانیاندا.

کەواتە بەرھەمهێنان مەبەستو ستراتیژی بەخێوکردنی ئاژەڵە، بەشێوەیەکی هاوچەرخ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پرۆسەی بەرھەمهێنان ڕووبەڕووی کێشەو تەنگو چەڵەمە دەبێتەوە لەوانەش نەخۆشییەکانی بەرھەمهێنانە (Disease Production) واتە زیادبوونی بەرھەمی ئاژەڵ لە گۆشتو شیرو خوریو هەروەها زیادبوونی لە ڕووی ژمارەوە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی پێکهاتە بنەڕەتییەکانی لە لەشی ئاژەل لە جۆرەکانی خوێو ڤیتامیەکانو پرۆتینو کاربۆهیدەرێتو چەوریو ئاو کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی تێکچوونی

باری فسیۆلۆژی لەشی ئاژەڵەکەو ڕوودانی نەخۆشییەکانی بەرهەم وەکو دیاردەی کەمبوونەوەی کالیسۆمو کەمبوونەوەی مەگنسۆمو کەمبوونەوەی پرۆتینو کەمبوونەوەی شەکری گلوگۆزو ..هتد.

لەبەر ئەوە گرنگیدان بە پێکهاتەی ئالفی ئاژەڵ بەکارێکی پێویستە دادەنرێت وا باشترە کە ئالفی ئاژەڵ پێکهاتبێت لە گشت پێکهاتە بنەڕەتییە خۆراکییەکان بەڕێژەیەکی گونجاو لە پرۆتینو کاربۆهیدرەیتو خوێیەکانو ڤیتامینەکانو چەوریو ئاو بە مەبەستی ئەوەی لەکاتی بەرهەمهێناندا کار نەکاتە سەر باری فیسیۆلۆژی ئاژەڵی بەرهەمهێنەر. لەبەر ئەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو نەخۆشییانە پەیوەندیی بە بەرهەمهێنانەوە هەیە بەکارێکی پڕ بایەخ دەزانرێت بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی لە کوردستاندا بە بەخێو کردنی ئاژەڵەوە خەریکنو لە ڕێگای ئاژەڵەکانیانەوە گوندەکانیان ئاوەدان دەکەنەوە.

## دیاردەی کەمی کالیسۆم: (Hypo calcaemia)

دیاردەی کەمی کالیسۆم یەکێکەلە نەخۆشییەکانی بەرهەمهێنان کە تووشی مانگاو مەڕو بزن دەبێتو زیاتر لە کاتی زایین (parturition) دا دەردەکەوێت هەر لەبەر ئەمەش پێشی دەوترێت ( Parturient Paresis) ، یان پێی دەوترێت دیاردەی کەمی کالسیۆم لە دوای زایین Post Parturient Hypo Calcaemic syndrome " لە زۆربەی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری ناوێکی هەڵەی بەسەردا سەپاوە پێ دەڵێن تای شیر .(Milk Fever)

هۆکاری کەمی کالسیۆم بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ کەمبوونەوەی ڕێژەی کالیسۆم لەخوێندا (ڕێژەی سروشتی کالیسۆم ١٠ ملگم / ١٠٠ مل کەم دەبێتەوە بۆ ٣- ٧ ملگم / ١٠٠ مل لەخوێن) ، کە ئەمەش زیاتر تووشی مانگای پێگەیشتوو دەبێت بەتایبەتی ئەو مانگایانەی کە بەرهەمی شیریان زۆرە لەدوای زایینی ئاژەڵەکە لەماوەی شیرداندا هەر لەبەر ئەمەش ناوی لێنرا(تای شیر) چونکە نەخۆشی یەکە لە مانگای شیردا دەردەکەوێت

كه بەرهەمی شیری زۆر بێت‌و نەخۆشییەكە بەهیچ شێوەیەك نیشانەی (تای) لەسەر دەرناكەوێت لەبەر ئەوە ناوی تای شیر ناوێكی هەڵەیە لە ڕووی زانستی یەوە، چەند بۆچونێك هەیە دەربارەی ئەو هۆكارانەی كە دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی ڕێژەی كالیسۆم لەخوێندا.

یەكەم: دروستبوونی ژەك (Colostrum) لە گوانی مانگادا لەدوای زایینەوە، بەپێی سەرچاوەكان ڕێژەی كالیسۆم لە ژەكدا زۆر زیاتر بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی كالسیۆم لەخوێندا، هەندێك جار ڕێژەكە دەگاتە (١٠: ١).

دووەم: بەدرێژایی ماوەی ئاوسی سەرچاوەی خۆراكی كۆرپەلە بەندە لەسەر دایك، واتە هەر لە ڕێگەی دایكەوە بڕێكی زۆر كالسیۆم دەگوێزرێتەوە بۆ شانەكانی كۆرپەلەو لە ئەنجامدا مانگای دایك تووشی دیاردەی كەمی كاسیۆم دێت‌و هەروەها مژینی كالسیۆم لەلایەن ڕیخۆڵەوە كەم دەبێتەوە لە كاتی زایندا.

سێیەم: ناچالاكی ڕژێنی پاراسایرۆید(تەنیشت دەرەقی) (Para- thyroid gland) لە جولاندان‌و ڕێكخستنی كالسیۆم لە ئێسقانەوە بۆ خوێن‌و شانەكان لەكاتی زایین‌و شیرداندا چونكە ڕژێنی ((Para- throid gland ڕۆڵێكی سەرەكی هەیە لە ڕێكخستنی كالیسۆم لەنێوان ئێسقان‌و خوێن‌و شانەكاندا.

## لەنیشانە دیارەكانی نەخۆشییەكە:

زۆر جار نیشانە كلینیكییەكانی نەخۆشی داردەی كەمی كالسیۆم لەسەر مانگا تووشبوو لە دوای زایینی مانگاكەوە دەردەكەوێت بە نزیكەی ١٢ كاتژمێر بۆ ٣ ڕۆژ،و هەندێك جاری دیكە نیشانەكانی نەخۆشییەكە پێش ٢٤ كاتژمێر لە زایینی ئاژەڵەكەوە دەردەكەوێت,و هەندێك جاری دیكەش لە كاتی ڕوودانی زایینی ئاژەڵەكە نیشانەكان دەردەكەون.

**بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشییەکە بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت:**

**قۆناغی یەکەم:**

نیشانەکانی ئەم قۆناغە بەوە دەست پێدەکات کە ئاژەڵی تووشبوو ناڕەحەت دەبێتو بەرە بەرە بێ هێز دەبێتو لە ڕۆیشتندا هاوسەنگی تێکدەچێتو لە ئەنجامی کرژبوونی ماسولکەکانی لەشی بەرە بەر لە خواردن دەکەوێتو ماسولکەکانی پەلی دواوە ڕەق دەبێتو ئەم نیشانانە بەخێرایی دەردەکەوێت لەماوەی (١٥– ٣٠) خولەکەدا.

**قۆناغی دووەم:**

یەکێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی ئەم قۆناغە کەوتنی ئاژەڵی تووشبووە بۆ سەر زەویو نیشانەکانیش بەم شێوەیە دەردەکەوێت:

١– کەوتنی ئاژەڵ بۆ سەر زەویو ئاژەڵەکە ناتوانێت بە پێوە بوەستێت، ئاژەڵەکە لەسەر سنگ دەکەوێتو ملی ئاژەڵەکە دەسوڕێت بەلای چەپدا، کە ئەمەش بەدیارترین نیشانە دادەنرێت.

٢– ئاژەڵی تووشبوو کەم تەرخەمی پێوە دیارە بەشێوەیەك هیچ بایەخ بە کۆرپەلەی ساوا نادات.

٣– شەلەلو ڕەقبوونی ماسولکەکانی پەلی دواوەی ئاژەڵەکەو ماسولکەکانی سنگو سورێنچكو قوڕگ لە ئەنجامی ئەمەشدا لیکێکی کەفاوی بەدەمیدا دێتەخوارەوە کە ناتوانێت قوتی بدات.

٤– خاوبوونەوەی ماسولکەکانی کۆمی ئاژەڵەکەو لە ئەنجامی خونەویستانە دەبێتە هۆی هاتنەوە دەرەوەی پاشەڕۆ لە کۆمەوەو هەروەها خۆنەویستانە میزە دەکات.

٥– لەشی ئاژەڵەکە بەشێوەیەکی گشتی سارد دەبێتو لێدانی دڵی زیاد دەکاتو دڵی بەرەو بێهێزی دەرشوات.

٦– لە ئەنجامی وەستانی ماسولکەی ئاژەڵەکە با دەکاتو هەروەها هەندێك جار پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵی تووشبوو دادەنرێت (subnormal).

## قۆناغی سێیەم:

ئەم قۆناغە بەترسناکترین قۆناغ دەژمێردرێت لە نەخۆشی یەکەداو لەنیشانە دیارەکانی ئەوەی کە ئاژەڵەکە بەلایەکدا دەکەوێت (Lateral reacumbancy) سەر زەوی‌و باکردنێکی زۆر توندو تیژ ڕووی تێ دەکاتو دەبێتە هۆی خنکاندنی ئاژەڵەکەو لێدانی دڵی زۆر زیاد دەکاتو هەناسەدان بەشێوەیەکی قوڵ ئەنجام دەردێتو هەندێك جار دەبێتە هۆی بێ هۆشی ئاژەڵەکەو ڕەقبوونێکی تەواوی پەلەکانی دواوەو پێشەوە.

- **نیشانەکانی لەمەڕو بزندا:**

نەخۆشی کەمی کالیسۆم لەمەڕو بزندا بەڕێژەیەکی کەمتر دەردەکەوێت وەك لە مانگادا.

لە مەڕو بزندا نەخۆشییەکە زیاتر دەردەکەوێت کە کاتێك ئاژەڵەکان زۆر ماندوو دەکرێن بەشێوەیەك کە بۆ ماوەیەکی درێژ دەڕۆن لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە یان کەمبوونەوەو بڕانی ئالف بەشێوەیەکی کتوپڕ زیاتر لەو مەڕانەدا دەردەکەوێت کە ئاوسن، پێش زایین یان دوای زایین بەماوەیەکی کەم.

## چارەسەر کردن:

دیاردەی کەمی کالسیۆم لە مانگادا دەتوانرێت بەسەرکەوتووی چارەسەربکرێت لە قۆناغی یەکەمی نەخۆشییەکەدا، بەڵام لە قۆناغەکانی کۆتایی دا چارەسەرکردنی ئەنجامی ئەوتۆی نابێت، چارەسەر کردنی نەخۆشییەکە بەهۆی:

- **بەکارهێنانی ماددەی گلۆکۆناتی کالسیۆم:**

(Calicium Boroglu conate) ٢٠٪ پێدانی بە ئاژەڵی تووشبوو لەڕێگەی دەماری خوێنەوە (Jagular vein) لە لایەن پزیشکێکی شارەزاوە چونکە پێویستە زۆر بەهێواشی کالسیۆمەکە بچێتە خوێنی ئاژەڵەکەوەو لەهەمان کاتدا پزیشکەکە گوێ لە لێدانی دڵی

ئاژەڵەکە بگریتو زۆر بەوردی تێبینی ئاژەڵی نەخۆش بکات بەو،ی تا چەند ئاژەڵەکە بەم جۆرە چارەسەرە بەرەو پێشەوە دەڕواتو دەرکەوتووە کە دوای پێدانی نزیکەی ٣٠٠-٤٠٠ مل لە کالسیۆم بە بەردەوامی ماسولکەکانی لەشی ئاژەڵەکە دەست دەکەن بە گرژبوونو دەلەرزێتو پەلەکانی پێشەوەو دواوە دەست دەکەن بە جولەو ئاژەڵەکە چەند جارێك هەوڵ دەدات لەسەر قاچ بوەستێتو سەری بەرزبکاتەوەو لەئەنجامدا هەڵدەستێت بەسەرکەوتویی. و پێویستە لەهەمان کاتدا کالسیۆمی پێبدرێت لە ڕێگەی ماسولکەوە (I.M)و ژێر پێستەوە(SIC) بۆ ئەوەی ئاژەڵەکە زیاتر لە یەك سەرچاوەوە کالیسۆم وەربگرێت.

- هەروەها پێدانی ڤیتامین (D3) وە ئەمەش بۆ یارمەتیدانی مژینی کالیسۆم لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە.

قەدەغەکردنی مژینی گوانی مانگای توشبوو لەلایەن گوێرەکەکەیەوە ئەمەش چونکە حاڵەتەکە زیاتر ئاڵۆز دەکات.

- بۆ خۆپاراستن لەم نەخۆشییە پێویستە بە بەردەوامی بەردەخۆی لەبەردەم ئاژەڵکاندا هەبێت بەتایبەتی ئاژەڵی ئاوس چونکە سەرچاوەی کۆمەڵێك خوێی پێویستە وەکو کالسیۆمو مەگنسیۆمو مسو ئاسنو یۆدو مەنگەنیز...هتد.

## دیاردەی کەمی مەگنسیۆم:

(Hypo Magnesaemic Tatany In Calves)

- و لەهەندێك سەرچاوە بەم نەخۆشییە دەوترێت (Wole- Milk -Tetany)

- ئەمە نەخۆشییە(کەمی مەگنسیۆم) هەروەك لەناوەکەیدا هاتووە تووشی گوێرەکە(گۆلك) دەبێت، بە تایبەتی لە تەمنی (٢- ٤) مانگ) کە بێگومان سەچاوەی سەرەکی خۆراکی تەنها شیری دایکە، واتە گوێرەکانەی کە تەنها شیریان دەدرێتێ. هۆکاری سەرەکی ئەم نەخۆشییە کەمبوونەوەی ڕێژەی مەگنسۆم، لەخوێندا کە لە

گوێرەکەی تووشبوودا دەکاتە ٠,٨ ملگم، بەلام رێژەی سروشتی مەگنسۆم لەخوێنی گوێرەکەدا نزیکەی ٢- ٥- ٢ملگم.

چەند بۆچوونێك هەیە دەربارەی ئەو هۆکارانەی کە دەبینە هۆی کەمبوونەوەی مەگنسیۆم لەخوێنی گوڵکدا:

یەکەم: شیر هەروەك خۆراکێك تەنها سەرچاوەی خۆراکی گوێرەکەیە لەو تەمەندا، و بەپێی سەرچاوەکانی خۆراکزانی شیر خۆی لەخۆیدا رێژەیەکی کەم خوێی مەگنسیۆمی تێدایە، لەبەر ئەوە خواردنەوەی شیر بە تەنها رێگە خۆشکەرە بۆ سەرهەڵدانی نەخۆشی کەمی مەگنسیۆم چونکە لەکاتی سکچووندا خوێ ی مەگنسیۆم ماوەیەکی کەم لە رێخۆڵە دەمێنێتەوەو لەش سودی تەواوی لێ نابینێت.

## نیشانە دیارەکانی کەمی مەگنسیۆم:

نشیانەکانی دیاردەی کەمی مەگنسۆم لە شێوەی چەند شەپۆلێکدا (نوبات) دەردەکەوێت (کە لەنێو خاوەن ئاژەڵدا دەڵێن کە گوێرەکەکە فێی لێ دێت)وهەندێك جار چەند خولەکێك دەخایەنێتو هەندێك جاری دیکە دەگاتە نیوە کاتژمێر. ئاژەڵی تووشبوو بەم نەخۆشی یە هەروەك دەڵێن فێی لێ دێت واتە لەناکاو دا دەکەوێتە سەر کەوی‌و پەلەکانی پێشەوەو دواوە رەق دەبن‌و درێژ دەبنەوە بۆ دواوە، لەهەمان کاتدا سەرو ملی بەرز دەکاتەوەو هەموو لەشی زۆر دەلەرزێتو دەمی کەف دەکاتو هەندێك جار گوێرەکەی توشبوو هاوارێك دەکات کە پێی دەوترێت (Tatany Cry) دوای کۆتایی هاتنی ئەم سورِی لەرزینە (ق لێهاتنە) گوێرەکەکە هەڵدەستێتە سەر پێو هەروەك هیچ رووی نەدابێت بۆی هەیە دووبارەی دوای ماوەیەکی کەم سورِەکە دووبارە بێتەوە.

**چارەسەرکردن:**

- پێویستە لەکاتی چارەسەرکردندا ئەم خاڵانە ڕەچاو بکرێت:

١- پێدانی گیراوەی مەگنسیۆم و کالسیۆم بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە سەریەک لە ڕێگەی دەماری خوێنەوە بەگوێرەکەی تووشبوو.

٢- پێدانی گیراوەی مەگنسیۆم سلفات ٢٠٪ لەڕێگەی ژێر پێستەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ.

٣- پێدانی ڤیتامین(D) لەڕێگەی ماسولکەوە (I.M) ڕۆژانە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەسەر یەک.

٤- بۆ خۆپاراستن لەم نەخۆشییە وا باشترە کە لە گوێرەکەی تەمەن بچووکدا مادەی ئۆکسیدی مەگنسیۆم بکرێتە شیری گوێرەکەوەو پێی بدرێت بە مەبەستی ڕوونەدانی دیاردەی کەمی مەگنسیۆم.

٥- لەکاتی تووشبوونی گوێرەکە بە سکچوون وا باشترە کە زۆر بەخێرایی چارەسەر بکرێت.

**سەرچاوەکان:**


1- Honger Ford, T. G. 1975. Diseasess of Livesetock, 8th edition.

2- Radostits, O.M. Gay, C.C, Blood, D.C, and Hinchcliff, K. W. 2000. Veterinary Medicine 9th edition.

الامراض الباطنية

- الدكتور محمود احمد النديم.

- الدكتور سعدى احمد غناوى ١٩٨٥.

# نەخۆشی دەم ئێشە

## Scabby Mouth

بە شێوەیەکی گشتی ئەندامەکانی لەش بایەخی تایبەتی خۆیان بۆ ئەنجام دانی چالاکی بە هەمە جۆرەکانو بەردەوامی ژیان هەیە.

دەم (Mouth) وەك ئەندامێکی گرنگ سودی زۆری بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ و باڵندە هەیە، چونکە هەر لەڕێگەی دەمەوە خۆراکی پێویست وەردەگرینو هەر بەهۆی دەمەوە ئەو بڕە خۆراکە دەهاڕێو ئامادەدەکرێت بۆ بەشەکانی دیکەی کۆئەندامی هەرسو لەو نێشەوە لەش سوودی لێ وەردەگرێت، لەبەر ئەوە لەکارکەوتنی ئەندامێکی وەك دەم نێگەتیڤانە کار دەکاتە سەر بەشەکانی دیکەی لەشو بەرە بەرە بەرەو لەڕو لاوازی دەبات.

دەم ئێشە یەکێکە لەو نەخۆشییانەی بەشێوەیەکی سەرەکی تووشی دەم دەبنو لەئەنجامدا لەکاردەکەوێتو بەمەش ئاژەڵ لەڕو لاواز دەبێتو دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمەکانی، بەپێی سەرچاوەکان دەم ئێشە بە یەکێك لەنەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤو ئاژەل ( دەردە مرۆژەلییەکان) دادەنرێت، واتەهۆکاری نەخۆشی دەم ئێشە لە ئاژەڵی توشبووەوە ڕاستەخۆی دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤو مرۆڤیش تووشی نەخۆشی ئۆرف (Orf) دەکاتو لەئەنجامدا تەندروستی دەخاتە مەترسییەوە.

بەپێ ی ئەوەی کە لە نەخۆش خانەکانی ڤێتێرنەری کارم کردووەو بە گوندەکانی هەندێك ناوچەدا گەڕاوم، نەخۆشی دەم ئێشە لە کوردستاندا هەیەو تووشی مەڕو بزن دەبێت.

### نەخۆشی دەم ئێشە :

نەخۆشی دەم ئێشە زارەوەیەکە لەکوردەواریدا لەنێو خاوەن ئاژەڵەکاندا بڵاوەو بەو نەخۆشییە دەوترێت کە تووشی دەم دەبێتو لە ناوچەکانی کوردستاندا تووشی مەڕو بزن دەبێتو زیاتر لە ئاژەڵە تەمەن بچووکەکاندا دەردەکەوێت بە تایبەتی تووشی لێوی ئاژەڵە تەمەن بچووکەکان دەبێت.

**لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری نەخۆشی دەم ئێشە چەند ناوێکی هەیە لەوانەش:**

١- Scabby Mouth

٢- Score Mouth.

٣- Contagious Pustular dematitis

٤- Contagious Ecthyma

نەخۆشی دەم ئێشە نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە، لە ئاژەڵی تووشبووەوە بۆ مرۆڤ دەگوێزێتەوەو لە مرۆڤدا پێی دەوترێت نەخۆشی ئۆرف (Orf disease)

هۆکاری سەرکەی نخۆشی دەم ئێشە دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لە ڤایرۆس کە پێ ی دوترێت:

Pox Virus (Para pox Virus)

بەهۆی پەوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئاژەڵی تووشبوو دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی ساغو بەم شیچوەیە بلاو دەبێتە لە زۆربەی ولاتانی جیهاندا نەخۆشییەکە هەیەو بێگومان لەکوردستانیشدا هەیەو لەئەنجامدا زیانی ئابووری گەورە دەگەیەنێت بە سامانی ئاژەڵ. نەخۆشی دەم ئێشە لە زۆربەی وەرزەکانی ساڵدا بڵاو دەبێتەوە بەتایبەتی سەرەتای وەرزی بەهارو کۆتایی وەرزی هاوینو وەرەکانی پایزو زستاندا.

ڕێگاکانی تووشبوون بە نەخۆشی دەم ئێشە بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ڕووشانێك لە پێست یان برینداربوونی پێستو لە ڕێگەکەیەوە ڤایرۆسەکە بە هەڵ دەزانێتو کاری خۆی ئەنجام دەدات.

ڤایرۆسی نەخۆشی دەم ئێشە زیاتر ئەو ناوچانەی لەش تووش دەکات کەخوری پێوە نییەو وەکو لێو دەمو لاقەکانو قاچو چڵی کگوانو سەر هەروەها توێژینەوە زانستییەکان دەریانخستووە کە ئەو ئاژەڵانەی لەسەر ئالفی زبرو ڕەقو دەلەوەڕێن زیاتر بۆیان هەیە تووشی نەخۆشی دەم ئێشە بن، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ئالفانە دەبنە هۆی ڕووشاندنو برینداربوونی لێوەکانی ددەمو ڕێگە خۆشکردن بۆ تووشبوون بەهۆکاری

نەخۆشی دەم ئێشە.

## نیشانەکان دیارەکانی:

بەشێوەیەکی گشتی نیشانەکانی نەخۆشی دەم ئێشە لەدەمو قاچەدا دەردەکەوێتو زیاتر لە پێستی لێوەکانو بەرە بەرە ناو دەم دەچێتو دەم تووش دەکات.

لەسەرەتاوە لە شوێنێکی بچووکەوە دەست پێدەکاتو شوێنەکە سوور دەبێتەوە شلەیەك دەردەداتو لە دواییدا ئەم شلەیە خەست دەبێتەوەو ڕەق دەبێتو قەتماغەیەك (Scab) دورست دەکاتو ئەم قەتماغەیە زۆر بەتوندی بە پێستەکەوە دەلکێت هەندێك جار دوای دوو هەفتە یان سێ هەفتە قەتماغەی برینەکە لەخۆوە هەلدەوەرێتو دەکەوێتە سەر زەویو بەرە بەرە پێستەکە ساڕێژ دەبێت.

لەشێوەی توندی نەخۆشی یەکە (Sever Form) قەتماغەی برینەکە زۆربیە لێوەکان دادەپۆشێتو بە ناوبۆشایی دەمدا بلاو دەبێتەوە، هەروەها دەگاتە کونی لووتی ئاژەلەکە. بەمەش ئاژەلە تەمەن بچووکەکان وەك بەرخو کار توانای لەوەڕاندنیان نامێنێتو هەروەها توانای مژینی گوانی دایکیان نامێنێتو بەرە بەرە لەرو لاواز دەبنو بێ هێز دەبنو هەندێکجار مردار دەبنەوە.

– لە قاچدا نەخۆشیەکە دەبێتە هۆی شەلینی ئاژەلەکە.

– هەندێکجار قەتماغەی برینەکان بە چواردەوەری چاودا بلاو دەبنەوەو هەروەها چلی گوانیش دەگرێتەوەو ئاژەلی تووش بوو ڕێگە نادات بەرخەکەی گوانی بمژێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئازارێکی زۆری لا دروست دەبێتو بەرخەکە بێبەش دەبێت لە شیری دایکیو لەڕو لاواز دەبێتو کێشی کەم دەکات.

## نەخۆشی ئۆرف لە مرۆڤدا (Orf)

نەخۆشی ئۆرف (Orf) یەکێکە لەو نەخۆشییانە کە لە ئاژەلی تووش بوو بە نەخۆشی دەم ئێشە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لەئەنجامی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەنێوان مرۆڤو ئاژەلی

تووش بوودا.

لەنیشانە دیارەکانی بریتیە لە سوربوونەوەی ناوچەیەکی بچووك لەسەر دەستو قولّی مرۆڤی تووش بووو لەئەنجامدا ئەو شوێنانەی دەست دەکەن بە خوراندنو دوای ماوەیەك چاك دبێتەوە.

## کۆنترۆڵو چارەسەر کردن:

بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی دەم ئێشە(Scabby Mouth) لە هەندێك ولآتدا ڤاکسینی تایبەت بە نەخۆشییەکە بەکاردێتو ئەنجامێکی بەرچاوی دەبێت.

– بەپێ ی سەرچاوە زانستی یەکان ئەو ئاژەلانەی کە یەکجاری تووشی نەخۆشی دەمو ئێشە دەبنو چاك دەبنەوە بەدرێژایی تەمەنی بەرگری لەدژی نەخۆشییەکەوە وەردەگرێتو جارێکی دیکە تووشی نەخۆشیەکە نابێتەوە (Life Long immunity).

– ئاژەلی تووش بوو هەندێکجار وای سێ بۆ چوار هەفتە چاك دەبێتەوەو برینەکەی سارێژ دەبێت (Self limiting) بێ بەکارهێنانی دەرما، هەندێك جاری دیکە دەمران بەکاردەهێنرێت وەکو دژە ژیانەکان وەکو پەنسلین.

– ستریۆمایسین ئالفێك بەکاربهێنرێت کە نەبێتە هۆی ڕووشاندنو بریندداربوونی لێوی ئاژەلەکان.

سەرچاوەکان:

1- Bibby. S, 2002 Scabby Mouth(orf) a disease of sheep and Goats.

2- Scaechter, M. Engleberg. N. Eisenstein. B and Med off. G, 1999. Mechanisms of Microbial Diseacs. 3rd edition.

3- The Merck Veterinary Manual . 8, 1998th edition.

## ((کاریگەری ترساندنی ئاژەڵ لەکاتی سربڕیندا))

کاریگەری ترساندنی ئاژەڵ لە کاتی سەربڕیندا، لەسەر تامی گۆشتەکەی

تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئەوەیان سەلماندووە کە ترساندن‌و تۆقاندنی ئاژەڵ لەکاتی سەربڕیندا..... کاریگەرییەکی خراپی لەسەر گۆشتی ئاژەڵەکە هەیە، بەتایبەتی تامی گۆشتەکەی ، دەبێت لەئەنجامی بەرزبوونەوەی ئاستی هۆرمۆنەکانی ترس لە سوڕی خوێنی ئاژەڵە سەربڕاوەکان، هەر لەبەر ئەمەش بە پێویستم زانی کە چەند ڕوونکردنەوەیەکی زانستی بخەمە بەرچاو خوێنەران دەربارەی ئەم بابەتە کە تایبەتە بە گۆشت کە بێگومان پەیوەندی بە هەموو لایەکەوە هیەەو بەهیوام کە لە خزمەتی گشتیدا بێت.

## ترس و کاریگەری لەسەر لەش:

کاتێك هەر زیندەورێك بە شێوەیەکی گشتی هەست بە ترسێکی زۆر دەکات، هەندێك لە ڕژێنەکانی لەش بەتایبەتی ئەو ڕژێنانەی کە دەکەونە سەر گورچیلە کە پێی دەوترێت (Supra renal gland) هەڵدەستن بە دروستکردن‌و ڕژاندنی هۆرمۆنی ئەدرینالین (Adrenalin Hormone ) بۆ ناو سوڕی خوێن‌و لەڕێگەی خوێنەوە دەگاتە زۆربەی بەشەکانی لەش‌و لەئەنجاندا چەند کاریگەریەکی تایبەتی دەبێت بۆ سەر لەش، لەو کاریگەریانە:

١- لێدانی دڵ زیاد دەکات.

٢- پەستانی خوێن بەرز دەبێتەوە

٣- پەلەکانی لەش دەلەرزێت.

٤- مولولەکانی خوێن گرژ دەبن‌و تەسك دەبنەوە( Vasoconstriction)

## ئاژەڵ‌و هۆیەکانی بەرگریکردن:

بەشێوەیەکی گشتی لە ئاژەڵدا هەندێك ڕژێن‌و دەردانی ماددەی جیاواز، بۆ نموونە ، باڵندە ماددەیەك دەردەدات بەمەبەستی خاوکردنەوەی بەیکەوە نووسانی پەڕەکانی، تاوەکو ئەگەر هێرش کرایە سەری هەولی گرتنی دار بە شێوەیەکی ئاسان پەڕەکانی

بوەرێتو دەرباز بێت.

ماسی ماددەیەکی لینج دەردات کە بۆنێکی ناخۆشی هەیە بۆ مەبەستی ئەوەی لەشی پێداپۆشێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەکاتی هێرش بردنە سەرو گرتنیدا بەئاسانی بخلیسکێتو رزگاری بێت.

بۆق مادەیەکی تاڵ دەردەدات کە بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەیەو بەمەش وا لەدوژمنی هێرش بەر دەکات کە وازی لێبێنێتو فرێیبدات.

هەروەها رێوی لەکاتی هێرش بردنە سەریدا لەلایەن دوژمنەوە توشی سکچونێکی تیژ دەبێت، بەمەبەستی پیسکردنیو رزگاربوونی.

ئاژەڵێکی ترسنۆکی وەکو کەروێشك لەکاتی سەربڕیندا خانەکانی لەشی بەشێوەیەکی گشتی هەڵدەستن بە دەردانی هەندێك لەو مادانەی کە تامی گۆشتەکەی ناخۆش دەکاتو لەئەنجامدا مرۆڤ ئارەزووی خواردنی ناکات.

## ترسو کاریگەری لەسەر لەشی ئاژەڵ:

هەر ئاژەڵێك کاتێك هەست بە ترسێکی زۆر بکات لە ئەنجامی رووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ دوژمەکانیدا، چەند گۆرانکارییەك لە لەشیدا ڕوودەدەن، لەوانەش:

یەکەم: گرژبوونو تەسکبوونەوەی مولولەکانی خوێن، بەمەش ئاژەڵەکە لە خوێنبەربوونی کوشندە دەپارێزێت چونکە لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەو شەڕکردندا لەگەڵ دوژمنەکانیدا و لەئەنجامی گازگرتنو برینداربووندا خوێنبەربوون ڕوودەدات.

دووەم: خاوبوونەوەی ماسولکەکانی لەش بەشێوەیەکی گشتی (Relaxation).

سێیەم: کۆئەندامی دەمار بەشێوەیەکی سروشتی کارەکانی جێبەجێ ناکات واتە ئاژەڵەکە هەست بەهیچ ئازارێك ناکات لەکاتی شەڕکردنو برینداربوونو سوتاندنو شکاندندا ئەمەش ڕوودەدات لەئەنجامی بەرزبوونەوەی هۆرمۆنەکانی ترس لە خوێندا.....بەڵام دوای نەمانی کاریگەری هۆرمۆنەکانی ترس لە خوێندا بەرە بەرە ئاژەڵەکە هەست بە ئازارێکی تیژ دەکات لەکاتی پشوداندا.

چوارەم: ترساندنو تۆقاندنی مریشك لە كێڵگەكانی پەلەوەردا دەبێتە هۆی ئەوەی كە گەشەی، بوەستێتو كاریگەریەكی خراپی لەسەر تەندروستی مریشكەكە ببێتو ئارەزووی خواردنیشی نامێنێت.

**لەمێژوودوە:**

بە مەبەستی پشتگیری لەم ڕاستیە لە سەرچاوە مێژووییەكانەوە ئەگێڕنەوە، كە پاشایەك دەبێتو تاقە كچێكی دەبێت، هیوای ئەوەیە كە تاقە كچەكەی شووبكاتە ئازاترینو زیرەكترین لاوی ئەو سەرەدەمە، بەڵام بەمەرجێكو مەرجەكەش ئەوەیە پاشا لەكۆشكەكەیدا بەرخێكی هەیەو ئەو كەسەی بتوانێت بۆ ماوەی ساڵێك پارێزگاری لە كێشی بەرخەكە بكاتو واتە لەو ماوەیەدا كێشی بەرخەكە نەزیاد بكاتو نە كەم ئەوا كچەكەی پێشكەش دەكات.

لەدواییدا لاوێك پاشای ئاگادار كردەوە كە دەتوانێت لەو تاقیكردنەوەیدا سەربكەوێت، ئەویش بەوەی هەموو بەیانیو ئێوارەیەك لاوەكە لە كۆشكی پاشا سەر لە بەرخەكەی دەداتو لە جانتاكەیدا گورگێكی بچكۆڵەی هاری شاردۆتەوە بەمەبەستی ئەوەی پیشانی بەرخەكەی بداتو لە ژوورێكی چۆڵدا راوی دەنێتو لە ئەنجامدا بەرخەكە زۆر دەترسێتو دەتۆقێتو لەترساندا هیچ شتێك ناخواتو لەخواردنو خواردنەوە، بەم شێوەیە بۆ ماوەی ساڵێك ژیانی تاڵ دەبێتو لەئەنجامدا كێشی بەرخەكە نە زیاد دەكاتو نەكەم لە كۆتاییدا پاشا كچەكەی پێشكەش دەكات.

سەربڕینی ئاژەڵو چەند مەرجێك:

گۆشت هەروەكو سەرچاوەیەكی سەرەكی پرۆتین كە پێویستییەكی بەردەوامی مرۆڤەو پێویستە بۆ دەستكەوتنی گۆشتێكی چاكو بەتام ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكرێت:

یەكەم: پێویستە ئاژەڵەكان بەهەموو جۆرەكانییەوە، بەهیچ شێوەیەك نەترسێت لە پێش سەربڕین لەكاتی سەربڕیندا چونكە ترساندن بەهەر شێوەیەك بێت دەبێتە هۆی

بەرزبوونەوەی ئاستی هۆرمۆنەکانی ترس لە خوێندا.

دووەم: کاتی چەقۆو تیژکردنی چەقۆ لەبەردەم ئاژەڵی ئامادەکراو بۆ سەربڕین ئەنجام نەدرێت، چونکە ئاژەڵەکە بەم کاران دەترسێت‌و لە ئەنجامدا هۆرمۆنەکانی ترس لەخوێندا زیاد دەکەن.

سێیەم: پێویستە لەکاتی سەربڕین‌و لەپێش سەربڕین، ئاژەڵەکە ئازارو ئەشکەنجە نەدرێن‌و چەقۆیەکی تیژ بەکاربهێنریت بۆ سەربڕینی ئاژەڵەکان، چونکە بە پێچەوانەوە ئازاری سەربڕین دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی هۆرمۆنەکانی ترس لە خوێندا.

چوارەم: پێویستە کۆمەڵە ئاژەڵێك لەبەردەم یەکتردا بەکۆمەڵ سەرنەبڕێن چونکە بەکۆمەڵ دەترسێن‌و دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕادەی هۆرمۆنەکانی ترس لەخوێندا.

پێنجەم: پێوستە ئاژەڵەکان ئارام‌و هێمن بکرێنەوە لە پێش سەربڕین لەکاتی سەربڕیندا، زۆربەی تاقیکردنەوە زانستیەکان لەسەر کەروێشك ئەوەیان دەرخستووە کە ئارام‌و هێمنکردنەوەی کەروێشك لەپێش سەربڕینداو لەدواییدا سەربڕینی لەناکاو بەبێ ئەوەی هەست بەئازاری ترس بکات گۆشتێکی بەتام‌و بەچێژیان لێ دەستدەکەوێت.

**سەرچاوەکان:**


١- گۆڤاری (ابقار وأغنام الشرق الاوسگ وشمال أفريقيا). سالی چوارەم- ژمارە(١٢)سالی ١٩٩٨. بەتایبەتی لە نوسینێکی دکتۆر ابراهيم الراوی سوود وەرگیراوە.

٢- پزیشکی ڤێتێرنەری، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٤، دکتۆر فەریدون عبدالستار.

٣- Gracey, J. Collins, D.S, and Huey R. 1999. Meat Hygiene 10th editions.

# نەخۆشی بەراویتەبوون
## "Brucellosis"

پەیوەندی نێوان مرۆڤو ئاژەڵ ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لە زیادبوونە، بەوەی کە مرۆڤ پێویستی زۆری بە ئاژەڵو بەرهەمەکانی ئاژەڵ هەیە، هەروەها بەهەمان شێوەش ئاژەڵ پێویستی بە مرۆڤ هەیە.

زۆربوونی ژمارەی ئاژەڵ یەکێك لە ڕەهەندە سەرکیی یەکانی پرۆژەکانی بەخێوکردنی ئاژەڵو خاوەن ئاژەڵ بەمەبەستی زیاد کردنی ژمارەی ئاژەڵەکانی زۆر گرنگی دەدات بە گەڵدانی ئاژەڵەکانو هەروەها ئاوسبوونیان لە دوایشدا زاینیانو، بەڕێوەبردنیان بەشێوەیەکی دروست لەم ماوەیەدا زۆر بایەخی پێدەدات. ماوەی ئاوسی " Gestation Period" لەئاژەڵی ئوسدا ماوەیەکی زۆر هەستیارەو کێشەی تایبەتی خۆی هەیەو یەکێك لەو کێشە گرنگانە، بەراویتە بوونی ئاژەڵی ئاوسەو واتە بەرخستنی ئاژەڵی ئاوس بە شێوەیەك کە خاوەن ئاژەڵ بە بەردەوامی بەدەست نەخۆشی بەروایتە بوونەوە دەناڵێنێتو لەئەنجامدا زەرەروو زیانێکی گەوەر بە ئابووری خاوەن ئاژەڵو وڵات دەگەیەنێت.

هۆکاری نەخۆشی بەروایتە لە ڕێگەی جیا جیاوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤو مرۆڤ تووشی نەخۆشی "تای ماڵتا " Malta fever دەکاتو لەئەنجامدا لەڕووی ئابوریی‌و جەستەییەوە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێتو لە کوردستانیشدا ڕێژەی توشبوونە بە تای ماڵتا ڕوو لە زیاد بوونەو ئەمە بێ گومان لەئەنجامی بەکارهێنانی بەرەوبوومی ئاژەڵو بەتایبەتی خواردنی پەنیری کوردی زیاتر لە وەرزی بەهاراندا توشبوون زۆر زیاد دەکات.

لەبەر ئەوە بیرکردنەوە لە بنبڕکردنی نەخۆشی بەراویتە لە ئاژەڵو تای ماڵتا لەمرۆڤ پێویستە لە ئاژەڵەوە دەستپێ بکاتو هەوڵ بدەین ئەو دروشمە بەرزبکەینەوە کە دەڵێت: "تەندروستی مرۆڤ پارێزراو نابێت گەر تەندروستی ئاژەڵ پارێزراو نەبێت" واتە نەخۆشی تای

ماڵتا لەمرۆڤدا کۆنترۆ ناکرێت بەهیچ شێوەیەك گەر لە ئاژەڵدا کۆنترۆڵ و بنبڕ نەکرێت.

## نەخۆشی بەراویتە:

نەخۆشی بەراویتە "Brucellosis" لەنێو خاوەن ئاژەڵ و گوندنشینەکاندا بەو نەخۆشییە دەوترێت کە ساڵانە ئاژەڵە ئاوسەکان تووشی بەراویتە بوون دەکەن(بەرخستن)و خاوەن ئاژەڵ بێ بەش دەکات لەبەری ئاژەڵەکانی، هەر لەبەر ئەمەش پێی دەوترێت نەخۆشی بەراویتە، عەرەب پێی دەڵێن:"الاجهاج المعدی" و لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری چەند ناوێکی هەیە لەوانەش:

1- Brucellosis (ناوێکی زانستی یە).
2- Contagious Abortion
3- Bang`s Disease .

هەروەها ئەم نەخۆشییە بە یەکێك لە نەخۆشی یە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ ئاژەڵ دادەنرێت یان دەردە مرۆژەڵییەکان(Zoonoses) واتە هۆکاری نەخۆشی یەکە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤو مرۆڤ تووشی نەخۆشی تای ماڵتا دەکات، بەلام ئەوەی شایەنی باس بێت هۆکاری نەخۆشییەکە لەمرۆڤدا نابێتە هۆی لەبارچوونی ژنی سکپڕ.

نەخۆشی بەراویتە بەو نەخۆشییە درێژ خایەنانە دادەنێت کە لەگەڵ تەمەنی ئاژەڵی نەخۆشدا بەردەوام دەبێت لە خانەکانی لەشیدا دەمێنێتەوە (life long infection).

– نەخۆشی بەراویتە نەخۆشیەکی زۆر بڵاوە لەزۆربەی وڵاتانی جیهانداو بەتایبەتی لەو وڵاتە هەژارەکانو تازە پێگەیشتووەکان لەئەنجامدا زیانی ئابووری گەورە بەم وڵاتانە دەگەیەنێت.

– نەخۆشی بەراویتە تووشی زۆربەی ئاژەڵە ماڵی یە بەرهەم دارەکان دەبێتو وەکو مانگاو مەڕو بزن دەبێتە هۆی پەکخستنی کۆئەندامی زاوزێ Reproductive System و بەتایبەتی لەماوەی ئاوسبوندا لەئەنجامدا بەرخستنی ئاژەڵە ئاوسەکان، کوردستان یەکێکە لەو وڵاتانەی کە نەخۆشی بەراویتە زیانی گەورە بەسامانی ئاژەڵ دەگەیەنێتو دەتوانم بڵێم کە یەکێکە لە دوژمنە ترسناکەکانی سامانی ئاژەڵو پێویستە لەسەر لایەنە پەیوەندیدارەکان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان بیرێکی زانستیانە بکەنەوە لە دانانی

بەرنامەیەك بە مەبەستی بنبڕکردنی نەخۆشی بەڕاویتە.

بەپێی سەرچاوەکان نەخۆشی بەراویتە تووشی ئەسپو گامێشو بەرازو سەگو حوشتریش دەبێتو هەروەها تووشی ئاژەڵە کێویەکانیش دەبێت.

## - هۆکارەکانی نەخۆشی بەراویتە:

هۆکاری سەرەکی نەخۆشی بەراویتە Brucellosis دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریایەك کە پێی دەوترێت: برۆسێلا Brucella.

برۆسێلا چەند جۆرێکی هەیە لەوانەش:

١- Brucella Melitensis بەشێوەیەکی سەرەکی تووشی مەڕو بزن دەبێت و بۆ یەکەم جار لەلایەن دکتۆر بروس Bruce لەساڵی ١٨٨٧ز دۆزراوەتەوە، وە ناوی برۆسێلا لەناوی دکتۆر (برۆس)ەوە وەرگیراوە.

٢- Brucella abortus بەشێوەیەکی سەرەکی تووشی مانگا دەبێتو بۆ یەکەم جار لەلایەن زانا "Bang" لەساڵی ١٨٩٧ ز دۆزراوەتەوە، هەر لەبەر ئەمەش هەندێك جار لە سەرچاوەکان بە نەخۆشییەکە دەوترێت نەخۆشی بانگ" Bangs disease".

٣- Brucella Ovis تووشی بەران دەبێت.

٤- Brucella Suis تووشی بەراز دەبێت.

٥- Brucella Canis تووشی سەگ دەبێت.

- برۆسێلا چەند خەسڵەتێکی تایبەتی هەیە لەوانە:

- لەخێزانی "Brucella cae" و لە کۆمەڵەی گرام نێگەتیڤە.

- زیندەوەرێکی لەناو خانەدا دەژیت"intracellular Organism" واتە شوێنی هەڵبژێراوی برۆسێلا "Predilection site" ناو خانەکانە، کە بێ گومان ئەم خەسڵەتەش وادەکات برۆسێلا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە لەشەدا بمێنێتەوەو هەندێك جار بەدرێژایی تەمەن لەخانەکانی لەشدا دەمێنێتەوە، کە ئەمەش وادەکات کە ماوەی چارەسەرکردنی نەخۆشی یەکە درێژ دەبێتەوە بۆ چەند مانگێك چونکەئەو برە دەرمانەی کە پێویستە بۆ

لەناوبردنی هۆکارەکە زۆر بەزەحمەت دەگاتە ناو خانەی تووشبوو لەبەر بوونی پەردەی "Cell membrance" لەبەر ئەوە پرۆسەی چارەسەرکردنی ماوەیەکی درێژی پێویستە.

- برسێلا زیاتر ئارەزووی هەیە لەخانەکانی ئەندامەکانی کۆئەندامی زاوزێ دابمێنێتەوە لە ئەنجامدا گەشە دەکات بەتایبەتی لەو ئاژەڵانەی کە خاوەنی کۆئەندامی زاوزێ ی پێگەیشتوون، بێ گومان ئەمەش بەپێ ی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێترینەری هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ مادەیەکی شەکر کە پێی دەوترێت Erythritol ئیریپیۆتۆل کە ئاژەڵ لە کاتی ئاوسبووندا دروستی دەکات و بڕەکەی زیاد دەکات لە ئەندامەکانی کۆئەندامی زاوزێ و لەئەنجامدا ژینگەیەکی لەبار دەخولقێنێت بۆ گەشەکردن و زۆربوونی بڕۆسێلا لە ئەندامەکانی کۆئەندامی زاوزێ. هەر لەبەر ئەمەشە شوێنی گونجاوی بڕۆسێلا بریتی یە لە گوانی ئاژەڵ و گوێرەکەدانی ئاوس"Pregnant uterus" و پزدان، هەروەها لە ئاژەڵی نێردا زیاتر لە گوون و ڕژێنەکان دا دەمێنێتەوە ئەمەش وا دەکات بڵێین کە مانگاو مەڕو بزنی پێگەیشتوو لەڕوی کۆئەندامی زاوزێوە زیاتر هەستیارترە بۆ تووشبوون لە نەخۆشی بەراوێتە لەگەڵ ئاژەڵێکی پێنەگەیشتوو.

بەپێی سەرچاوەکانی بەکترۆیۆلۆجی ئاستی گەشەکردنی برۆسێلا زۆر هێواشەو واتە ماوەیکی درێژی دەوێت بۆ گەشە کردن و پێگەیاندن لەسەر ناوەندەکانی چاندن لە تاقیگەدا.

The Organism develops Slowly

### - چۆنیەتی گواستنەوەی نەخۆشی یەکە:

ئاژەڵی ئاوسی تووشبوو بە برسێلا بە سەرەکیترین سەرچاوەی نەخۆشی بەراوێتە دادەنرێت و کاتێك ئاژەڵی ئاوس بەردەخات بەراویتە دەبێت پزدان و شلەی کۆرپەلەو کۆرپەلەش (پز)و دەردراوی بەردەوامی زێ ی ئاژەڵی بەراویتە بوو بە سەرچاوەی بڵاوبونەوەی نەخۆشی یەکە دادەنرێت چونکە دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی لە ژینگەداو لە ڕێگەی لەوەڕگاکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ ئاژەڵی ساغ، برۆسێلا توانای مانەوەی هەیە لە ژینگەدا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك وهەفتەیەك و لەدواییدا توانای توشکردنی ئاژەڵی ساغی

هەيە.

- شیر ژەگی گوانی مانگاو مەڕو بزنی بەراویتە بوون بە سەرچاوەیەکی گرنگی پرۆسیلا دادەنریتو لە ڕیگەی خواردنەوەی ئەم بەرهەمانە دەگویزریتەوە بۆ ئاژەڵو هەروەها بۆ مرۆڤیش.

- بەپیّ ی سەرچاوەکان دەرکەوتووە کە برۆسیلا لە ڕیگەی چاوو کۆئەندامی هەناسەوە دەگویزیتەوە.

- تۆوی تۆشبوو (Infected Semen) لە ڕیگەی کەڵدانی دەتسکرد ( Artifical Insemination) وە دەگویزریتەو بۆ ئاژەڵی ساغ.

## نیشانەکان:

ماوەی تووشبوون بە برۆسیلاو هەتا دەرکەوتنی نیشانەکان لەسەر ئاژەڵی تووشبوو نزیکەی شەش هەفتەی پێویستە لەمانگاو نزکەی (٣- ٢٠)هەفتەی پێویستە لە مەڕو بزندا.

- مانگای ئاوسی تووشبوو بە برۆسیلا لە تەمەنی شەش مانگو بەرەو ژوور لەماوەی ئاوسیدا بە راویتە دەبیتو بەردەخاتو لەمەڕو بزندا لە تەمەنی چوار پێنج مانگی تووشی بەراویتە دەبیت، کەئەمەش بیّ گومان بەدیارترین نیشانە دادەنریتو هەر لەبەر ئەمەشە نەخۆشیەکە لەنێو خاوەن ئاژەڵو گوندنشینەکان بە نەخۆشی بەراویتە ناسراوە.

- ئاژەڵی بەراویتە بوو زۆر جار تووشی گیربوونی پزدان دەبیت "Retained Placenta"

- هەندیك جار گویرەکەدانی مانگای بەراویتە بوو تووشی هەوکردن " Metritis" دەبیت.

- ئاژەڵی نیری تووشبوو نیشانەی ئەوتۆی لەسەر دەرناکەویت بەلام قەبارەی گونی گەورە دەبیتو پێکهاتەی تۆوی ئاژەڵەکە گۆڕانی بەسەردا دیت.

- لە بزندا گوانی تووشبوو هەو دەکات "Mastitis" و بە نیشانەیەکی دیار دادەنریت.

- جۆری "Brucella Ovis" کە تووشی بەران دەبیت و دەبیتەهۆی نەخۆشی هەوکردنی

بۆڕی تۆو لەبەراندا "Ram epididymitis " لە ڕێگەی جووتبوونەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مەڕی ساغ، لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشی یە، ئاوسانی بۆڕی تۆو "Epididymis "و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشو زیادبوونی قەبارەی گوونو هەروەها نەمانی ئارەزووی سێکس "Libido" بەرە بەرە نەخۆشی یەکە دەبێتەهۆی دروستبوونی کێم لە شانەکانی گونداو هەروەها لە تۆودا دەبینرێتو لە ئەنجامدا ڕێژە بەپێتی "Fertility rate "ی ئاژەڵەکە دێتە خوارەوە.

## نەخۆشی تای ماڵتا لەمرۆڤدا:

نەخۆشی تای ماڵتا کە هۆکارەکەی برۆسێلایە یە دیاترین نەخۆشی هاوبەش دادەنرێت لەنێوان مرۆڤو ئاژەڵو سالانە خەڵکێکی زۆر لەگوند نشینو شارنشین تووشی دەبن.

گشت جۆرەکانی برۆسێلا مرۆڤ تووش دەکەن، بەلام بەپێی سەرچاوەکان جۆری Brucella meltiensis: کە سەرچاوەکەی بزنە لەڕێگەی بەرهەمەکانی یەوە مرۆڤ تووش دەکات بە توندوتیژترین جۆریان دادەنرێت لەمرۆڤداومرۆڤ کاتێکتووش دەبێت زۆر ماندوو دەبێت.

لەمرۆڤدا نەخۆشی یەکە چەند ناوێکی هەیە لەوانەش:

1- Brucellosis (ناوی زانستی یە)

2- Malta Fever .تای(ماڵتا)

ئەمەش لەبەر ئەوەی یەکەم جار نەخۆشیەکە لە دورگەی ماڵتا لە لایەن دکتۆر برۆس Bruce دۆزرایەوە.

4- Undulant Fever(شەپۆلە تا)

5- Mediterrranean fever. (تای دەریای ناوەڕاست)

- **نیشانەکانی لەمرۆڤدا:**

١- سەر یەشەیەکی زۆر و بێ هێزیەکی زۆر.

٢ - ئازاری ماسولکەکانی لەش‌و ئارەق کردنەوەیەکی زۆرو بەردەوام بەتایبەتی لە شەودا.

٣- جومگەکان بە گشتی‌و ئەژنۆی قاچ بەتایبەتی هەست بە ئازارێکی توند دەکات.

٤- هەندێك جار نەخۆش تووشی هەوکردنی گون "Orchitis" دەبێت.

٥- تووشی قەبزی " Constipation" دەکات.

٦- گەورەبوونی قەبارەی سپڵ.

٧- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش(تای لێ دێت )و دەرکەوتنی بەشێوەی پچڕ پچڕ.

**<u>مرۆڤ لەم ڕێگایانەوە تووشی نەخۆشی یەکە دەبێت:</u>**

١- مامەڵەکردنێکی نازانستیانە لەگەڵ ئاژەڵی بەراویتەبوو بە تایبەتی لەنێو خاوەن ئاژەڵەکان لە گوندەکاندابەدەست لێدانی پزی بەراویتە بوو پزدان‌و دەردراوی زێ‌و ئاژەڵی بەراوێتەبوو بە ڕێگەیەکی سەرەکی تووشبوون دادەنرێت.

٢- لە ڕێگەی خواردنەوەی شیری گوانی ئاژەڵی بەراویتەبوو چونکەهۆکاری نەخۆشی یەکە بۆماوەیەك لەشانەکانی گوانی تووشبوودا دەمێنێتەوە.

٣- لە کوردستانداو لە ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی لەڕێگەی خواردنی پەنیری کوردی لەبەهاراندا لە گوندەکان دروست دەکرێت‌و تام‌وچێژێکی خۆشی هەیە، بەلام بەسەرچاوەیەکی سەرەکی برۆسێلا دادەنرێت چونکە لەکاتی دروست کردنی ئەم جۆرە پەنیرەدا ئەوپلەی گەرمی یەی بەکاردەهێنرێت بۆ کوڵاندنی شیرەکە نابیچتە هۆی لەناوبردنی برۆسێلاکەو لەئەنجامدا برۆسێلاکە بەچالاکی دەمێنێتەوەو بەهۆی خواردنی پەنیرەکە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

٤- کارمەندانی تاقیگەو قەسابخانە لەپزیشکانی ڤێتێرنەری‌و یاریدەدەرەکانی قەسابەکان ئەگەری تووشبوونیان زیاترە لە خەڵکی دیکە.

٥- لە ڕێگەی برینی پێست‌و چارەوە مرۆڤ تووش دەبێت.

٦- دەرکەوتووە لەڕێگەی مێش و مەگەزیشەوە دەگوێزرێتەوە.

- نەخۆشی تای ماڵتا لە مرۆڤدا بەهیچ شێوەیەك کۆنتۆرڵ ناکرێت گەر لەئاژەڵدا نەخۆشی بەراوێتە کۆنترۆڵ نەکرێت، چونکە سەرچاوەکەی ئاژەڵ و بەرهەمەکانی یەتی و مرۆڤ بە بەردەوامی دەناڵێنێت و لەڕوو جەستەیی و ئابووری یەکی دەخات،هەر لەبەر ئەمەش پێویستە لەسەر گشت کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بایەخێکی تایبەتی بەم نەخۆشیە بدرێت و هاوڵاتیان لەگوندو شارەکاندا هۆشیار بکرێنەوە بەبەردەوامی بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تەندروستی لەنێوکۆمەڵگای کوردەواری.

- دیاری کردن و کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی یەکە لەئاژەڵدا.

- دیاری کردنی بەکتریای برۆسێلا بە وەرگرتنی "Smears" لە گەدەی پزی بەراویتەبوو یان لەپزدان لەدەردراوی زێ ی ئاژەڵی بەرواویتە بوو.

- بەکارهێنانی پشکنینە سیرۆلۆجی یەکان: Serological tests کەپێویستە دوای دوو هەفتە (١٤ڕۆژ) لە پرۆسەی بەراویتە بوون ئەنجام بدرێت لەوانەش:

1- Rose Bengal test
2- Milk Ring test
3.Card tests.
4.ELISA.
5. Complement Fixation test.

بە مەبەستی کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی بەراویتە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا پرۆسەی بنەبڕکردنی یان ریشە کێش کردن"Eradication" دەست نیشان کردنی ئاژەڵە تووشبووەکان لەڕێگەی پشکنینی سیرۆلۆجی لەئەنجامدا لەناوبردن و ناردنی ئاژەڵە سەربراوەکەکان بۆ قەسابخانە، بەمەش ناوچەکە پاك دەبێتەوە لەنەخۆشی یەکەو پێویستە لە وڵاتی کوردستانیش بیر لەم جۆرە پرۆگرامە بکرێتەوە بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی بەراویتە.

**- چارەسەر کردن:**

بەپێی سەرچاوە زانستی یەکان چارەسەری نەخۆشی بەراویتە لە ئاژەڵدا هیچ

ئـەنجامێکی ئـەوتۆی نابێـتو سـەرکەوتوو نابێـت، ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی برۆسـێلا لەناوخانەکاندا ژیان دەباتە سەرو دەرمـان بەتـەواوی ناگاتـە نـاو خانـەکان لەبـەر بـوونی پەردە خانە کەو بەربەستێك کاردەکات.

**سەرچاوە:**


1- Radositis. O.M. Gay. C.C, Blood. D.C. and Hitinchciff, K.W. 2000. Veterinary Medicine a text book of the disease of cattle, sheep, Pigs, Goats and horse, 9th ed. W. B. Saunders.

٢-ناميلکەی تای مالّتا- نووسينی : د.کاوە دزەيی.

٣- کتێبی الامراض المشترکة بين الانسان والحيوان. Zoonoses نووسـينی د. صـباح العلوچـی، و د. عبدالحسين بيرم.

4. Roberts, S. J. 1986. Veterinary Obstetrics and Genital Disease (Theriogenology)

# نەخۆشی گوان یەشە

**(Mastitis)**

گوان Mammary gland یان Udder هەروەکو کارگەیەك وایە بۆ دروست کردنی شیر، کەبەخۆراکێکیگرنگو سەرەکی دادەنرێت، مرۆڤ بەشێوەیەکی راستەوخۆو ناراستەوخۆ سوودی لێ وەردەگرێت.

پەککەوتنو لەکارخستنی ئەم کارگەیە بێ گومان دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی بەرهەمی شیر، یەکێك لەو نەخۆشیانەی کەدبێتە هۆی پەککەوتنو لەکارخستنی گوان نەخۆشی (گوان یەشە)یە کەبەیەکێك لەدوژمنە ترسناکەکانو بردەوامەکانی کێڵگەکانی بەخێوکردنی مانگای شیر دادەنرێت. لەرووی ئابوورییەوە نەخۆشی گوان یەشە لەئاژەڵدا بەیەکێك لەو نەخۆشییانە نەخۆشی گوان یەشە لەئاژەڵدا بەیەکێك لەو نەخۆشییانە دادەنرێت کەبەبەردەوامی زەرورو زیانی گەورە بەخاوەن ئاژەڵو وولات دەگەیەنێت، لەو زیانانەی کەگوان یەشە دەیگەیەنێت بریتین لە:

– کەم بوونەوەی رادەی بەرهەم هێنانی شیر.

– فرێ دانو لەناو بردنی ئەو شیرەی کە لەمانگای نەخۆشدا هەیەك

– لەرووی داراییەوە پێویستی بەمەسرەفێکی زۆر هەیە.

– گوان یەشە پێویستی بە بەدواداچوونو چاودێری زیاتر هەیە.

– خزمەت گوزاری ڤێترنەری زۆری دەوێت بۆ کۆنترۆڵ کردنو چارەسەرکردن، کەئەمەش بێ گومان پێویستی بەکاتی زیاتر هەیە.

– پاشماوەی دەرمان Antimicrobial residue برەکەی زیاتر دەبێت لەشیری گوانێکی چارەسەر کراوە.

بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکیی ڤێترنەریی رێژەی بڵاوبوونەوەی هەوکردنی گوان لەنێو مانگای شیردا دەگاتە ٥٠٪.

- گوان یەشە Mastitis

گوان یەشە زاراوەیەکە زیاتر لەنێو ئەو کەسانەدا بڵاوە کەبەئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن وەکو بەخێوکردنی مانگاو مەڕو بزن، بەڵام لەڕووی زانستیەوە گوان یەشە واتە هەوکردنی شانەکانی گوان لەسەرچاوەکانی پزیشکیی ڤێتتێرنەری پێی دەوترێت Mastitisو عەرەب پێی دەڵێن (التهاب الضرع).

هەوکردنی گوان بریتیە لەهەوکردنی شانەکانی گوان کەئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی پێکهاتەی شیر لەڕووی کیمیاییو فیزیاییەوە (وەکو گۆڕانی ڕەنگی شیرەکەو خەست بوونەوەو مەیینیو هەروەها زیادبوونی ژمارەی خڕۆکە سپییەکان لەشیردا)، دەبێتە هۆی تێك شکاندنو تێکچوونی خانەو شانەکانی گوان (بەوەی گوانەکە دەئاوسێتو قەبارەی گەورە دەبێتو بەئازارە لەکاتی دەست لێداناو هەندێك جار شانەکانی گوان ڕەقو تونـد دەبن لەئەنجامی Fibrosis.

هۆکاری هوکردنی گوان لەئاژەڵدا بەشێوەیەکی گشتی زۆرنو هەمەجۆرن لەبەکتریاو ڤایرۆسو کەڕووەکانو مایکۆپلازما.

هەوکردنی گوان دوو جۆری سەرەکی دەگرێتەوە:

**یەکەم: Contagion Mastitis**

بەو جۆرەیان دەگوترێت کەتووشی گوانی مانگایەك دەبێتو نەخۆشییەکە لەوەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مانگایەکی دیك ئەمەش لەڕێگەی ئەو کەسانەی کەخەریکی مانگا دۆشینن بەهۆی دەستیانەوە هۆکاری نەخۆشخەر دەگوێزنەوە، یاخود بەهۆی ئەو کەلو پەلانە کەبەکاردەهێنرێت لەکاتی مانگا دۆشیندا.

لەو میکرۆبانەی کەزیاتر دەبنە هۆی ئەم جۆرە هەوکردنە:

1- Strepto co ccus aglactia
2- staphyloco ccus aureus
3- Mycoplasma bovis

- ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە لەنێو مانگادا دەگاتە ٧- ٤- ٪.

**دووەم: Environmental Mastitis**

بەو جۆرەیان دەگوترێت کەسەرچاوەی بڵاوبونەوەی هۆکاری هەوکردنی گوان لەژینگەی ئاژەڵەکانەوە دەبێت، ئەمەش لەئەنجامی کەمتەرخەمی خاوەن ئاژەڵەوە بەوەی کەژینگەی بەخێوکردنی ئاژەڵەکان مەرجەکانی تەندروستی تێدا نییەو پاكو خاوێن نییە، بەوەی کەزۆرجار شوێنی بەخێوکردنیان ڕادەی شێ تیایاندا بەرزەو ئاوی وەستاوی تێدایەو پاشەڕۆی ئاژەڵەکان بۆ ماوەیەکی درێژ کەڵەکە دەبێت لەئەنجامیشو مەگەز کۆدەبێتەوە کەئەمەش بێ گومان ڕێگە خۆشکەرە لەبەردەم بڵاوبونەوەی نەخۆشی هەمەجۆر بەگشتیو هەوکردنی گوات بەتایبەتی.

لەو میکرۆبانەی کەزیاتر دەبنە هۆی ئەم جۆرەیانو لەژینگەی ئاژەڵ دا بڵاوە: =Co= liform ba cteria

وەکو:

*- Escherchia Coli.

*- Klebsiella.

*- Enterobactor.

= Strpto co ccus spoecies

وەکو: *- Streptoco ccus dys agalactiae

*- Streptoco ccus uberis.

ئەم جۆرە هەوکردنە کەسەرچاوەکەی ژینگەیە بۆی هەیە لەزۆر کاتدا تەشەنە بکات وەکو کاتی مانگا دۆشینو کاتی نێوان مانگا دۆشین یاخود لەکاتی نەبوونی شیر (ك لەکوردەواریدا دەوترێت مانگاکە ووشکی کردووە).

– ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە هەوکردنە دەگاتە ١– ٢٪.

بەپێی سەرچاوەکان هەندێك هۆکار هەن کەپێیان دەڵێن هۆکارە ترسناکەکان کەڕێگە خۆشکەرن بۆ زیاتر تووشبونی هەندێك مانگا بەبەراورد لەگەڵ هەندێکی دیکە لەوانەش:

– تەمەن: تووشبوون بەنەخۆشی هەوکردنی گوان زیاتر لەمانگا بەتەمەنەکاندا

دەردەکەوێت وەك لەتەمەن بچوکەکان.

- جۆری مانگا: بەپێی لێکۆڵینەوەکان مانگای شیر Dairy Cattle زیاتر تووشی هەوکردنی گوان دەبێت بە بەراورد لەگەڵ مانگای گۆشت Beef Cattle.

– خرۆکە سپییەکان: زیاتر هەوکردنی گوان بڵاودەبێتەوە کاتێك ژمارەی خرۆکە سپییەکان کەم دەکات لەشیردا ئەمەش بەهۆی کەمبوونەوەی بەرگری جێگەیی Local immunity لەگواندا لەدژی میکرۆبە جۆربەجۆرەکان، خرۆکە سپییەکان وەکو (Neutrohil- Macrophage- Lymphocyte) وە پێشیان دەوترێت: Somatic Cell Count.

– مانگای خاوەن بەرهەمی شیری زۆر کەدەبێتە هۆی فراوانبوونی تیرەی کونی چڵی گوانی زیاتر بۆی هەیە گوانی هەو بکات.

– لەکاتی زاییندا بەتایبەت پێش چەند رۆژێك لەزایین کاتێك مانگای ئاوس گوانی ئاوبەند (Udder edema)ی پێوە دیارە زیاتر بۆی هەیە تووشی هەوکردن بێت.

– بەپێی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە کەمی ڤیتامین Selenium A ,E رێگە خۆشکەرن بۆ تووشبوون.

– ئەو ئاژەڵانەی کەگوانیان شۆڕبۆتەوە بەرەو زەوی ئەگەری تووشبوونیان بەهەوکردنی گوان زیاترە هەروەك لەمانگادا کەشێوەی توێکاری گوان وایە کەشۆڕبۆتەوە بەرەو خوار بەبەراورد لەگەڵ گوانی ماین کەمتر شۆڕبۆتەوەو لەئەنجامدا کەمتر تووشی هەوکردنی گوان دەبێت.

– بەپێی سەرچاوەکان روون بۆتەوە ئەو مانگایانەی کەبەرهەمی شیریان زۆرە زیاتر هەستیارترن بۆ تووشبوون بەگوان پەشە وەك لەو مانگایانەی کەبەرهەمی شیریان کەمترە چونکە رادەی بەرگری زیاترە لەدژی میکرۆبی نەخۆشییەکان.

– هەوکردنی گوان لەو مانگایانەدا دەردەکەوێت کەتووشی گیربوونی پزدان Retained Placenta بوون لەدوای زایین یاخود چڵی گوانیان بریندار بووە بەهەر هۆیەك بێت.

– ئەو ژینگانەی کەمەرجی تەندروستیان تێدا نییە بەسەرچاوەیەکی بەردەوام دادەنرێن بۆ ئەو میکرۆبانەی کەدەبنە هۆی تووشبوون بەهەوکردنی گوان.

**- گواستنەوەی نەخۆشی هەوکردنی گوان:**

– نەخۆشی هەوکردنی گوان بەهۆی کونی چلی گوانەکانەوە teat canal دەگوێزرێتەوەو بڵاودەبێتەوە، گەر سەرچاوەی گوانی هەوکردوو مانگایەکی دیکە بێت یاخود سەرچاوەی هۆکاری نەخۆشخەر ژینگەی ئاژەڵەکان بێت.

ئەمەش زیاتر لەمانگای شیردا ڕوودەدات، چونکە پرۆسەی مانگا دۆشین بەهۆی دەستەوە بێت یاخود بەهۆی ئامێری تایبەتەوە بێت یان هەر کەلوپەلێکی دیکە کەبەکاربێت گوێزەرەوەیەکی باشە بۆ گواستنەوەی هۆکاری نەخۆشخەر لەمانگایەکی گوان هەوکردوو بۆ مانگایە گوان ساغ.

– چۆنیەتی دروست بوونی نەخۆشییەکە Pathogenesis قۆناغەکانی دروست بوونی نەخۆشی هەوکردنی گوان Mastitis بریتین لە:

**<u>١– Invasion هێرش بردن</u>**

لەم قۆناغەدا هۆکاری نەخۆشخەر دەست دەکات بەپرۆسەی هێرش بردن لەدەرەوەی گوانەوە بۆ ناو شانەکانی گوان لەڕێگەی کونی چلی گونەوەو گەیشتن بەخانەو شانەکانی گوان.

**<u>٢– Infection تووشبوون</u>**

لەم قۆناغەدا کاتێك کەهۆکاری نەخۆشخەر لەشانەکانی گوان دایە، دەست دەکەن بەداشبوون و لەئەنجامدا زۆر بەخێرایی ژمارەیان زیاد دەکات و چوارچێوەی هێرش بردن سەر خانەکانی گوان فراوانتر دەبێت و چالاکیان زیاد دەکات و بەخێرایی بڵاودەبنەوەو هەندێکیان دەست دەکەن بەدەردانی ژەهر (Endotoxin) کەکاری نەخۆشخەرانەیان

زیادو بەهێز دەکات.

## ٣- Inflammation هەوکردن

لەم قۆناغەدا لەئەنجامی بڵاوبوونەوەی هۆکاری نەخۆشخەر بەشانەکانی گواندا، نیشانە کلینیکییەکان لەسەر گوانی هەوکردوو دەردەکەوێتو لەسەر لەشی ئاژەڵەکە بەشێوەیەکی گشتی لەوانەش وەکو: ئاوسانو گەرم بوونی گوان هەروەها هەندێك جار بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش، هەروەها دەبێتە هۆی گۆڕانی پێکهاتەی شیر لەڕووی کیمیایی‌و فیزیاییەوە.

- **نیشانە کلینیکییەکان** Clinical findings

نیشانە کلینیکییەکان بەشێوەیەکی گشتی بەندە لەسەر ئەو شێوە کلینکییە کەپێدا تێدەپەڕێت، بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری شێوە کلینیکییەکانی نەخۆشی هەوکردنی گوان بەپێی توندوتیژی هەوکردنەکە Severity پۆلین دەکرێن بۆ ئەم شێوانە:

**یەکەم: شێوەی سەروو تیژ Peracut form**

لەم شێوەیەدا گوان تووشی هەوکردنێکی زۆر توندو تیژ دەبێتو قەبارەی گەورە دەبێتو گەرم دەبێتو دەئاوسێتو زۆر بەئازارە لەکاتی دەست لێداندا. نیشانەکانیش هەموو لەش دەگرێتەوەو زۆرجار نەخۆشییەکە کوشندە دەبێتو ئاژەڵی تووشبوو مردار دەبێتەوە. لەو نیشانانەی کە لەسەر لەشی ئاژەڵی تووشبوو بەهەوکردنی گوان دەردەکەوێت لەکاتی بڵاوبوونەوەی هۆکاری نەخۆشخەر بەهەموو لەشدا Systemic response لەوانەش:

– Toxaemia: بڵاوبوونەوەی ژەهری بەکتریاکە بەخوێندا.

– Fever: بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵەکە.

- Tachycardia: خێرا لێدانی دڵ.
- Ruminal stasis: وەستانی کاری کەرشی ئاژەڵ.
- Recumbency: کەوتنی ئاژەڵەکە بەلایەکدا.

**دووەم: شێوەی تیژ: Acuto Form**

لەم شێوەیەدا گوان تووشی هەوکردنێکی تیژ دەبێتو قەبارەی گەورە دەبێتو دەئاوسێتو گەرم دەبێتو پێکهاتەی شیر دەگۆڕێت، بەڵام نەخۆشییەکە کوشندە نابێتو چارەسەر دەکرێت.

**سێیەم: شێوەی ژێر تیژ Subacute form**

لەم شێوەیەدا گوان تووشی هەوکردنێکی کەمترو هێواش تردەبێت بەبەراورد لەگەڵ شێوەکانی پێشووترداو شیری بەرهەم هێنراو ناسروشتیانە دەبێت.

لەم شێوەیەدا هیچ نیشانەیەکی کلینیکی لەسەر گوان بەتایبەتیو لەش بەشێوەیەکی گشتی نابینرێتو شیری بەرهەم هێنراو زۆر سروشتیانە دەبێت، بەلام ئەم شێوە کلینیکییەوە دەناسرێتەوە کەژمارەی خرۆکە سپییەکانی شیر زۆر زیاد دەکات کەپێی دەڵێن: (Somatic Cell Count) (SCC) بۆ دیاری کردنی ئەم شێوەیە پەنا دەبرێتە بەر پشکنینێکی تاقیگەیی کەپێی دەڵێن: (California Mastitis test) (CMT).

ئەم کارەش زیاتر لەکێڵگەکانی بەخێوکردنی مانگای شیر لەلایەن پزیشکی سەرپەرشتیارەوە ئەنجام دەدرێت.

**پێنجەم: شێوەی درێژخایەن Chronic form**

لەم شێوە کلینکییەوە هەوکردنی گوان، لەکاتی دەست لێداندا، گوانی تووشبوو ڕەق دەبێتو ڕەنگی دەگۆڕێتو هیچ نیشانەیەکی دیکەی لەسەر دەرناکەوێتو ماوەی چارەسەرکردن درێژدەبێتەوە بەوەی کەکاتێکی زۆری پێویستە، هەندێك جار گوانەکە

تووشی گانگرین دەبێت کە پێی دەڵێن:Gangrenous Mastitis.

لەم جۆرەدا بەشێکی گوانەکە ڕەق هەڵدەگەڕێتو بەرە بەرە لایە تووشبووەکە لەگوانەکە دەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی.

**- چارەسەرکردن و کۆنترۆڵی نەخۆشییەکە.**

چارەسەرکردنی نەخۆشی هەوکردنی گوان، بەندە لەسەر ئەو شێوە کلینیکییەی کەپێیدا تێپەڕدەبێتو هەروەها جۆری هۆکاری نەخۆشخەر Causative agent، ئەمەش بێ گومان دەبێت دوای دیاری کردنی شێوە کلینیکی نەخۆشییەکە لەلایەن پزیشکێکی شارەزاوەو هەروەها دیاری کردنی هۆکاری نەخۆشخەر بەهۆی تاقیگاوە بۆ ئەوەی چارەسەرکردنەکە ئەنجامێکی باش بدات بەدەستەوە، بەڵام هەمیشە پێویستە دروشمی (خۆپاراستن باشترە لەچارەسەر کردن) بەرزبکرێتەوەو کاری پێ بکرێت بەتایبەتی لەپاراستنی گوان بەشێوەیەکی دروست لەکێڵگەکانی بەخێوکردنی مانگای شیر (Dairy Cow) کەپێویستە لەلایەن پزیشکێکی ڤێتێرنەری بەئەزموونەوە سەرپەرشتی بکرێت.

لەکێڵگەکانی بەخێوکردنی مانگای شیر پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشییەکە:

– شوێنی بەخێوکردنی مانگاکان پێویستە ژینگەیەکی پاکو خاوێنی هەبێتو مەرجە سەرەکییەکانی تەندروستی تێدا بێت، بۆ ئەمەش پێویستە رۆژانە پاك بکرێتەوە بەئاوو ماددەی پاکژکەرەوە بەبەردەوامی.

– گوانی مانگاکان پێویستە بەبەردەوامی پاكو خاوێن رابگیرێت بەوەی پێش کاتی مانگا دۆشینو دوای کاتی مانگا دۆشین پاکژبکرێتەوە بەماددەی پاکژکەرەوە کەزیانی نەبێت بۆ گوانی مانگاکە، هەروەها ئەو کەسەی هەڵدەستێت بەکاری مانگا دۆشین پێویستە پاكو خاوێنی خۆی رابگرێتو کەلوپەلی تایبەتی بەکاربهێنێتو دەستەکانی زۆر پاکژ رابگرێت.

– قەلاچۆکردنی مێشو مەگەزو مشەخۆرەکانی وەکو ئەسپێو گەنە بەتایبەتی

لەوەرزی هاویندا.

- لەکاتی زایینی مانگاکاندا پێویستە زۆر بەووردی چاودێری گوان بکرێتو هەروەها لەکاتی شیرداندا Lactation و چارەسەکردنێکی بەپەلەی ئەو نەخۆشیانەی کە لەگەڵ پرۆسەی زایین دا ڕوودەدات وەکو گیربوونی پزدانو هەوکردنی گوێرەکەدان Endometritis.

- بە بەردەوامی لەلایەن پزیشکی سەرپەرشتیارەوە پشکنینی لەجۆرە: Clifornia Mastitis test ئەنجام بدرێت بۆ دیار کردنی هەوکردنی گوان لەشێوەی Subclinical Mastitis test ژێر کلنیکی.

**ئەو سەرچاوانەی سودیان لێ وەرگیراوە:**

1- Radostitis, O.M, Gay, C.C, Blood, D.C, And Hinchcliff, 2000.
Veterinary Medicine (A text book of the Diseases of Cattle, sheep, Pigs, Goats and Horses) 9th edition.
2- The Merck Veternay Manual 8th editin 1998.

## ڕوون كردنەوەیەكی زانستی دەربارەی:

# میكانیزیمی ژەهراوی بوون بەدەرمانی نەخۆشی زەردوویی پایرۆپلازمن Piroplasmin

### پێشەكی:

لەساڵی ١٩٩٣ لەشارۆچكەی قەڵادزێ لەئەنجامی بەكارهێنانی دەركانی نەخۆشی زەردوویی پایرۆپلازمن Piroplasmin بەشێوەیەكی نازانستی لەلایەن فەرمانبەرێكی تەندروستی ئاژەڵەوە بووە هۆی ژەهراوی بوونو مرداربوونەوەی نزیكەی (٨٠- ١٠٠) سەرمەڕی كوردی لەو ناوچەیەدا.

سامانی ئاژەڵ بەشێكی گرنگی سامانی نەتەوەیی پێك دەهێنێتو ژەهراوی بوونی ئەو ژمارە زۆرە زیانێكی گەورە بەئابووری وولات دەگەیەنێت.

هەر لەبەرئەمەش كەلێكۆڵینەوەو گەڕان بەدوای هۆیە زانستییەكانی ئەم ڕووداوە پزیشكیە ڤێتێرنەرییە بەئەركێكی زانستیو نەتەوەیی دادەنرێت.

هەر لەم ڕووانگەیە شەوە بەپێویستم زانی كەڕوون كردنەوەیەكی زانستیانە پێشكەش بكەم دەربارەی چۆنیەتی كاری ئەو دەرمانە لەلەشی ئاژەڵەكانو ئەو گۆڕانە ناسروشتیانەی كەبەسەر لەشی ئاژەڵەكان دا دێت.. بەهیوام كەلەخزمەتی گشتیدا بێت.

### نەخۆشی خوێن میزكە (بابیزیۆسز Babesiosis

نەخۆشی بابیزیۆسز Babesiosis یان Piroplasmosis لەزانستی پزیشكی ڤێترنەریدا بایەخێكی تایبەتی پێ دەدرێت چونكە تووشی مرۆڤو ئاژەڵ دەبێت واتە یەكێكە لەنەخۆشییە هاوبەشەكانی نێوان مرۆڤو ئاژەڵ. ئەم نەخۆشییە لەگەلێك شوێنی جیهاند هەیەو بڵاوە بەتایبەتی لەناوچە گەرمەكانداو لەكوردستانیشدا لەوەرزەكانی هاویندا زیاتر بڵاودەبێتەوە چونكە لەو وەرزەدا گەنە بەشێوەیەكی خێرا گەشە دەكەنو زۆر دەبنو

بلاودەبنەوە لە لەوەڕگاکاندا.

گەنە هەروەك گوێزەرەوەیەکی بایۆلۆجی کاردەکات چونکە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەگواستنەوەی نەخۆشی بابیزیۆسز لەرێگەی مژینی خوێنی ئاژەڵێکی تووشبوو بەم نەخۆشیەیە. هەر لەبەر ئەمەش بەم نەخۆشیەیە دەوترێت:

## تای گەنە (Tick Fever).

ئەم نەخۆشیەیە تووشی زۆربە ئاژەڵەکان دەبێت بەتایبەتی مەڕوبزنو گاو مانگاو ئەسپو سەگو پشیلە هەروەها لەرێگەی گەنەوە بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە.

هۆکاری ئەم نەخۆشیەیە لەمرۆڤو ئاژەڵ دەگەڕێتەوە بۆ مشەخۆرێکی خوێن (Blood Parasite) سەر بەکۆمەڵەی زیندەوەرە سەرەتاییەکانە (Protozoa) کەبەشێکی سەرەکی لەسوڕی ژیانی لەگەنەدا بەسەر دەباتو هەر لەرێگەی گەنەشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاژەڵ یان مرۆڤ ئەم زیندەوەرە سەرەتاییە پێی دەوترێت:

**بابیزیا** (Babesia).

لەعێراقدا بەگشتیو لەکوردستاندا بەتایبەتی دوو جۆری سەرەکی هەیە کەتووشی مەڕو بزن دەبێت:

١) Babesia motasi

٢) Babesia Ovis

### لەنیشانە گرنگەکانی ئەم نەخۆشییە لەمەڕو بزندا:

یەکەم: بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشی ئاژەڵ!ی تووشبوو کەدەگاتە نزیکەی (٤١–٤٢) پ.س.

دووەم: بلاْبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لەگەنە بەناو لەشی ئاژەڵی تووشبوو کەقەبارەیان گەورەیە.

سێیەم: ئاژەڵی تووشبوو لاواز دەبێتو بێ هێزی پێوە دیارەو لە لەوەڕ دەکەوێتو لەئەنجامدا توانای کاوێژ کردنی نامێنێت.

چوارەم: ڕەنگی میزی ئاژەڵی نەخۆش ڕەش دەبینرێت کەپێی دەوترێت (Hemoglobinuria)

واتە بوونی ڕێژەیەکی زۆر لەهیمۆگلۆبین لەمیزدا.

(لەبەرئەوەی (Babesia) بابیزیا هەروەك مشەخۆرێکی خوێن دەچێتە ناو خڕۆکە سورەکانی خوێنی ئاژەڵی تووشبوو وەدەست دەکەن بەدابەشبوونو زۆربوون تیایداو لەئەنجامدا دبنە هۆی تێك شکاندنی ژمارەیەکی زۆر لەخڕۆکە سوورەکان بەشێوەیەکی ناسروشتیو زیادبوونی ڕێژەی هیمۆگلۆبین لەخوێندا).

پێنجەم: کەم خوێنی لەجۆری (Hemolytic anemia).

شەشەم: دوای مردار بوونەوەی ئاژەڵە ڕەنگی لاشەکە زەرد هەڵدەگەڕێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کەلەناو خەڵکدا بەنەخۆشی زەردوویی (Icterus) ناودەبرێت.

## دەرمانی پایرۆپلازمن Piroplasmin

پایرۆپلازمن یەکێکە لەو دەرمانانەی کەبەشێوەیەکی سەرەکی بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی Babesiosis یان Piroplasmosis.

پایرۆپلازمن سەر بەکۆمەڵەی (Quinuronium Dervatives) کەلەپێکهاتنیاندا ماددەی (Quinoline)و یوریا هەیەو چالاکانە کار دەکات دژی زۆربە جۆرەکانی بابیزیا Babesia.

ئەم دەرمانە لەڕێگەی ژێر پێستو (Subcutaneous) (SIC) بەکاردەهێنرێت بەڕێژەی سروشتیەکەی کەلەزۆربەی سەرچاوە تایبەتیەکانی دەرمانی زانی دادەنرێت بە (1mg\kg B.w.) واتە ١ ملگ بۆ هەر یەك کیلۆگرام لەکێشی ئاژەڵەکە.

بەڵام بەکارهێنانی ڕێژەیەکی زیاتر لەو ڕێژە سروشتیەی خۆی هەروەك لەشاری قەڵادزێ ڕوویدا لەلایەن فەرمابنەرێکەوە دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونو مرداربوونەوەی

ئاژەڵەکان، چونکە دەرمانی پایرۆپلازن بەڕێژەیەکی زیاتر (ژەهراوی) دەبێتە هۆی نەهێشتنی چالاکی ئەنزیمێك لەلەشی ئاژەڵەکەدا کەپێی دەوتارێت (Cholinestrase) (کۆڵن ئێسترەیز)، بەنەمانی چالاکی ئەم ئەنزیمە لەلەشدا دەبێتە هۆی زیادبوونی چالاکی ئەنزیمە لەلەشدا دەبێتە هۆی زیادبوونی ماددەیەك کەپێی دەوترێت ئەسیتیل کۆڵن (Acetyl Cholin) لەئەنجامدا ئەسیتیل کۆڵن بەشێوەیەکی ناسروشتی کاردکاتە سەر زۆربەی کۆئەندامەکانی لەش هەروەك لەهێڵکارییەکەدا ڕوون کراوەتەوە، بەلام مرداربوونەوەی ئاژەڵەکان لەئەنجامی کاری (Ach) بۆ سەر کۆئەندامی هەناسەدانە بەتایبەتی کەدەبێتە هۆی گرژبوونی ماسوولکەکانی کۆئەندامی هەناسە (Broncho Constriction).

لەئەنجامدا کەم بوونەوەی گالزی ئۆکسجینی ($O_2$) پێویست بەشانەکانی لەش کەدەبێتە هۆی مرداربوونەوەی ئاژەڵەکان (Death)، هەروەك لەهێلکارییەکەدا بەشێوەیەکی زانستیانە ڕوون کراوەتەوە.

**Toxic Doses of Piroplasmin**



## تا تەندروستی ئاژەڵ پارێزراو نەبێت تەندروستی مرۆڤ پارێزراو نابێت!!

مێژووی پێکەوە ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ وەك دوو زیندەوەری سەرەکی سەر رووی زەمین، مێژوویەکی دێرینی هەیە و لەهەموو سەردەمەکانیشدا لەژینگەیەکدا ژیاون و لەیەکتری نزیك بووینەتەوە و هاوکاری یەکتریان کردووە، لەئەنجامدا سوودیان بەیەك گەیاندووە.

ئاژەڵ بەشێوەیەکی گشتی لەرووی کۆمەلایەتی و ئابوورییەوە سوود بەمرۆڤ دەگەیەنێت، بەوەی لەرووی کۆمەلایەتیەوە هاورێیەکی بەوەفای مرۆڤە، لەئەنجامی ئەو هاورێیەتییەدا مرۆڤ هەست بەتەنهایی ناکات و کاتێکی خۆش و بەختەوەر دەباتەسەر، کار گەیشتۆتە ئەوەی کە ئاژەڵەکەی لەگەڵیدا دەژیت لە ماڵەکەیدا و بەشداری خواردن و خواردنەوەی دەکات بەتایبەتی لە کۆمەلگا پێشکەوتووەکاندا.

لەرووی ئابوورییەوە ئاژەڵ وەك یەکەیەکی ئابووری سەیر دەکرێت و بەسەرچاوەیەکی ئابووری گرنگ دادەنرێت بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی مرۆڤ و لەرووی خۆراکیشەوە بەسەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی پرۆتین دادەنرێت کەلە رێگەی بەرهەمەکانییەوە مرۆڤ بەکاری دەهێنێت.

لەرووی تەندروستیشەوە پەیوەندییەکی گرنگ هەیە لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا بەوەی ئاستی تەندروستی لەئاژەڵ و باڵندەدا کاریگەری هەیە لەسەر ئاستی تەندروستی و بەرگری لەمرۆڤدا واتە هەتاکو تەندروستی ئاژەڵ پارێزراوبێت و دووربن لە دەردو نەخۆشی ئەوا بەهەمان شێوە تەندروستی مرۆڤ پارێزراو دەبێت و دوور دەبن لە دەردو نەخۆشییەکان وە بەپێچەوانەشەوە راستە.

دیارترین نموونە بریتییە لە یەکێك لەو نەخۆشییە هاوبەشانەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ کەپێی دەوترێت ( BruCellosis ) یان تای ماڵتا کە سەرچاوەی نەخۆشییە کە لەئاژەڵدایەو هۆکاری نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی بەراویتەبوونی ئاژەڵی ئاووس و لەئەنجامدا لەرێگەی بەکارهێنانی بەروبوومی ئاژەڵەوە وەکو شیرو پەنیرەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و تووشی چەندەها کێشەی تەندروستی و ئابووری دەکات.

بیرکردنەوە لەبنبرکردن و ریشەکێشکردنی نەخۆشی تای ماڵتا پێویستە لەئاژەڵەوە

دەست پێ بکات و لەئاژەڵدا بنبڕ بکرێت چونکە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت لەمرۆڤدا بنبڕ بکرێت و کۆنترۆڵ بکرێت، کەواتە پلان دانان بۆ کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ ( zoonoses ) پێویستە لە ئاژەڵەوە دەست پێ بکات.

(بەپێی سەرچاوەکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی who ژمارەی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ گەیشتۆتە ( ٨٥٠ ) نەخۆشی).

وە لەزانستی پزیشکیدا و لە زۆربەی داهێنانە پزیشکییەکاندا وەك دۆزینەوەی دەرمانێکی نوێ لەلایەن کۆمپانیاکەوە بۆ یەکەمجار دەرمانەکە لەسەر ئاژەڵ تاقی دەکرێتەوە و تێبینی ئەنجامەکانی دەکەن و لەدواییدا دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، لەبەر ئەوە پێویستە هەماهەنگی و هاوکارییەکی تەواو هەبێت لەنێوان دەزگا تەندروستییەکان و دەزگا ڤێترنەرییەکان.

لەلایەکی دیکەوە دەرمانە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ بایەخی لەرووی تەندروستییەوە کاریگەرییان لەسەر لەشی مرۆڤ هیچیان کەمتر نییە لەکاریگەری نەخۆشییە هاوبەشەکان، چونکە ئەو دەرمان و هۆرمۆنانەی کە بەکاردەهێنرێت بەبەردەوامی لەچارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی ئاژەڵ و باڵندە و هەروەها بەمەبەستی قەڵەوکردنی ئاژەڵەکان، لەئەنجامدا برێك لەو ماددانە رۆژانە لەرێگەی بەکارهێنانی گۆشت و هێلکە و بەرهەمەکانی ئاژەڵەوە دەگوێزرێتەوە وەبۆ لەشی مرۆڤ و بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێ بکات کەبەمەش دەوترێت پاشماوەی دەرمان، ( drng residues ) کە بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی روودانی دیاردەی ( bactierial resistance ) واتە بەدەستهێنانی بەرگری لەلایەن بەکتریاکان لەدژی دژەژیانەکان و تێکچوونی هاوسەنگی هۆرمۆنەکان ..هتد.

لەبەر ئەوەی پێویستە توێژینەوەی هاوبەش ئەنجام بدرێت، لەنێوان پسپۆری تەندروستییە جیاجیاکانداو هاوکارییەکی تەواو هەبێت لەنێوان ئەو کۆمەڵە و سەندیکایانەی کە پەیوەندییان هەیە بە تەندروستی مرۆڤ و ئاژەڵەوە و هەروەها کار بکرێت لەوەزارەتی تەندروستی لەحکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ دامەزراندنی

سەنتەرێکی تایبەت بەمەبەستی زانیاری کۆکردنەوەو ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر ئەو نەخۆشییە هاوبەشانەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ کەلە کوردستاندا هەیە.

## نەخۆشی دەردە پشیلە Toxoplasmosis

پشیلە ئەو زیندەوەرەیە کە بە بەردەوامی لەگەڵ ژینگەی مرۆڤدا دەژی و ڕۆچانە چەندەها پشیلە لە حەوشەی ماڵەکاندا دەبینرێت و هەندێك کەسیش هەن لە ماڵەکانیاندا بەخێوی دەکەن،لە رووی تەندروستییەوەپەیوەندی لە نێوان پشیلە و مرۆڤدا هەیە بەوەی کۆمەڵێك هۆکاری نەخۆشی ترسناك لە پشیلەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ لە ئەنجامدا زیان بە تەندروستی و ئابوریيان دەگەیەنێت.دەردە پشیلە لەو نەخۆشیانەیە کە هۆکارەکەی مشەخۆرێکە لە پشیلەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و بەتایبەتی زۆر لە خانمان بەدەست ئەم نەخۆشییەوە دەناڵێنن بەوەی دەبێتە هۆی لەبار چوونی منداڵ لەژنی سکپڕداو زیان گەیاندن بە کۆرپەلەکەی.هەر لەبەر گرنگی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ بە پێویستی دەزانین کەداوا لە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی و وەزارەتی تەندروستی بکەین کە سێنتەرێك بکرێتەوە بە ناوی سێنتەری نەخۆشیە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ کە تیایدا کۆمەڵێك لە پزیشکانی ڤێتێرینەری کاربکەن بەمەبەستی زانیاری کۆکردنەوە و توێژینەوە لەسەر ژمارەی ئەو نەخۆشیە هاوبەشانەی کە لە کوردستاندا هەن.

دەردەپشیلەچی دەگەیەنێت :

لە کۆمەڵگەی کوردەواری بە نەخۆشیەکە دەوترێت دەردە پشیلە،ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی کە هۆکاری نەخۆشیەکە لە پشیلەدا هەیەو لەویشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاژەڵەکانی دیکە و مرۆڤ.لەسەرچاوەکاندایێی دەڵێن "Toxoplasmosis'.

دەردە پشیلە لە گشت وڵاتانی جیهاندا بڵاوەو تووشی زۆربەی ئاژەڵە شیردەرەکان و باڵندە و مرۆڤ دەبێت.

زۆر هۆکار هەن کەکاریگەرییان لەسەربڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە هەیە لەوانەش ڕێژەی باران بارین و پلەی گەرمی دەوروبەروهۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووریش .

بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرینەری ڕێژەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە زیاددەکات کاتێك پلەی گەرمی دەوروبەرو ڕادەی شێ بەرز دەبێتەوەو ڕیژەکەی کەم دەکات کاتێك پلەی گەرمی دەوروبەر نزم دەبێتەوە

هێلکۆکەی مشەخۆرەکە"Oocysts" بەرهەڵستی زۆر لە هۆکارە ژینگەییەکان دەکات بەتایبەتی لە کاتی بەرزبوونەوەی ڕادەی شێ و بەشێوەیەك کە بەزیندوویی و چالاکی دەمێنێتەوە بۆچەندمانگێك تا چەندساڵێك هەروەها بەرهەڵستی پلەی بەستن و شك کردنەوە دەکات بۆچەند مانگێك.

بەپێی توێژینەوەی ماستەرنامەی ( د. شادان حسن عبدالله ) مامۆستا لە کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرینەری لە زانکۆی سلێمانی ڕێژەی بلأوبوونەوەی نەخۆشی دەردەپشیلە لەنێو مەڕوبزندا لەناوچەی سلێمانی گە یشتۆتە٥٠٪ ، پشیلە بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنرێت لەگواستنەوەی نەخۆشیەکە بۆ مرۆڤ .

هۆکاری نەخۆشیەکە:

هۆکاری نەخۆشی دەردەپشیلە دەگەڕێتەوە بۆ مشەخۆرێکی سەرەتایی" Protozoan paratsite" کەپێی دەوترێت تۆکسۆپلازما کەلەناو خانەکاندا جێگیردەبێت و ناوەزانستییەکەی بریتیە لە: Toxoplasma gondiiوشەی تۆکسۆپلازما لەوشەیەکی یۆنانی وەرگیراوەو لە دوو برگە پێکهاتووە:

Toxon= واتە کەوانەیی (لەمانگی یەك شەوە دەچێت ).

Plasma= واتە شێوە.

مشەخۆرەکە لەمانگی یەك شەوە دەچێت بەوەی کەشێوەکەی کەوانەییە،هەربۆیەعەرەبیش پێی دەڵێن داو القوسات واتە" دەردەکەوانەییەکان".

بۆیەکەم جار نەخۆشییەکە لەساڵی١٩٠٠ ز لەلایەن زانا "Laverna" دۆزراوەتەوە .

نەخۆشی دەردەپشیلە لە مرۆڤدا لەساڵی ١٩٢٣ ز لەلایەن زانا "Janku"دەست نیشان کراو لەسەگدا لەساڵی ١٩١٠ لەلایەن Mello و لە پشیلەدا لەساڵی ١٩٤٢.لەعێرِقدا بۆیەکەم جار نەخۆشییەکە لەساڵی ١٩٣٩ دەستنیشانکرا .پشیلەی کێوی و ماڵی بە خانە خوێی هەمیشەیی مشەخۆرەکە دادەنرێن و ناوەندە خانە خوێی مشەخۆرەکەش بریتین لە مرۆڤ و باڵندە و ئاژەڵە شیردەرەکانی دیکە.

سوڕی ژیانی تۆکسۆ پلازما لە دوو بەش پێکهاتووە:

یەکەم: توخمە سووڕ "sexual cycle " کە لە ناو لەشی پشیلەدا روودەدات.

دووەم: ناتوخمە سووڕ "asexual cycle" کە لە لەشی پشیلە و ناوەندە خانە خوێنییەکانی وەکو مرۆڤ و باڵندە و ئاژەڵەکاندا روودەدات.مشەخۆری تۆکسۆپلازما بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت کە لە ڕێگایانەوەتوانای تووشکردنی "infectious stages"هەیە ئەوانیش:

١. Tachyzoites تاکی زۆتیسن : ئەم قۆناغەیان زۆر بە خێرایی دابەش دەبێت و زۆر دەبێت لە کاتی شێوەی توندی نەخۆشییەکە لە ناوەندەخانە خوێکان.

٢.Brady zoites برادی زۆیتس: ئەم قۆناغە لە کیسی شانەکاندا"Tissue cysts" دا هەن.

٣. Oocysts هێلکۆکەکان لە پاشەڕۆی پشیلەدا هەن و سپۆرۆزۆیتیان"Sporozoites" تێدایە.هێلکۆکەکان بە قۆناغێکی سەرەکی تووشکردن دادەنرێن کە بە ژمارەیەکی زۆر لە پاشەڕۆی پشیلەدا بوونیان هەیە و دەبێتە هۆی سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە ئاژەڵە گیاخۆرەکان (ناوەندە خانە خوێکان) دوای ئەوە هێلکۆکەکان لە لەشدا هێرش دەکەنە سەر شانە جۆر بەجۆرەکانی لەش و دەبێتە هۆی دروست بوونی قۆناغی بەکیس بوون لە شانەکاندا "Tissue cysts" کە ئەمەش دەبێتە هۆی تێکشکاندن و لەناوچوونی کۆئەندامی دەمار و ماسولکەکانی دڵ و سییەکان وهەروەها وێلاش ل مرۆڤدا و پزدان لە ئاژەڵدا.

گواستنەوەی نەخۆشییەکە:

سەرچاوەی تووشبوون بە دەردە پشیلە دەگەڕێتەوە بۆ :

یەکەم: پاشەڕۆی پشیلە : Cat Feces بوونی هێلکۆکەی مشەخۆرەکە لە پاشەڕۆی پشیلەی ماڵی و کێوی دا بە ڕێگەیەکی سەرەکی گواستنەوەی نەخۆشییەکە دادەنرێت لە کێڵگەکان و ناوچە کشتوکاڵییەکان لە مەڕ و بزن و مانگا و ئەسپ دا،پشیلەش تووش دەبێت لە ئەنجامی بەکارهێنانی شانە تووشبووەکانی ناوەندە خانە خوێنییەکان وەکو مشکی تووشبوو یان باڵندەی تووشبوو،کە لە دوای نزیکەی دوو هەفتە پشیلەی تووشبوو هێلکۆکەکانی مشەخۆرەکە لەڕێگەی پاشەڕۆکانی یەوە دەردەداتە دەرەوە بەژمارەیەکی زۆرو بەبەردەوامی کە ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە.بەپێی سەرچاوەکان پەنجاگرام لە پاشەڕۆی پشیلەی تووشبوو نزیکەی دە ملیۆن هێلکۆکەی مشەخۆرەکەیتێدایە.

دووەم: مشکی مردارەوە بوو : Dead Rodents هۆکارێکی دیکەیە بۆ گواستنەوەی دەردە پشیلە بۆ ئاژەڵی دیکەی وەکو بەراز.

سێیەم: مێش و مەگەز و لولپێچ و کرمی زەوی وەکو هۆکارێکی میکانیکی رۆڵیان هەیە بۆ گواستنەوەی هێلکۆکەی مشەخۆرەکە و هەروەها سەگیش هەروەك گوێزەرەوەیەکی میکانیکی دەبێتە هۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکە.

چوارەم:بە پێی سەرچاوەکان نەخۆشییەکە لە رێگەی تۆوەوە (Semen) لە بەرانی تووشبوەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاژەڵی ساغ.

نیشانەکان: نیشانەکانی نەخۆشی دەردە پشیلە لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی دیکە دەگۆڕێت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی نیشانەکان لەسەر مانگا و مەڕ و بزنی تووشبوو ئەوەیە کە هۆکاری نەخۆشی دەردە پشیلە بەشێوەیەکی سەرەکی دەبێتە هۆی بەراویتە بوونی ئاژەڵی ئاوس "Abortion" بە تایبەتی لە هەفتەی چوارەمی ئاوسیدا و هەروەها دەبێتە هۆی رووداني تێکچوونی بۆماوەیی،کە بێگومان بە نیشانەیەکی سەرەکی نەخۆشییەکە دادەنرێت.هەندێکجار نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی رووداني بۆمۆمیابوون"Mummified fetus" ئاژەڵی تازە لە دایك بوو زۆر بێ هێز و لاواز دەردەکەوێت و تووشی هەناسە برکێ و کۆکە دەبێت و لەشی دەلەرزێت بەرە بەرە دوای ٦-٢ رۆژ مردار دەبێتەوە.

دەردە پشیلە لە مرۆڤدا: Human Toxoplasmosis: دەردە پشیلە یەکێکە لە نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ و زیانی گەورە بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت و بەپێی توێژینەوەی ماستەرنامەی(د.شادان حسن عبدالله)مامۆستا لە کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرینەری لە زانکۆی سلێمانی رێژەی تووشبوون بە دەردە پشیلە لە مرۆڤدا لە ناوچەی سلێمانی گەیشتۆتە ٣٧,٦٣٪.دەردەپشیلە زۆرترلەومرۆڤانەدابلاودەبێتەوە کەئاستی بەرگری‌لەشیان زۆرنزمە " Immunocompromised" کەبەهۆی ئەونەخۆشیانەی کە دەبنەهۆی‌نزم بوونەوەی ئاستی بەرگری لەش وەکو نەخۆشی ئەیدزAIDS.نەخۆشی دەردەپشیلە دەبێتەهۆی هەوکردنی گرێ لیمفاوییەکانی لەش "Lymphadenitis" بەشێوەیەکی گشتی وئارەقکردنەوە لە لەشداوهەست کردن بەئێشێکی زۆر لە ماسولکەکانی لەش و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش.دەردەپشیلە

تووشی ژنی سکپڕدەبێت ولەڕێگەی ویلاشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کۆرپەلەکەی و دەبێتە هۆی تێکچوونی ئەندامەکانی لەشی وەکو کوێربوون یان گەورەبوونی سەر" Hydro cephaly" و ەروەها لەبارچوون" Abortion".

مرۆڤ تووشی دەردەپشیلە دەبێت بەهۆی:

یەکەم: خواردن وبەکارهێنانی گۆشتی نەکوڵاوی تووشبوو بەمشەخۆری نەخۆشییەکە.

دووەم: خواردنەوەو بەکارهێنانی ئاوی پیسبوو بەهێلکۆکەی مشەخۆرەکە بەهۆی پاشەڕۆی پشیلەوە.

سێیەم: بەهۆی خواردنی گەس وهەمبەرگری تووشبوووبەمشەخۆری نەخۆشییەکە.

چوارەم: بەهۆی گواستنەوەی خوێن وچاندنی ئەندامەکانی لەش لە یەکێکی تووشبووەوە بۆیەکێکی ساغ.

پێنجەم: بەهۆی دەست لێدانی قەسابەکان و هاوڵاتیان لە لاشەی ئاژەڵی تووشبوو و دەرکەوتووە کەهۆکاری نەخۆشییەکە لەڕێگەی پێستی بریندارەوە دەچێتەلەشەوە.

خۆپاراستن و چارەسەر کردن:بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی دەردەپشیلە لەقۆناغی توندی نەخۆشییەکە بەبەکارهێنانی هەردوو دەرمانی Sulphadiazine و Pyrimethamine سوودی دەبێت بەڵام هەمیشەخۆپاراستن باشترە لە چارەسەرکردن:

یەکەم: بڵاوکردنەوەی هۆشیاری تەندرووستی لەنێوهاوڵاتیانی گوندوشارەکاندا لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەکانەوە.

دووەم: قەلاچۆکردنی پشیلەی بەرەڵا لە ماڵەکانداوپاککردنەوەی حەوشەی ماڵەکان لە پاشەڕۆکانیان.

سێیەم: گۆشتی نەکوڵاوخاو نەدرێتە ئەوپشیلانەی کەلەماڵەکاندا بەخێودەکرێن وپاککردنەوەی شوێنەکانیان بەبەردەوامی.

چوارەم: بەدواداچوونی بەردەوام لەلایەن تیمەکانی تەندروستیەوە بۆئەو دوکانانەی کە گەس وهەمبەرگردەفرۆشن.

پێنجەم: کوڵاندنی گۆشتی ئاژەڵ و باڵندە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك بەمەبەستی لەناوبردنی مشەخۆرەکە.

شەشەم: ژنی سکپڕیەهیچ شێوەیەك نزیکی پشیلە نەبێتەوەو پێویستەدەست کێش بەبەردەوامی بەکاربهێنێت.

حەوتەم: پاککردنەوەی سەوزەو میوە بەشێوەیەکی زانستیانەو بە بەردەوامی پێش بەکارهێنانی.

ئەوسەرچاوانەی سودیان لێ وەرگیراوە:

١. کۆبونەوەی سەندیکای پزیشکانی ڤێتێرینەری بەئامادەبوونی بەڕێز د. تالب مراد(پسپۆڕ لە ڕێکخراوی FAO لەقاهیرە ).

٢. ماستەرنامەی د .شادان حسن عبدالله بەناونیشانی Seroprevalence and Isolation of Toxoplasma gondii in Sulaimani Provin Ce 2008

٣. Radostits ,O.M.,Gay,C. WG.,Blood,D.C.,and Hinchcliff,K. W.2000,Veterinary Medicine 9th edition.

## دەردەتووتی (psittacosis)

کوردستان لەبەر جوانی دیمەنەکانی و سازگاری ئاو و هەواکەیی و سروشتە شاخاوییەکەی وایکردووە گەلێك جۆری باڵندەی رەنگاورەنگ لە خۆبگرێت کە هەریەکەیان بە ئاوازێك دەخوێنێت کە بەشێوەیەکی وەها کە ئارامی و ئاسوودەیی بە مرۆڤ دەبەخشێت،ساڵانەش لە وەرزی کۆچ و رەودا پۆل پۆل باڵندەکان لە شوێنانی دیکەوە روودەکەنە کوردستان.باڵندەکانی وەك قەل و قاز و کۆتر و بولبل و کەناری و کەو و قەتێ و تووتی و چۆلەکە و پەرەسێلکە شێوەیەکی زۆر جوانیان هەیە و جوانیش دەبەخشنەوە بە دەوروبەریان و بوونەتە بەشێکی گرنگی ژینگەی کوردستان،لەبەر ئەوە پارێزگاریکردنیان و ئاراستەکردنیان بە شێوەیەکی دروست بە کارێکی گرنگ دادەنرێت و دەخرێتە چوارچێوەی پارێزگریکردن لە ژینگەی کوردستان.زۆر دەرد و نەخۆشی هەیە کە تووشی باڵندە هەمەجۆرەکان دەبن و لە ئەنجامدا لە جوانی و ئاواز خوێندنیان دەخەن و زیانیان پێدەگەیەنن لەوانەش دەردەتووتییە بەمەش بێگومان زیان بە ژینگەی کوردستان دەگات و هەروەها هۆکاری دەردەتووتیش دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و تەندروستی مرۆڤیش دەخاتە مەترسییەوە.خەڵکی کوردستان لە دێر زەمانەوە ئارەزوویان لە بەخێوکردنی باڵندە جۆربەجۆرەکانە و لەم سەردەمەشدا ژمارەی ئەو کەسانە روو لە زیادبوونە،لەبەر ئەوە بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەم نەخۆشییە بە کارێکی پێویست دەزانرێت بە مەبەستی روونکردنەوەی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤ و باڵندەکان.

### دەردە تووتی چی دەگەیەنێت؟

لە ناو خەڵکی کوردستاندا بەم نەخۆشییە دەوترێت دەردەتووتی و لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری بە "Psittacosis" یان "Ornithosis" ناو دەبرێت.دەردەتووتی تووشی زۆربەی جۆرەکانی باڵندە ماڵی و کێوییەکان دەبێت و بە پێی سەرچاوەکان تووشی مرۆڤ و پەلەوەر و هەندێك لە ئاژەڵە شیردەرەکانیش دەبێت و باڵندەکانی وەك تووتی و کەناری زۆر هەستیارن بۆ نەخۆشییەکە.بە پێی هەندێك لە توێژینەوەکان باڵندەکان لە زۆربەی تەمەنەکاندا تووش دەبن،بەڵام باڵندە تەمەن بچووکەکان زیاتر هەستیارترن بە تووشبوون لەوانی دیکە.زۆر هۆکاری ماندووکەر هەیە کە رێگەخۆشکەرن بۆ بەخێرایی بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە لەنێو باڵندەدا و

لەوانەش: کۆچکردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە،بەخێوکردنی ژمارەیەکی زۆر لە باڵندە لە شوێنێکی دیاریکراوی داخراودا،گۆڕانی کتوپڕ لە پلەی گەرمی و جۆری خۆراکداو تووشبوونی باڵندەکان بە نەخۆشی دیکە لەهەمان کاتدا وەك نەخۆشی Salmonellosis.نەخۆشی دەردەتووتی لە باڵندە نەخۆشەکانەوە بۆ ساغەکان دەگوێزرێتەوە بە هۆی تێکەڵبوون و پەیوەندی راستەوخۆ لە نێوانیان هەروەها بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەهۆی ریقنەی باڵندە نەخۆشەکانەوە هەروەها بەهۆی مێش و مەگەزیشەوە لە نەخۆشەکانەوە دەگوێزرێتەوە.بە پێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری دەردەتووتی یەکێکە لە نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ Zoonoses واتە هۆکاری نەخۆشییەکە لە باڵندەی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و لە ئەنجامدا مرۆڤ تووشی نەخۆشییەکە دەکات لە رێی کۆئەندامی هەناسەوە و نیشانەکانی لە مرۆڤدا لەسەر کۆئەندامی هەناسەوە دەردەکەوێت بەوەی دەبێتە هۆی روودانی هەوکردنی سییەکان بەتایبەتی لە مرۆڤە بەتەمەنەکان،ئەمەش زیاتر روودەدات لە ئەنجامی پەیوەندی راستەوخۆ لە نێوان باڵندە تووشبووەکان و مرۆڤەکاندا.

هۆکاری نەخۆشی دەردەتووتی:هۆکاری نەخۆشی دەردەتووتی بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ وردە زیندەوەرێك کە پێی دەوترێت کلامیدیا ناوە زانستییەکەی Chlamydia Psittaci کە بە شێوەیەکی ناچاری لەناو خانەکاندا دەژی.دەردراوی کۆئەندامی هەناسەدان و ریقنەی باڵندەکان ژمارەیەکی زۆر هۆکاری نەخۆشییەکەی تێدایە و بەرهەڵستی بارودۆخی ناهەموار دەکەن و بۆ ماوەیەکی درێژ توانای مانەوەیان هەیە بە چالاکی.کلامیدیا بە هۆی هەواو تۆز و خۆڵەوە بە ژینگەدا بڵاودەبێتەوە ئەو باڵندانەی کە پێشتر تووشی دەردەتووتی بوون و چاکبوونەتەوە هەڵگری هۆکاری نەخۆشییەکەن و بە بەردەوامی سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی کلامیدیان لە ژینگەدا.بە پێی سەرچاوەکان دوای وەرگرتن و گەیشتنی هۆکاری نەخۆشییەکە بە لەشی باڵندەکان لە رێی کۆئەندامی هەناسەوە یان کۆئەندامی هەرسەوە یەکسەر هۆکارەکە دەلکێت بە خانەکانەوە و بەرەبەرە بە لەشدا بڵاودەبێتەوە.

نیشانە دیارەکانی:بە پێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری ماوەی تووشبوونی باڵندەکان تا دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی پێنج بۆ شەست رۆژ دەخایەنێت و دەرکەوتنی نیشانەکان بەندە بە

چەند هۆکارێکەوە لەوانە: رادەی توندوتیژی هۆکاری نەخۆشخەر و جۆری باڵندەی تووشبوو و تەمەنی باڵندەی تووشبوو و ژینگەی باڵندەکان و بوونی نەخۆشی دیکە لە ژینگەی باڵندەکان.دروستبوونی نەخۆشییەکە بەوە دەست پێدەکات دوای چوونەژوورەوەی هۆکاری نەخۆشییەکە بۆ ناو لەش بەهۆی هەناسە وەرگرتنەوە،هۆکاری نەخۆشییەکە دەستدەکەن بە دابەشبوون و زۆر بوون بەتایبەتی لە خانەکانی سی و پەردەی دڵ و کیسە هەواییەکان airsac و لە ئەنجامدا لە رێی خوێنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ بەشەکانی دیکەی لەش وەك جگەر و سپڵ و گورچیلە کە تیایاندا زیاتر دابەش دەبن و ژمارەیان زۆر زیاد دەکات.ئەو نیشانانەی کە لەسەر باڵندەی تووشبوو دەردەکەوێت بریتین لە: –لووت و چاوی باڵندەی نەخۆش ئاو دەکات و پێڵووی چاوی و گیرفانەکانی لووتی هەودەکەن.

–باڵندەی تووشبوو تووشی سکچوون دەبێت و رەنگی ریقنەکەی سەوزێکی زەردباو دەبێت .

–باڵندەکە بێهێز دەبێت و چالاکی و جووڵەی کەم دەبێتەوە و پەرەکانی گرژدەبن.

–باڵندەی تووشبوو لە خواردن دەکەوێت و وورده وورده کێشی کەم دەکات.

–دوای توێکاری کردنی باڵندەی مردارەوەبوو ئەم گۆڕانانەی لەسەر دەردەکەوێت: گەورەبوون و نەرمبوونی قەبارەی جگەر و Hepatomegaly و سپڵ Splenomegaly، هەوکردن و سووربوونەوەی سییەکان Pneumonia، هەوکردنی کیسە هەواییەکان Airsacculitis،هەوکردنی پەردەی دڵPericarditis.رادەی لەناوچوونیش Mortalityrate دەگاتە ٣٠٪ .

دیاری کردنی نەخۆشییەکە: لە دیاری کردنی نەخۆشی دەردەتووتیدا پشت بە نیشانە کلینیکییەکان دەبەسترێت،واتە ئەو نیشانانەی کە لەسەر باڵندەی تووشبوو دەردەکەوێت،ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر باڵندەی مردارەوەبوودا دەردەکەوێت دوای توێکاری کردنی،جیاکردنەوە و دیاریکردنی جۆری هۆکاری نەخۆشخەر لە تاقیگە بەهۆی PCR,ELISA.

چارەسەر و کۆنترۆڵکردن: چارەسەرکردنی نەخۆشی دەردەتووتی لە باڵندەکاندا پێویستە بە جیاکردنەوەی باڵندە تووشبووەکان دەست پێبکات لە شوێنێکی تایبەتیدا هەروەها پێدانی ئەنتی بایۆتیك وەك تتراسایکلین و جۆرەکانی لە کلۆرتتراساکلین–ئۆکسی تتراسایکلین–دۆکسی سایکلین

کە کاریگەری باشی هەیە لە دژی کلامیدیا یان بەکارهێنانی ئەنتی بایۆتیك لە کۆمەڵەی Fluoro quinolones دەرکەوتووە ئەنجامێکی باش دەدات بەدەستەوە.بە مەبەستی کۆنتڕۆڵکردنی نەخۆشی دەردەتووتی پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

١.سنوورەکان و فڕۆکەخانەکان پێویستە بەدواداچوونێکی بەردەوام بکرێت بۆ ئەو جۆرە باڵندانەی کە دەهێنرێنە هەرێمی کوردستانەوە بەوەی لە کارانتیینەکان پشکنینی پزیشکییان بۆ بکرێت و دڵنیابن لە تەندروستی باڵندەکان.

٢.خاوێنکردنەوەی شوێنی باڵندەکان بە بەردەوامی بەتایبەتی لە ماڵاندا بە ماددەی پاکژکەرەوە کە لە کلینیکە ڤێتێرنەرییەکاندا دەست دەکەوێت.

٣.لە ماڵاندا شوێنی باڵندەکان جیابکرێتەوە و تێکەڵ بە ئەندامانی خێزانەکان نەبن،چونکە هۆکاری نەخۆشییەکە لە باڵندەی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ .

٤.پێدانی ماددە بەهێزکەرەکانی وەك ڤیتامین و کانزاکان بە باڵندە ماڵییەکان بە بەردەوامی بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرگری لەشیان.

٥.سەردانی کلینیکە ڤێتێرنەرییەکان بکرێت بە مەبەستی چاودێریکردنی تەندروستی باڵندە ماڵییەکان.

سەرچاوەکان:


1.Calnek,B.W.Barnes,H.J.,Beard,C.W.,Reid,W.M.,andYoder,H.W, 1991.
Diseases of Poul try.9th edition,Iowa state university press,USA.
2.Jordan,F.T.W.,and Pattison,M.,1998.PoultryDiseases.11thedition ,Saunders,UK.
3.The Merck Veterinary Manual,8th edition1998

## دەردەخەو Trypanosomiasis

لە هەندێ ولآتانی جیهاندا بەهاتنی وەرزی هاوین وبەرزبوونەوەی پلەی گەرمی بەردەوام لەژینگەدا گەلێك دەردو بەلآ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت کەدەبێتەهۆی زیان گەیاندن بەتەندروستی مرۆڤ وئاژەڵ وهەروەها هۆکارێکیشە بۆپیسبوونی ژینگە،دانیشتوانی ولآتانی کیشوەری ئەفەریقا بەدەست ئەونەخۆشیانەوە دەناڵێنن کەلەرێی مێش ومەگەزەوە بڵاودەبێتەوە،چونکە زیانی گەورە بەتەندروستیان دەگەیەنێت ، ئەمەش لەبەرئەوەی ژینگەی ولآتانی ئەفەریقا ژینگەیەکی لەباروگونجاوە بۆگەشەکردن و زۆربوونی مێش ومەگەزوگواستنەوەی مشەخۆری نەخۆشیەکان بۆلەشی مرۆڤ وئاژەڵ.دەردەخەوTrypanosomiasisیەکێکە لەونەخۆشیانەی کەبەهۆی جۆرێك لەمێشەوە لەئاژەڵی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆمرۆڤ و سالآنە مرۆڤ و ولآتانی کیشوەری ئەفەریقا تووشی کێشەی تەندروستی دەکات کەوا پێویست دەکات هاوولآتی کوردستانیش چەند زانیارییەکی هەبێت لەسەرنەخۆشی دەردەخەو.

دەردەخەو چی دەگەیەنێت؟

لەناوخەڵکیداپێیدەوترێت دەردەخەوبەپێی سەرچاوەکان ناوەزانستییەکەی بریتییە لە Trypanosomiasisلەهەندێك سەرچاوەی دیکەپێی دەوترێت نەخۆشی مێشی تسی تسی Tsetse flyئەمەش لەبەرئەوەی نەخۆشییەکە بەهۆی جۆرێك لەمێشەوە دەگوێزرێتەوە بۆمرۆڤ کە پێی دەوترێت مێشی تسی تسی ،ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت کەدەردەخەویەکێکە لەنەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ.دەردەخەوزیاتر لەولآتانی کیشوەری ئەفەریقابڵاوە ئەمەش لەبەرئەوەی مێشی تسی تسی لەو ولآتانەدا زیاتربوونی هەیەو هەروەها هەندێجار نەخۆشییەکە لەناوەراست وباشووری ئەمەریکادا تۆمارکراوە.زۆربەی ئاژەڵەماڵییەکان تووشی نەخۆشییەکە دەبن لەوانە مانگاو مەڕ و بزن و ئەسپ و بەراز هەروەها تووشی ئاژەڵی کێویش دەبێت.بە پێی یەکێك لە توێژینەوەکان کە لە ولآتی نایجیریا ئەنجامدرا دەرکەوت کە رێژەی تووشبوون بە نەخۆشییەکە لە رەشەولآخ گەیشتۆتە ٤,٣ ٪ و لە مەڕدا ١,٦ ٪ و لە بزندا ١ ٪.گواستنەوەی نەخۆشییەکە لە ئاژەڵێکی تووشبووەوە بۆ یەکێکی ساغ بەهۆی مێشی تسی تسییەوە دەبێت واتە ئەم جۆرە مێشانە وەك گوێزەرەوەیەکی بایۆلۆژی رۆڵیان هەیە لە گواستنەوەی نەخۆشییەکە لە ناوچەیەکەوە

بۆ ناوچەیەکی دیکە و مێشەکە زیاتر لە لەوەڕگاکاندا بڵاودەبنەوە و جێگیردەبن،لە چ ناوچەیەکدا بوویان بە چڕی هەبێت لەو ناوچانەدا زیاتر نەخۆشییەکە بڵاودەبێتەوە و بەردەوامی دەبێت.هەندێك هۆکار هەن کە ڕۆڵیان هەیە لە تووشبوون و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لەوانەش:

یەکەم: هۆکاری خانەخوێ:واتە هەندێك جۆری ئاژەڵ زۆر هەستیارە بە تووشبوون و هەندێکی دیکەیان بەرگری سروشتییان هەیە لە دژی نەخۆشییەکە و دەووترێت Trypanotoleran Ce.

دووەم: هۆکاری ژینگە:لەو شوێنانەی کە مێشی تسی تسی بە ژمارەیەکی زۆر بوونیان هەیە و بڵاوبوونەتەوە لە ئەنجامدا نەخۆشییەکە زیاتر تەشەنە دەکات و پەرەدەسێنێت.

سێیەم:هۆکاری تووشبوون و جۆرەکانی:بە پێی سەرچاوەکان دەرکەوتووە کە هەندێك لە جۆرەکانی توندوتیژترە و کاریگەری نەخۆشخەرانەی زیاترە وەك لەوانی دیکە و دەرکەوتووە ئەگەر ئاژەڵێك بە جۆرێکی دیاریکراو تووشبوو بۆی هەیە دووبارە بە جۆرێکی دیکەی هۆکاری نەخۆشییەکە تووشبێتەوە.

هۆکاری نەخۆشییەکە:هۆکاری دەردەخەو دەگەڕێتەوە بۆ مشەخۆرێکی خوێن کە پێی دەوترێت تریپانۆسۆماTrypanosoma کە زۆر جۆری هەیە و باوترین جۆریان بریتین لە Trypanosoma Vivax و Trypanosoma Congolense کە تووشی زۆربەی ئاژەڵەماڵییەکان دەبن بەتایبەتی گا و مانگا.تریپانۆسۆما بەشێك لە سوڕی ژیانی لە خانە ناوەند کە مێشی تسی تسییە بەسەر دەبات و هەر بەهۆی ئەویشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی دیکە.پرۆسەی تووشبوون بە تریپانۆسۆما لە ڕێی گازگرتنی مێشی تسی تسییەوە لە پێستی ئاژەڵێکی ساغەوە دەست پێدەکات و لە ڕێی لیکی مێشەکەوە مشەخۆرەکە دەچێتە لەشییەوە و لە ڕێی شلەی لیمفەوە یان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەگاتە سوڕی خوێنەوە و لە ئەنجامدا مشەخۆرەکە دەست دەکات بە دابەشبوون ژمارەیان زۆر زیاد دەکات و بڵاودەبنەوە بە هەموو لەشدا لە ڕێی کۆئەندامی سوڕانەوە.مشەخۆرەکە زیاتر ئارەزوویان لەو خانانە هەیە کە ناوپۆشی موولوولە خوێنەکان دەکەن و پێیان دەووترێت Endothelial Cells و تیایدا جێگیر دەبن و کۆدەبنەوە و دەگەنە ئەندامەکانی لەش وەك دڵ و مێشك و ماسوولکەکان و لە ئەنجامدا دەبنە

هۆی کەمخوێنی و تێکشکاندنی شانەکان و هەروەها دابەزینی ئاستی بەرگری لەشی ئاژەڵ یان مرۆڤی تووشبوو.

نەخۆشی دەردەخەو لە مرۆڤدا

نەخۆشی Trypanosomaisis ئەو نەخۆشییانەیە کە لە ئاژەڵێکی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ بە هۆی گازگرتنی مێشی تسی تسییەوە کە لە رێگەیەوە هۆکارەکە دەگوێزرێتەوە لەشی مرۆڤ و لە ئەنجامدامرۆڤەکە تووشی دەردەخەو دەکات.هۆکاری دەردەخەو لە مرۆڤدا دەگەڕێتەوە بۆ دوو جۆر Trypanosoma brucei rhodesiense و Trypanosoma burcei gambiense.

تووشبوونی مرۆڤ بە دەردەخەو بەهۆی مێشی تسی تسییەوە زیاتر ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەو شوێنانە دەژین کە دوورن لەناو شارەکان وەك گوند و دارستانەکانی وڵاتانی ئەفەریقا.لە نیشانە سەرەکییەکانی دەردەخەو لە مرۆڤدا: سووربوونەوە و ئاوسانی پێستی مرۆڤی گازگرتوو،پلەی گەرمی لەشی بەرزدەبێتەوە،تووشی سەرئێشەیەکی بەردەوام دەبێت،گرێ لیمفاوییەکانی لەشی دەئاوسێت،جگەر و سپڵی گەورە دەبێت و بێ هێزییەکی زۆر نەخۆش دادەگرێت و زۆر کات نەخۆش خەواڵوو دەردەکەوێت هەر لەبەر ئەمەشە بە نەخۆشییەکە دەووترێت دەردەخەو Sleeping Sickness.لە ئەنجامی گەیشتنی مشەخۆرەکە بە ژمارەیەکی زۆر بە خانەکانی مێشك و هەوکردنی Meningeoen Cephlitis و زۆر جار بە مردنی نەخۆشەکە کۆتایی دێت.نیشانەکان بە پێی سەرچاوەکان نەخۆشی دەردەخەو هیچ نیشانەیەکی جیاکەرەوەی ئەوتۆی نییە کەوابێت پێی بناسرێتەوە لەگەڵ نەخۆشییەکانی دیکە بەڵکو نیشانەکان گشتین.

نیشانەکانی نەخۆشییەکە لەسەر ئاژەڵی تووشبوو بەندە لەسەر:جۆری مشەخۆرەکە،جۆری ئاژەڵی تووشبوو،تەمەنی ئاژەڵی تووشبوو،ئاستی بەڕێوەبردنی ئاژەڵەکان و ئاستی بەرگری لەشیان،بوونی مێشی تسی تسی لە ژینگەدا.ماوەی تووشبوون و تا دەرکەوتنی نیشانەکان لەسەر ئاژەڵی تووشبوو نزیکەی هەشت بۆ بیست رۆژ دەخایەنێت و نەخۆشییەکە بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەشی دەست پێدەکات و بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام دەبێت هەروەها ئاژەڵی تووشبوو بێ هێز و لاواز دەردەکەوێت لە ئەنجامی کەمخوێنی و لە لەوەڕ دەکەوێت و بەرەبەرە کێشی کەم دەکات،گرێ

لیمفاوییەکانیشی قەبارەیان گەورە دەبێت و ئاژەڵی تووشبوو چاوی ئاو دەکات و هەندێك جار تووشی سکچوونیش دەبێت.سوری مانگانەی ئاژەڵەکان نارێك و پێك دەبێت و ئاژەڵی ئاوس بەردەخات و سپڵ گەورە دەبێت.

چارەسەر و دەست نیشانکردن:دەست نیشانکردنی نەخۆشییەکە بە ئەنجام دەگەیەنرێت بە هۆی:مێژووی کێشەکە،نیشانە کلینیکییەکان ،لە رێی تاقیگەوە بە هۆی وەرگرتنی نمونەیەك لە خوێنی ئاژەڵی تووشبوو.بە مەبەستی چارەسەر و کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییەکەپێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

١.قەلاچۆکردنی مێش و مەگەز بە بەردەوامی بەتایبەتی مێشی تسی تسی .

٢. بەبەرزکردنەوەی ئاستی بەخێوکردن وبەڕێوەبردنی ئاژەڵ لەگوندەکان وکێڵگەکاندا بەپێدانی ئالفی هاوسەنگ لەمادە خۆراکییە بنەڕەتییەکان بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرگری لەشیان لەدژی نەخۆشییەکان.

٣. بەکارهێنانی هەندێك دەرمان وەك Diminazene acetate,Trypamidium و (Suramin Naganol).

سەرچاوەکان:

١. Radostists,O. M,Gay, C, Blood, D,Hinche life, K.W. 2000 Veterinary Medicine. 9th edi.w. B.

## Bovine Ephemeral Fever تای سیٚ رۆژە

لە نێو گیانداراندا زۆر هۆکار هەن بەشداری دەکەن لە بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی نەخۆشییەکان لەوانەش بە شێوەیەکی سەرەکی کەش و هەوای وەرزەکانە،واتە هەندێك نەخۆشی هەیە کە لە وەرزێکی دیاریکراودا بڵاودەبێتەوە کە جیاوازی هەیە لەو نەخۆشییانەی کە لە وەرزێکی دیکەدا بڵاودەبێتەوە،ئەمەش بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ کەش و هەواو پلەی گەرمی و ئاستی شێداری وەرزە جیاوازەکان.لە کوردستاندا و لە وەرزی هاویندا کە تیایدا پلەی گەرمی بەرزدەبێتەوە و کەش و هەوا گەرم دادێت و بەمەش دەبێتە هۆی گەشەکردن و زۆربوونی زیندەوەرە جومگەدارەکان Arthropode organisms وەك مێش و مێشولە و گەنە و ئەسپێ...هتد کە وەك گوێزەرەوەیەکی بایۆلۆژی رۆڵیان هەیە لە گواستنەوەی هۆکاری نەخۆشییەکان.نەخۆشی تای سیٚ رۆژە یەکێکە لەو نەخۆشییانەی کە لە کوردستاندا لە وەرزی هاویندا بڵاودەبێتەوە و زەرەر و زیانێکی لەبەر چاوبە ئابووری وڵات دەگەیەنێت.

تای سیٚ رۆژە چی دەگەیەنێت؟

لە کوردەواری و لە نێو خاوەن ئاژەڵەکاندا بە نەخۆشییەکە دەووترێت تای سیٚ رۆژە و لە سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری پێی دەووترێت Bovine Ephemeral Fever هەر بۆیەش پێی دەوترێت سیٚ رۆژە،چونکە زۆر جار ماوەی نەخۆشییەکە سیٚ رۆژ دەخایەنێت و لەخۆوە ئاژەڵی تووشبوو چاك دەبێتەوە.نەخۆشییەکە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا بڵاوە بە تایبەتی وڵاتانی کیشوەری ئاسیا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ئوستورالیا و هەروەها دەرکەوتووە کە لە کوردستانیشدا هەیە و بە پێی سەرچاوەکان لە کاتی تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە رادەی تووشبوون لە نێو ئاژەڵدا لە نێوان ٢٥-٤٠ ٪ و رادەی لەناوچوونیش زۆر کەمە.نەخۆشی تای سیٚ رۆژە زیاتر لە مانگە گەرمەکانی وەرزی هاویندا بڵاودەبێتەوە،لەبەر ئەوەی کەش و هەوا لەبار و گونجاوە بۆ گەشەکردن و زۆربوونی گوێزەرەوە بایۆلۆژییەکانی وەك مێشولە و گەنە و ئەسپێ و هەروەها رەشەباش هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆگواستنەوەوخێراترکردنی بڵاوبونەوەی نەخۆشییەکە.بەپێی et. of Radostits ,2007 نەخۆشی تای سیٚ ڕۆژە بەشێوەیەکی سەرەکی تووشی ڕەشەوڵاخ دەبێت لەگاومانگاوگامێش وسەرچاوەی نەخۆشییەکە دەگەڕێتەوە بۆئاژەڵی تووشبوو لەگەڵ

گوێزەرەوە بایۆلۆژییەکانی.ئاژەڵەکان لەهەمووتەمەنەکاندا تووش دەبن،بەڵام لەتەمەنەکانی نێولن ٣-٦ مانگ تواناى بەرهەڵستی نەخۆشییەکان هەیەوهیچ نیشانەیەکیان لەسەردەرناکەوێت .مانگاخاوەن کێشەزۆرەکان کەبەرهەمی شیریان زۆرە Dairy Cattle زیاتر هەستیارترن بۆتووشبوون بەنەخۆشییەکە بەبەراورد لەگەڵ جۆرەکانی دیکەودەبێتەهۆی کەمبوونەوەی لەبەرچاوی بەرهەمهێنانی شیربەرێژەی ٨٠٪ئەمەش بۆخۆی زیان گەیاندنە بەئابووری وڵات ونەخۆشییەکەدەبێتەهۆی پەکخستنی کۆئەندامی زۆربوون بەوەی هاتنە کەڵیان دوادەکەوێت وهەروەها بەراویتە بوونی ئاژەڵەئاوسەکان ونەزۆکی لەگاکاندا ڕوودەدات.

هۆکاری نەخۆشییەکە:

هۆکاری سەرەکی نەخۆشییەکە دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرەسێك کەپێی دەوترێت Ephemero Virus کە سەربەکۆمەڵەی Arthropod-Borne Rhabdo Virus واتە ئەم ڤایرۆسە بەهۆی زیندەوەرێکی جومگەداری وەك مێشولە دەگوێزرێتەوە لەئاژەڵێکی تووشبووەوە بۆیەکێکی ساغ و ڤایرۆسەکە دوای قۆناغی چوونەژوورەوەی بۆناولەش دەست دەکات  بە دابەش بوون و لە ئەنجامدا لەسوڕی خوێندا ژمارەیان زیاد دەکات و بەهەموو ئەندامەکانی لەشدا بڵاودەبێتەوەو دەبێتەهۆی هەوکردنی گشتی لەلەشدا.

نیشانە دیارەکان :

نیشانە کلینیکییەکان زیاتر لەسەر ئەو ئاژەڵە تووشبووانە دەردەکەوێت کە بەرهەمی شیرییان زۆرە و بە شێوەیەکی گشتی سروشتی نەخۆشییەکە بە شێوەیەکی تیژ  Acute Formدەست پێدەکات .ماوەی چوونەژوورەوەی ڤایرەسەکە بۆ لەش و تا دەرکەوتنی نیشانەکان لەسەر ئاژەڵی تووشبوو نزیکەی دوو بۆ دە ڕۆژ دەخایەنێت .

-ئاژەڵی تووشبوو تای لێدێت واتە پلەی گەرمی لەشی بەرز دەبێتەوە دەگاتە ٤١-٤٠,٥ پلەی سەدی.

-ئاژەڵی تووشبوو لە لەوەڕ و کاوێژ دەکەوێت و ئارەزووی لەوەڕی نامێنێت و بێهێز دەبێت.

-کەمبوونەوەی بەرهەمهێنانی شیر بە شێوەیەکی لەبەرچاو.

-تووشی هەناسەبڕکێ دەبێت و ڕێژەی لێدانی دڵ زیاد دەکات و چاو و لووتی ئاژەڵی تووشبوو ئاو دەکات.

-بەشێوەیەکی گشتی ماسوولکەکانی لەشی ئاژەڵی تووشبوو دەلەرزێت و بەرەبەرە بێهێز دەبێت و لە ڕۆژانی داهاتوودا تووشی ڕەق بوونی ماسوولکەکانی پەلی دواوە و پێشەوە دەبێت Muscular Stiffness و لە ئەنجامدا ئاژەڵەکە بەزەحمەت دەجوڵێتەوە.

-بەراویتەبوونی ئاژەڵە ئاوسەکان.

-هەندێجار لە ئەنجامی کەمبوونەوەی ڕێژەی کالیسیۆم لە لەشدا ئاژەڵی تووشبوو دەکەوێتە سەر زەوی.

-بەپێی سەرچاوەکان لە دوای سێیەم ڕۆژەوە لە تووشبوون ئاژەڵەکە دەست دەکاتەوە بە لەوەڕاندن و کاوێژ کردن و بەرەبەرە پلەی گەرمی لەشی دادەبەزێت و بەرەو چاکبوونەوە دەڕوات.

چارەسەر و کۆنترۆڵ

سروشتی نەخۆشی تای سێ ڕۆژە لەوەدایە کە ئاژەڵی تووشبوو لە دوای سێیەم ڕۆژەوە لەخۆوە چاك دەبێتەوەSpontaneous Recovery بەوەی ئاژەڵەکە دەست دەکاتەوە بە لەوەڕاندن و کاوێژکردن و پلەی گەرمیشی دادەبەزێت Radostits et of 2007.لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

یەکەم:قەلاچۆکردنی مێش و مەگەز بە بەردەوامی لەو شوێنانەی کە ئاژەڵی تێدا بەخێودەکرێت بەتایبەتی لە مانگە گەرمەکانی هاویندا.

دووەم:جیاکردنەوەی ئاژەڵە تووشبووەکان لە شوێنێکی تایبەتدا.

سێیەم:پێدانی دەرمانی ئەنتی بایۆتیك و دەرمانی دیکە لە جۆری NSAID لەژێر چاودێری پزیشکانی ڤێتێرنەری.

چوارەم:پێدانی هەندێك ماددەی چالاککەر وەك کالیسیۆم و ڤیتامینەکان بەپێی پێویست.

سەرچاوەکان

1.RADOSTITS,O.M, GAY,C.C.,BLOOD,O.C.AND HINCHCLIFF,K.W, 2OO7.VETERINARY MEDICINE 10th EDITION.

2.MERCK VETERINARY MANUAL 8TH EDITION 1998.

## Haemorrhgic Fever تای خوێنبەربوون

لە خۆمەڵگای کوردەواری پێی دەوترێت تای خوێن بەربوون و لە سەرچاوە پزیشکییەکاندا پێی دەوترێت Viral Hemorrhagic Fever باوترینیان بریتییە لە Crimean-Conga Hemorrhagic Fever.

ئەمەش لەبەر ئەوەی یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٤ دا نەخۆشییەکە لە Crimea دەست نیشانکراو لە دواییدا لە ساڵی ١٩٦٩ نەخۆشییەکەجارێکی دیکە لە ناوچەی Congo سەریهەڵدا و بڵاوبۆوە.لەم سەردەمەدا تای خوێن بەربوون لە زۆر وڵاتانی جیهاندا بوونی هەیە وەك وڵاتانی یەکێتی سۆڤێتی جاران و وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و چین و هندستان و پاکستان و ئەفغانستان و وڵاتانی باشووری ئەوروپا. تای خوێن بەربوون بڵاودەبێتەوە زیاتر لە وەرزە گەرمەکانی ساڵدا واتە لەکاتی بەرزبوونەوەی پلەی کەرمی ژینگەدا،ئەمەش لەبەر ئەوەی مشەخۆرەکانی وەك گەنە و ئەسپێ و مێش و مەگەز دەبوژێنەوە و گەشە دەکەن و ژمارەیان زیاد دەکات.ڤایرۆسی نەخۆشی تای خوێن بەربوون بەشێك لە سوڕی ژیانی لە گەنەدا بەسەر دەبات Tick-borne Virus و هەر لە ڕێی گەنەیشەوە لە ناوچەیەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە.بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری تای خوێن بەربوون یەکێکە لەو نەخۆشییە هاوبەشانەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ،واتە لە ئاژەڵی تووشبووەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ (بەهۆی گەنەوە) دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و تەندروستی مرۆڤ دەخاتە مەترسییەکی گەورەوە،چونکە کاریگەری نەخۆشخەرانەی ڤایرۆسەکە لە مرۆڤدا زۆر زیاترە وەك لە ئاژەڵدا و هەروەها دەرکەوتووە ڤایرۆسەکە لە مرۆڤی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی دیکە بەتایبەتی لە نەخۆشخانەکاندا.

هۆکار و نیشانەکان:هۆکاری سەرەکی نەخۆشی تای خوێن بەربوون دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسێك کە پێی دەوترێت Nairo Virus سەر بە خێزانی Bunya Viridae ،و یەکێکە لەو ڤایرسانەی کە بەشێك لە سوڕی ژیانی لە جۆرێك گەنەدا بەسەر دەبات کە پێی دەوترێت Hyalomma ، هەروەها هۆکارێکیشە بۆ گواستنەوەی ڤایرۆسەکە لە ئاژەڵێکی تووشبووەوە بۆ یەکێکی ساغ،زۆر جۆر لە ئاژەڵە کێوی وماڵییەکان خانە خوێی ڤایرۆسەکەن لەوانەش مانگا و مەڕ و بزن واتە ڕۆڵی

هەڵگری ڤایرۆسەکە دەبینن بێئەوەی هیچ نیشانەیەکی کلینیکییان لەسەر دەربکەوێت بەڵکو نەخۆشییەکە لە سەرەتاوە لە ئاژەڵەوە دەست پێدەکات و بە هۆی گەنەوە بڵاودەبێتەوە.ڤایرۆسی تای خوێن بەربوون بەهۆی گەنەوە یان پەیوەندی راستەوخۆوە بە ئاژەڵی تووشبووەوەدەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و لە ئەنجامدا تووشی نەخۆشییەکە دەبن و هەروەها لە مرۆڤێکی نەخۆشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی ساغ بەهۆی بەرکەوتنیان بەڕێی جۆراوجۆر بە خوێن و شلەی دەردراوی مرۆڤە نەخۆشەکانەوە و بەپێی توێژینەوەکان دەرکەوتووە کە زیاتر لە نەخۆشخانەکاندا ئەم دیاردەیە ڕوو دەدات لەئەنجامی کەمتەرخەمی و ڕەچاونەکردنی مەرجەتەندروستییەکان ئەویش بەپاکڕانەگرتنی پێداویستی و کەلوپەلی پزیشکییەکان لەکاتی نەشتەرگەری و دەرزی لێدان وخوێن وەرگرتن ، هەر لەبەر ئەمەشە بەپێی سەرچاوەکان ڕێژەی لەناوچوون لەنەخۆشخانەکاندا دەرکەوتووە لەنێوان ٥٠-٩٠٪ .

تای خوێن بەربوون لەمرۆڤدا:

لە مرۆڤدا نەخۆشی تای خوێن بەربوون زۆر توندوتیژو ترسناکە.ماوەی تووشبوون بە ڤایرۆسەکە و تا دەرکەوتنی نیشانەکان نزیکەی ٣-٧ رۆژ دەخایەنێت و بەم نیشانانەش دەست پێدەکات:

١.پلەی گەرمی لەشی نەخۆشەکە بەرز دەبێتەوە واتە تایەکی تیژی لێدێت.

٢.سەرئێشەیەکی تیژ و ئازارێکی توند لە سك و پشت و گەدە و ئەژنۆ و گشت ماسوولکەکانی لەشی دەگرێتەوە.

٣.نەخۆش هەندێجار دەڕشێتەوە و چاوی سوور دەبێتەوە.

٤.یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی ئەم نەخۆشییە خوێن بەربوونە لە ئەندامەکانی لەش کە بە شێوەی پەڵەی سوری خوێناوی تێبینی.

٥.لە شێوەی توندوتیژی نەخۆشییەکە و لە دوای چوارەم رۆژەوە نەخۆش تووشی لووت پژان دەبێت و خوێنێکی زۆری لێ دەڕوات و لە کاتی دەرزی لێداندا لە شوێنی دەرزییەکەدا خوێنی ناوەستێت.ئەو کەسانەی کە زیاتر بۆیان هەیە تووشی نەخۆشی تای خوێن بەربوون بن بریتین لە پزیشکانی ڤێتێرنەری و یاریدەدەرەکانیان و خاوەن ئاژەڵەکان و قەسابەکان و ئەو کەسانەی مامەڵەی کڕین و فرۆشتن بە ئاژەڵەوە دەکەن و کارمەندانی تاقیگەکانن.تا ئێستا هیچ چارەسەرێکی

گونجاوی بۆ نەدۆزراوەتەوەن،بەڵام بۆ سنووردارکردنی نەخۆشییەکە پێویستە هاوسەنگی شلەی لەشی نەخۆش رابگیرێت: Fluid and Electrolyte balance هەروەها بەکارهێنانی ئەنتی بایۆتیك بە مەبەستی لەناوبردنی میکرۆبە لاوەکییەکان Secondary Bacterial infection .

کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشییەکە:بە مەبەستی کۆنترۆڵ کردن و سنووردانان بۆ بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە پێویستە:

یەکەم: قەلاچۆکردنی بەردەوامی مشەخۆرە دەرەکییەکان لە وەرزە گەرمەکاندا بە تایبەتی گەنە ئەویش بە شۆردنەوەی ئاژەڵەکان بە هەندێك ماددەی لەناوبەری وەك Organo Phosphoro Compounds.

دووەم:خاوەن ئاژەڵەکان لە کاتی بەڕێوەبردنی ئاژەڵەکانیاندا پێویستە بە جلوبەرگی تایبەتەوە و دەستکێشەوە کارەکانیان ئەنجام بدەن.

سێیەم:لە نەخۆشخانەکاندا‌پێویستە زۆر بەوردی رەچاوی مەرجە تەندروستییەکان بکرێت وگشت کەل وپەل وپێداویستییەکانی نەشتەرگەری پاکژبکرێتەوەو بەکارنەهێنانەوەی سەرنج و نیدلی دیسپۆزەبڵ بەهیچ شێوەیەك .

چوارەم: پزیشکانی ڤێتێرنەری وکارمەندانی قەسابخانەکان پێویستە بەجل و بەرگی تایبەتی و دەستکێشەوە کارەکانیان ئەنجام بدەن و رێگە نەدەن کە لاشەی ئاژەڵی نەخۆش بچێتە بازارەکانەوە .

پێنجەم: لەرێی راگەیاندنەکانەوە بەبەردەوامی هۆشیاری زانستی بڵاوبکرێتەوە لەسەر بابەتی نەخۆشییە هاوبەشەکان بەشێوەیەکی گشتی و تی خوێن بەربوون بەتایبەتی .

سەرچاوەکان

1. Murphy, F.A.,Gibbs,E.P.J.,Horzinek,M.C.,and Studdert, M.J.,1999. Veterinary Virology. 3rd edition.Academic press, U.S.A.

2. Crimean-Congo Hemor-rhagic Fever. CDC.

# نەخۆشی تای کیو Q Fever

لەبەر زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بەشێوەیەکی لەبەرچاو کەئەمەش بێگومان بۆتەهۆی زیادبوونی داواکاری خەڵکی بۆپێداویستییە خۆراکییەکان و بەتایبەتی ئەوانەی کەبەسەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی پرۆتین دەژمێردرێن وەك گۆشت وجۆرەکانی ، ئەمەش وادەکات مرۆڤ ساڵ بەساڵ زیاتر لەئاژەڵ نزیك ببێتەوەو لەئەنجامدا هەوڵی گەشەکردن و زیادبوونیان بەرێی جۆراوجۆر بدات بەمەبەستی دابین کردنی برێکی تەواو لەپرۆتین، لەهەمان کاتدا لەرووی پزیشکییەوە ترسناکی ئاژەڵ بۆسەر تەندروستی مرۆڤ رۆژ بە رۆژ روولەزیادبوونە لە رێی هەرەشەی بەردەوامی نەخۆشییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ کە بەرێی جیاجیا دەگوێزرێنەوە بۆمرۆڤ و لەئەنجامدا تەندروستی و ئابوری مرۆڤ دەخەنە مەترسییەوەو هەروەها هۆکارێکیشن بۆ پیس بوونی ژینگە.لەم چەندمانگەی پێشوودا لەزۆربەی کەناڵەکانی راگەیاندن لەوڵاتەجیاجیاکانی جیهان هەواڵی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەنفلۆنزای بزن بڵاوکرایەوە بەوەی لە هۆڵەندا لەنێو بزنەکانی ئەو وڵاتەدا نەخۆشی ئەنفلۆنزای بزن سەری هەڵداوەو هۆکارەکەی دەگوێزرێتەوە بۆمرۆڤ ولەئەنجامدا چەند کەسێك گیانیان لەدەست داوە.

نەخۆشی تای کیو:

نەخۆشی تای کیو Q fever بەشێوەیەکی سەرەکی تووشی ئاژەڵە کاوێژکەرەکانی وەك مەڕو بزن ومانگا دەبێت و هەروەها بەپێی سەرچاوەکان دەرکەوتووە کە تووشی سەگ وپشیلەو باڵندە دەبێت و دەرکەوتووە کە هۆکاری نەخۆشییەکە لە زیندەوەرە جومگەدارەکانی وەك گەنە بۆماوە یەك ژیان دەباتەسەر.

نەخۆشی تای کیو لەئاژەڵی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆمرۆڤ و لە مرۆڤدا نیشانەکانی نەخۆشییەکە لە نیشانەکانی ئەنفلۆنزای ئاسایی دەچێت و هەر لەبەر ئەمەشە بەنەخۆشییەکە دەوترێت ئەنفلۆنزای بزن .رێژەی تووشبوونی ئاژەڵەکان لە جیهاندا دەگۆڕێت لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەو هەروەها بە پێی شوێنی بەخێوکردن و ئاووهەواش . هۆکاری نەخۆشی تای کیو ئارەزووی هەندێ شوێن دەکات لە لەشی ئاژەڵە تووشبووەکاندا وەك: گوان و گوێرەکەدان و پزدان و شلەی پزو لەکاتی زایینی ئاژەڵە ئاوسەکاندا بە ژمارەیەکی زۆر دەردەدرێنە دەرەوەی لەش و

بێگومان هۆیەکە لە هۆیەکانی پیسبوونی ژینگەش . هەروەها دەرکەوتووە کە هۆکاری نەخۆشییەکە دوای ١١-١٨ ڕۆژ لەدوای زایینی ئاژەڵە ئاوسە تووشبووەکان لە میزو پاشەڕۆیاندا تێبینی دەکرێت . نەخۆشی تای کیو لەئاژەڵی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی ساغ بەهۆی پەیوەندی ڕاستەوخۆوە لەڕێی کۆئەندامی هەناسەوە.

هۆکاری نەخۆشی تای کیو: هۆکاری نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ زیندەوەرێکی وردبین لەخێزانی Rick ettsiaceae کە پێی دەوترێت Coxiella burnetii . ئەم زیندەوەرە توانای بەرهەڵستی کردنی هۆکاری کیمیایی و هۆکارە ژینگەییەکانی هەیە و بۆماوەی چەند مانگێك توانای تووشکردنی هەیە. هۆکاری نەخۆشییەکە بەژمارەیەکی زۆر لەشیری گوانی ئاژەڵی تووشبوودا دەمێنێتەوە و دەبێتە هۆی سەرچاوەی تووشبوون و هەروەها لە گوان و پزدان و شلەی پزو گرێی لیمفاوی سەر گوان Supramam-mary lymph node جێگیر دەبێت .

نەخۆشی تای کیو لە مرۆڤدا:

نەخۆشی تای کیو یەکێکە لەو نەخۆشییانەی کە لە ئاژەڵی تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆمرۆڤ و تەندرووستی دەخاتە مەترسییەوە . بەشێوەیەکی سەرەکی لەڕێی کۆئەندامی هەناسەدانەوە بە هۆی هەناسە وەرگرتنەوە هۆکاری نەخۆشییەکە دەگاتە لەشی مرۆڤ و بەلەشیدا بڵاودەبێتەوە . بوونی هۆکاری نەخۆشییەکە لە خۆڵ و تۆزو ئاووهەوا و خوری و هەروەها ئەو کەل وپەلانەی کە بەهۆی میزوپاشەڕۆی ئاژەڵە تووشبووەکانەوە پیس دەبن و لە ئەنجامدا دەبنە سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە مرۆڤدا بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتەرنەری شیری ئاژەڵی تووشبوو بەسەرچاوەیەکی گرنگی نەخۆشییەکە دادەنرێت لە مرۆڤدا لە ڕێی خواردنەوەی شیری خاوەوە . ئەو کەسانەی کە زیاتر بۆیان هەیە تووشی ئەم نەخۆشییە ببن ئەوانەن کە بەئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن لە کێڵگەو لادێکاندا بەتایبەتی لەکاتی زایینی ئاژەڵە ئاوسەکاندا و هەروەها پزیشکانی ڤێتەرنەری و کارمەندەکانی تاقیگەو قەسابەکان و ئەوانەی بە خوری شۆردنەوە خەریکن . مرۆڤی تووشبوو چەند نیشانەیەکی لەسەر دەردەکەوێت کە لە نیشانەکانی ئەنفلۆنزا دەچێت و لەوانەش: پلەی گەرمی لەش بەرزدەبێتەوە،ئازار و بێهێزییەکی زۆر زۆربەی لەش دەگرێتەوە،

سەرئێشەو بێزارییەکی زۆر، جارجار سییەکانی تووشی هەوکردن دەبێت، تووشی هەوکردنی جگەرHepatitis دەبێت و تووشی هەوکردنی پەردەی ناوەوەی دڵ دەبێت Endocarditis .

نیشانەکان لەئاژەڵی تووشبوودا

ئاژەڵەکانی وەك مەڕومانگاو بزن لەگشت تەمەنەکاندا تووشی نەخۆشی تای کیو دەبن،بەڵام زیاتر ئاژەڵە ئاوسەکان هەستیارترن ولەئەنجامدا زەرەرمەند دەبن. ئاژەڵە تووشبووەکان هیچ نیشانەیەکی کلینیکیان لەسەر دەرناکەوێت واتە نەخۆشییەکە بەشێوەیەکی شاراوە تووشی ئاژەڵەکان دەبێت . سەرەکیترین نیشانە بریتییە لە بەراویتە بوونی یان بەرخستنی Abortion ئاژەڵە ئاوسەکان لەقۆناغە کۆتاییەکانی ماوەی ئاوسدا کە ئەمەش دەبێتە هۆی نەزۆکی و زیانێکی گەورە بەسامانی ئاژەڵ و خاوەن ئاژەڵ دەگەیەنێت . هەروەها ئاژەڵی تووشبوو بۆماوەیەك لە لەوەڕ دەکەوێت . بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی کیو پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت :

یەکەم: پێویستە ئاژەڵی بەراویتە بوو لە ئاژەڵەکانی دیکە جیا بکرێتەوە وپزدان و بەشەکانی دیکەی پزبسوتێنرێت .

دووەم: پاککردنەوەی شوێنی بەخێوکردنی ئاژەڵەکان لەکێڵگەکاندا بەبەردەوامی ڕێگەنەدان بەکۆبوونەوەی پاشەڕۆی ئاژەڵەکان و هەروەها بەکارهێنانی هەندێك ماددەی پاککەرەوە بۆ لەناوبردنی زیندەوەرە زیان بەخشەکان.

سێیەم: بەکارنەهێنان و نەخواردنەوەی شیری خاوی ئاژەڵەکان و بەڵکو پێویستە بکوڵێنرێت بەمەبەستی لەناوبردنی زیندەوەرە زیان بەخشەکان.

چوارەم: قەڵاچۆکردنی مشەخۆرە دەرەکییەکان بەگشتی.

پێنجەم: جێبەجێکردنی مەرجەکانی تەندروستی لەلایەن خاوەن ئاژەڵەکانەوە بەتایبەتی لەنێو گوندنشیان وەك بەکارهێنانی دەستکێش لەکاتی نزیك بوونەوەیان لەو ئاژەڵانەی بەخێوی دەکەن .

سەرچاوەکان:


1. Radostits , O, M , Gay, C.C., Blood , D.C.,and Hinchcliff,K.W.2000.Veterinary Medicine 9th edition.
2. The Merck Veterinary Man-ual 1998. 8th edition.

## نەخۆشی باوەڵی Arthritis

بەشێرەیەکی گشتی گشت ئەندامەکانی لەش گرنگن وپێویست بۆبەردەوامی ژیانی زیندەوەران و بەهاریکاری یەکتر دەتوانن چالاکییەکان ئەنجام بدەن و هەرکەموکورییەك لەئەندامێك لە ئەندامەکانی لەش کاردەکاتە سەر بەشەکانی دیکەو وادەکات لەش بەشیوەیەکی فسیۆلۆژی کارنەکات، بەمەش بێگومان چالاکی زیندەوەران کەمدەبێتەوەو بەرەبەرە گەشەیان دوادەکەوێت و بەرهەمیان دێتەخوارەوە.جومگەکان Joints بەشێکی سەرەکی لەشی زیندەوەرانن و هەر لەرێگەی جومگەکانەوە بەشێوەیەکی سروشتی دەجوڵێنەوەو ڕادەکەن و هەڵدەستن و دادەنیشن ویاری دەکەن و لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە کۆچ دەکەن و هەر کێشەیەك کەتووشی جومگەکان ببێت دەبێتە هۆی پەککەستنی جوڵەیان و چالاکییەکانیان ، باوترین نەخۆشیش کە تووشی جومگەکان دێن باوەڵییە کە خاوەن ئاژەڵەکان بە دەستییەوە دەناڵێنن بەوەی کە رێگرە لەبەردەم گەشەکردنی ئاژەڵداری لە کوردستان و لەئەنجامدا نێگەتیڤانە کاردەکاتە سەر ئابووری وڵات. لەکوردەواریدا و لەنێوخاوەن ئاژەڵەکاندا بەهەوکردنی جومگەکان لە ئاژەڵە جۆر بە جۆرەکاندا دەوترێت باوەڵی و لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری پێی دەوترێت Arthritis . لە ڕووی زانستییەوە باوەڵی بریتییە لە هەوکردنی جومگەکان کە هەوکردنی پەردەی جومگەکان Synovial membrances و ڕووە جومگەییەکان Articular surfaces دەگرێتەوە ئەمەش بە هۆی هۆکارێکی نەخۆشخەرەوە ڕوودەدات. ئاژەڵەکان بەشێوەیەکی گشتی تووشی باوەڵی دەبن و بەپێی سەرچاوەکان ئاژەڵە تەمەن بچوکەکان وەك كار و بەرخ و گوێرەکە زیاتر هەستیارترن بۆ تووشبوون بە باوەڵی و ڕوونتر نیشانەکانی وەك شەلین و ئاوسان و گەورە بوونی جومگەی تووشبوونیان لەسەر دەردەکەوێت . هەوکردنی جومگەکان Septic Arthritis بە هۆی گەیشتنی میکرۆب بە جومگەکان ڕوو دەدات و لەئەنجامدا تووشبوونی هەوکردن و نیشانەکانی تێدا دەردەکەوێت ، بەکتریا جۆربەجۆرەکان زۆر جار لەڕێی خوێنەوە دەگەنە جومگەکان یان بەهۆی زەبرێکەوە Traumatic Arthritis کە دەبێتە هۆی برینداربوونی جومگەو چوونە ژوورەوەی بەکتریاکە یان لە ئەنجامی نەشتەرگەرییەوە جومگەکان تووش دەبن . بە پێی سەرچاوەکان لە دوای هەشت سەعات لە هێرش بردن و تووشبوون بە بەکتریای

Staphylo coccus aureus نیشانەکانی باوەڵی دەردەکەوێت . ئەسپ بەشێوەیەکی گشتی لە ئاژەڵەکانی دیکە هەستیارترە بۆ تووشبوون بە هەوکردنی جومگەکان هەروەها ئاژەڵە تەمەن بچوکەکان لە گەورەکان زیاتر بۆیان هەیە تووشبن. نیشانەکانی باوەڵی لە ئەنجامی هەوکردنی پەردەی جومگەکان دەردەکەوێت و دەبێتە هۆی شەلینی ئاژەڵەکە Lameness لە ئەنجامی ئازارێکی تیژ لە جومگەی تووشبووی ئاژەڵەکەدا ڕوودەدات بەشێوەیەك ناتوانێت ئەو پەلەی کە تووشبووە بخاتە سەر زەوی و لەکاتی دەست لێداندا لەلایەن پزیشکانی ڤێتێرنەرییەوە هەست بە ئاوسان و گەرمی دەکرێت . جومگەی هەوکردوو دەئاوسێت و گەورە دەبێت و قەبارەکەی بەپێی پلەی توندی نەخۆشییەکە دەگۆڕێت . بەپێی سەرچاوەکان دەرکەوتووە لەکاتی تووشبوون بە هەوکردنی جومگە شلەی جومگەکان بڕەکەی زیاد دەکات و ژمارەی خڕۆکە سپییەکان بەشێوەیەکی گشتی و بە تایبەتی نیوتروفیل Neutrophils زیاددەکات . هەندێجار ئاژەڵی تووشبوو پلەی گەرمی لەشی بەرز دەبێتەوەو لە لەوەڕ دەکەوێت و کێشی لەشی دادەبەزێت و بەرە بەرە لەڕو لاواز دەبێت و تووشی ژەهراوییبوونی خوێن دەبێت ئەمجۆرە هەوکردنە زیاتر لە جومگەکانی پاشووی ئەسپ Stifle Joint و جومگەی ئەژنۆ Knee Joint و Hock Joint دەبێت . بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی باوەڵی لە ئاژەڵەکاندا پێویستە خاوەن ئاژەڵەکان ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن :

یەکەم: هێشتنەوەی ئەو ئاژەڵانەی کە باوەڵیان هەیە لەشوێنەکانیاندا و پێدانی ئالیکی پێویست.

دووەم: پێویستە شوێنی بەخێوکردنی ئاژەڵەکان بەتایبەتی تەمەن بچوکەکان لەباربێت و گونجاوبێت لەگەڵ ژمارەیان و زەوی ژێریان ڕەق و سارد نەبێت و بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا، بەڵکو پێویستە زەوییەکە داپۆشرێت و پلەی گەرمی گونجاوبێت ، چونکە ڕەقی و ساردی زەوی ژێریان ڕێگە خۆشکەرە بۆتووشبوون بە باوەڵی بەتایبەتی لەئاژەڵە تەمەن بچوکەکان.

سێیەم: بەکارهێنانی ئەنتیبایۆتیك Antibiotics پێویستە لەدوای پشکنینی هەستیارێتی Sensitivity test بێت بۆ دەستنیشانکردنی گونجاوترین و کاریگەرترین جۆریان کە لەدژی هۆکارە نەخۆشخەرەکان کاربکات و دەرکەوتووە بەم شێوەیە ئەنجامی باشی لێ دەکەوێتەوە.

چوارەم: بەکارهێنانی گەرمی جێگەیی Local applications of heat ئەمشێوە چارەسەرە بە ڕێگەیەکی ئاسان و باو دادەنرێت بەدانانی ئاوی گەرم لەسەر جومگەی تووشبوو ئاوساوی جومگەی تووشبوو کەمدەکاتەوە شانبەشانی بەکارهێنانی ئەنتیبایۆتیکەکان. وەك پزیشکێکی ڤێتێرنەری زۆر جار ئامۆژگاری خاوەن ئاژەڵم کردووە بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەمشێوە چارەسەرە کە کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر چاکبوونەوەی ئاژەڵە نەخۆشەکە .

پێنجەم: بەکارهێنانی دەرمانە ئازارشکێنەکان لە کۆمەڵەی NSAID Phenylbuta zone ئەنجامی باشی لێکەوتۆتەوە لە کەمکردنەوەی شەلینی ئاژەڵەکەو دابەزینی پلەی گەرمی و کەمبوونەوەی بڕی شلەی جومگە ، هەروەها دابەزینی بڕی ماددەی پرۆستاگلاندین لەشلەی جومگەدا.

سەرچاوەکان:

1. Radostits , O, M , Gay, C.C., Blood , D.C.,and Hinchcliff,K.W.2000.Veterinary Medicine A text book of the disease of Cattle, sheep,pigs,Goats and Horses.

## مەڕو بزن بەدرێژایی ساڵ زاوزێدەکەن

سامانی ئاژەڵ یەکێکە لە پایە سەرەکییەکانی ئابووری کوردستان،ئاژەڵە کاوێژکەرە بچوکەکانی وەك مەڕ و بزن لەو ئاژەڵانەن کە یەکەیەکی ئابووری لە لایەن خەڵکی کوردستانەوە گرنگەو سودیان لێ وەردەگیرێت ، چونکە لەو ئاژەڵانەن کە بەپیتن و بەژمارەیەکی زۆر لەپێناو بەرهەمهێنانی شیرو گۆشت و خوری و پێستەکەیاندا بەخێودەکرێن. لەم ڕوانگەیەوە بایەخدانی زانستی بەبواری ئاژەڵداری جێگەی سەرنجە، بەڵام ئەو توێژینەوانەی کە لەم بوارەداو بەتایبەتی لەسەر کێشەکانی زۆربوون لەمەڕوبزن دا لە کوردستان ئەنجامدراون بە ژمارە کەمن .گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە کەتیشك دەخاتە سەر ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی کۆئەندامی زۆربوون و زاوزێ دەبێتەوەو لە مەڕو بزندا و پەکیاندەخات ، زانیاری وردەگرێتەوە دەربارەی پێوانە واتە درێژی و پانی و ئەستوری و کێشی ئەندامەکانی کۆئەندامی زۆربوون و لایەنە سەرەکییەکانی کۆئەندامە ئاوسەکان .

لەبەرئەوە مەبەست لە ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە:

١. دیاریکردنی سەرەتای وەرزی زۆربوون Breeding season لەمەڕو بزن لەناوچەی سلێمانی.

٢. پێوانەکردنی درێژی و پانی و ئەستوری و کێشی ئەندامەکانی کۆئەندامی زۆربوون لەمەڕ و بزنی ئاوس و نائاوسدا .

٣. دیاریکردنی ئەو نەخۆشیانەی کەدەبنە هۆی پەککستنی کۆئەندامی زۆربوون و نەزۆکی Infertility .

٤. دیاریکردنی خەسڵەتە سەرەکییەکانی پزو کۆئەندامی ئاوس لە قۆناغە جیاجیاکانی ئاوسیدا.

٥. دیاریکردنی ئاستی هۆرمۆنەکانی زۆربوون لە قۆناغە جیاجیاکانی ئاوسی لە مەڕوبزندا.

شوێنی ئەنجامدانی توێژینەوەکە لە کوشتارگەی نوێی سلێمانی بوو لەناوچەی قەرەگۆڵ و نەخۆشخانەی پزیشکی ڤێتێرنەری لە زانکۆی سلێمانی .

ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی کە توێژینەوەکەی لەسەر ئەنجامدرا بەمشێوەیەبوو:

١٠٠ كۆئەندامی زۆربوون لە مەڕی نائاوس ، ٢٠٠ كۆئەندامی زۆربوون لە مەڕی ئاوس ، ٥٠ كۆئەندامی زۆربوون لە بزنی نائاوس، ٥٣ كۆئەندامی زۆربوون لە بزنی ئاوس.

یەكەم: نرخی پێوانەیی لە ١٠٠ كۆئەندامی زۆربوون لە مەڕی نائاوس ، ٥٠ كۆئەندامی بزنی نائاوس . تێكڕای درێژی و پانی و ئەستوری و كێشی هێلكەدانی ڕاست لە مەڕی نائاوسدا بریتی بوون لە: ١,٧٤ ±٦,٨٨ ، ٥,٤٥±١,١٨ ، ٤,٧٩± ٠,٦٨ سم و ٨,٧٢± ١,٤٣ گم ، بەڵام هی هێلكەدانی چەپ : ٦,٦٣±١,٤٦ ، ٥,٥٨± ١,٠٣ ، ٤,٠٣ ± ٠,٥٦ سم ، ٣,٧٨± ١,١٢ گم . تێكڕای درێژی و كێشی تەنە زەردی هێلكەدانی ڕاست بریتیبوون لە : ٦,٣٨ ± ١,٠٨ سم ، ٠,٩٦ ± ٠,٧٢ گم و هی هێلكەدانی چەپ: ٠,٠٣ ± ١,٠٤ سم ، ٠,٠٢ ± ٠,٦٧ گم . تێكڕای درێژی جۆگەلەی هێلكەی ڕاست و چەپ بریتیبوون لە: ٠,٠١± ١٢,٧٢ ، ٠,٠١ ± ١٢,٩٤ . ڕێژەی ئەو نەخۆشی و تێكچوونانەی كەلەسەر كۆئەندامی مەڕی نائاوسدا بینران بریتیبوون لە ٢٩٪ و لە ٢٩ كۆئەندامدا دەستنیشانكران و بڵاوترینیان Ovaro-bursal adhesion كە ڕێژەی گەیشتە ١٠٪ و دوای ئەویش ڕێژەی هیلكەدانی ناچالاك گەیشتە ٥٪ و ڕێژەی Para-ovarian Cyst گەیشتە ٢٪ . تێكڕای درێژی و پانی و ئەستوری و كێشی هێلكەدانی ڕاست لە بزنی نائاوسدا بریتیبوون لە : ٠,٠١ ± ١,٩٣ ، ٠,١ ± ١,٢٥ ، ٩,١٤ ± ٠,٧٤ سم ، ٠,٠١± ٢,١١ گم ، بەڵام هی هێلكەدانی چەپ : ٠,٠١ ± ١,٥٩ ، ٠,٠٠ ± ١,٠٤ ، ٠,٠٠ ± ٠,٦٢ سم ، ٠,٠١ ± ١,٣٢ گم . تێكڕای درێژی و كێشی تەنەزەردی هێلكەدانی ڕاست بریتیبوون: ٩,٤٨ ± ١,٠٢ سم و ٨,٧٤ ± ٠,٦٢ گم و هی هێلكەدانی چەپ : ٠,٠٣ ± ٠,٩٥ سم و ٠,٠٣ ± ٠,٥٨ گم تێكڕای درێژی جۆگەلەی هێلكەی ڕاست و چەپ بریتیبوون لە : ٠,٠٢ ± ١١,٢٤ ، ٠,٠٣ ± ١١,٢ سم . ڕێژەی ئەو نەخۆشی و تێكچوونانەی كەلەسەر كۆئەندامی بزنی نائاوسدا بینران بریتیبوون لە ١٦٪ و لە ٨ كۆئەندامدا دەستنیشاكران و بێ وترینیان بەهەمان شێوەی پێشوو بریتی بوو Ovaro-bursal adhesion كە ڕێژەكەی گەیشتە ٤ ٪ و دوای ئەویش: Follicular cystic ovaryگەیشتە ٤٪ و Para-ovarian cystic گەیشتە ٢٪.

دووەم:مەڕو بزنی ئاوس،تێكڕای درێژی و پانی ئەستوری و كێشی هێلكەدانی ڕاست لە مەڕی ئاوسدا بریتیبوون لە: ٣,١٤ ± ١,٧٧ ، ٢,٦٧ ± ١,١٦ ، ٢,٢٩ ± ٠,٦٢ سم و ٤,١٦ ± ١,٦٧

گم هی هێلکەدانی چەپ : ٣,٠٧ ± ١,٦٢ ، ٤,٦٥ ± ١,٤٤ ، ٢,٩٨ ± ٠,٥٨ سم و ٣,٨٢ ± ١,٣٨ گم . تێکرِای درێژی و کێشی تەنەزەردەی هێلکەدانی ڕاست بریتیبوون لە : ٤,٣٠ ± ١,١٤ سم و ٤,٣٧ ± ٠,٧٣ گم و هی هێلکەدانی چەپ : ١,٠١ ± ٠,٦٦ گم . تێکرِای درێژی جۆگەلەی هێلکەی ڕاست وچەپ بریتیبوون لە : ٦,٦٩ ± ١٤,٦٨ و ٦,٨٧ ± ١٤,٦٧ . جۆری ئاوسی لە ٢٠٠ کۆئەندامی ئاوس لە مەڕدا بەڕێژەی ٩٧٪ لە ١٩٤ کۆئەندام یەکانە بوون و بەڕێژەی ٣٪ لە ٦ کۆئەندام دووانە بوون . ژمارەی پزەکان بریتیبوون لە ٢٠٦ پزو لەوانەش ١٢٢ یان بەڕێژەی ٥٩,٢٢ دەکەونە هۆرِنی یان بەشی لای ڕاست Right uterine horn و ٨٤ یان بەڕێژەی ٧٧,٤٠٪ دەکەونە هۆرِنی چەپ Left uterine horn . ڕێژەی ئەو تێکچوونانەی کەلەسەر کۆئەندامی ئاوسدا بینران لە مەڕدا گەیشتە ١٤٪ لە ٢٤ کۆئەندامدا و بڵاوترینیان بریتیبوون : Ovaro-bursal adhesion بەڕێژەی ١١٪ و Para-ovarian بەڕێژەی ٢,٥ ٪ . تێکرِای درێژی و پانی و ئەستوری و کێشی هێلکەدانی ڕاست لە بزنی ئاوسدا بریتیبوون لە : ٠,٠١ ± ١,٨٨ ، ٠,٠١ ± ١,٣٣ ، ٨,٨٤± ٠,٧٢ سم و ٠,٠٢ ± ٢,٠٣ گم ، هەرچی هێلکەدانی چەپە بەمشێوەیە بوو: ٠,٠١± ١,٧٥ ، ٠,٠١ ± ١,١٩ ، ٧,٩٠ ± ٠,٦٤ سم و ٠,٠١ ± ١,٧٣ گم . تێکرِای درێژی و کێشی تەنەزەردی هێلکەدانی ڕاست بریتیبوون لە: ٠,١٨ ± ١,٢٢ سم و ٠,٠١ ± ٠,٨٩ گم و هی هێلکەدانی چەپ : ٠,٠١ ± ١,١٨ سم و ٠,٠٢ ± ٠,٩٢ گم . تێکرِای درێژی جۆگەلەی هێلکەی ڕاست و چەپ بریتیبوون لە : ٠,٠٣ ± ١٣,٣٩ و ٠,٠٣ ± ١٣,٦٠ سم . جۆری ئاوسی لە ٥٣ کۆئەندامی ئاوس لەبزندا بە ڕێژەی ٩٢,٦٧٪ لە ٣٦ کۆئەندام یەکانە بوون وبەڕێژەی ١٤,٣٢٪ لە ١٧ کۆئەندام دووانەبوون ژمارەی پزەکان بریتیبوون لە ٧٠ پزو لەوانەش ٣٣ یان بەڕێژەی ١٤,٤٧٪ دەکەونە هۆرِنی ڕاست و ٣٧ یان بەڕێژەی ٥٨,٥٢٪ دەکەونە هۆرِنی چەپ .

دیاردەی کۆچکردن: دیاردەی کۆچکردن لەلایەکەوە بۆلایەکی دیکە Trans-uterine migration لەکۆئەندامی ئاوسی یەکانە گەیشتە ٧١,١٥٪ و لە ئاوسی دووانە گەیشتە ٥٧,١٨٪ ڕێژەی ئەو تێکچوونانەی کەلەسەر کۆئەندامی ئاوسدا بینران لە بزندا گەیشتە ٩,٤٢٪ لە ٥ کۆئەندامدا و باوترینیان کە Ovaro-bursal adhesion بوو ڕێژەکەی گەیشتە ٦٦,٥٪ .

دەرئەنجامی توێژینەوەکە :

یەکەم: لەئەنجامدا دەرکەوت کە چالاکی و تێکڕایی پێوانەیی هێلکەدانی ڕاست لە مەڕو بزنی ئاوس و نائاوس زۆر زیاترە لە هێلکەدانی چەپ هەروەها درێژی و کێشی تەنەزەردەی هێلکەدانی ڕاست درێژترو گەورەترە لە هی چەپ لە مەڕوبزنی ناوچەی سلێمانی .

دووەم: نەخۆشی Ovaro-bursal adhesion ڕێژەی ڕوودانی لەگشت نەخۆشییەکانی دیکە زیاتر تێبینیکراوە لە مەڕوبزنی ناوچەی سلێمانی .

سێیەم: کێشی پزو تێکڕای شلەی پزو تێکڕای کێشی کۆئەندامی ئاوس وتیرەی کۆئەندامی ئاوس زیاددەکات بەزیادبوونی درێژی پز لەقۆناغە جیاجیاکانی ئاوسی لە مەڕو بزندا.

چوارەم: ئاستی ڕوودانی ئاوسی لەجۆری دووانە TwinPregnancy لە بزنی ناوچەی سلێمانی زیاترە وەك لەمەڕدا.

پێنجەم: زۆربەی ئاستی هۆرمۆنەکانی زۆربوون لە قۆناغە جیاجیاکانی ئاوسیدا لە مەڕو بزندا لەیەك دەچن،بەڵام هۆرمۆنی Estradiol-17B لە بزنی ئاوسدا زیاددەکات بەبەرەو پێشچوونی قۆناغەکانی ئاوسی، بەڵام لە مەڕی ئاوسدا ئاستەکەی بەنزمی دەمێنێتەوە.

شەشەم: دەرکەوت کە مەڕوبزنی ناوچەی سلێمانی بە درێژایی ساڵ زاوزێ دەکەن واتە چالاکی زاوزێ و زۆربوون تایبەت نییە بە وەرزێکی دیاریکراو لە ناوچەکەدا . لەبەرئەوە لە کوردستاندا هاندانی بەخێوکردنی مەڕوبزن و پەروەردەکردنیان بە کارێکی پێویست دەزانرێت بەتایبەتیش بەخێوکردنی بزن، چونکە ئاژەڵێکی زۆر بەپیتەو پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان زیاتر بایەخ بەم لایەنە ئابوورییە گرنگە بدەن.

* ئەم وتارە پوختەی توێژینەوەیەکی پێوانەیی و شانەزانی و هۆرمۆنییە لەسەر کۆئەندامی زۆربوونی مەڕوبزنی ئاوس و نائاوس لەناوچەی سلێمانی بەناونیشانی

Biometrical ,Histological and Hormonal Study of Pregnant and Non-Pregnant genitalia of sheep and goat in Sulaimani region

کە یەکەم نامەی دکتۆرایە لەبواری زانستی پزیشکی ڤێتێرنەری لە کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرنەری زانکۆی سلێمانی لەلایەن نوسەرەوە پێشکەشکراوە و ڕۆژی ٢٠٠٩/٢/١٢ گفتوگۆی لەسەرکراوە.

# TuberCulosis نەخۆشی سیل

پێشەکی: هەندێك نەخۆشی هەن کە دۆزینەوەو دەستنیشانکردنی هۆکارەکانیان ماوەیەکی دوورو درێژیان بەسەردا تێپەڕیوەو هەرماوەیەکیش زەرەرو زیانی گەورەی گەیاندووە بە زیندەوەران بەشێوەیەك هەتاکو ئەم سەردەمەش بەردەوامیان هەیە . نەخۆشی سیل لە ئاژەڵ و مرۆڤدا مێژوویەکی درێژی هەیەو بەبەردەوامی زەرەری گەیاندووە بە تەندروستیان . لەم سەردەمەداو لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان تاڕادەیەکی زۆر توانیویانە نەخۆشییەکە بنبڕبکەن بەڵام لەووڵاتانی دیکە لەبەر پیس بوونی بەردەوامی ژینگەو جێ بە جێ نەکردنی مەرجە سەرەکی یەکانی تەندروستی و لاوازی هۆشیاری تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشی سیل هۆکارێکی مەترسیدارە بۆ سەر تەندروستی ئاژەڵ و مرۆڤ و بە بەردەوامی بەدەستیەوە دەناڵێنن، ئەمەش بێ گومان دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە سیل یەکێکە لەنەخۆشییە هاوبەشەگرنگەکانی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ بەوەی مرۆڤ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەئاژەڵی تووشبووەوە تووش دەبێت. نەخۆشی سیل لەزووربەی ووڵاتانی جیهان بڵاوەو زەرەری گەورە بە ئابووری ئەو وڵاتانە دەگەیەنێت لە ڕێگەی زیان گەیاندن بەسامانی ئاژەڵ و بەتایبەتی پرۆژەکانی مانگای شیر. بەپێی توێژینەوەکان لە کوردستانیشدا نەخۆشی سیل لە ئاژەڵ و مرۆڤدا بوونی هەیەو بەپێی توێژینەوەیەکی ماستەر کە لەلایەن د.ڕزگار ڕەحیم سلێمان مامۆستای کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرنەری لە زانکۆی سلێمانی ئەنجام دراوە لە ساڵی"٢٠٠١" ڕێژەی نەخۆشی سیل لەنێو مانگای ناوچەی سلێمانی گەیشتۆتە( ٥,١٪ ).

نەخۆشی سیل: لە کوردەواریداپێ ی دەڵێن نەخۆشی سیل و زۆرجار بەوکەسانەش دەوترێت کەزۆر لەڕولاوازن و کێشی لەشیان زۆرکەمە، لەسەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری پێ ی دەوترێت (( Tuber Culosis)) . نەخۆشی سیل تووشی زۆربەی جۆرەکانی ئاژەڵ و باڵندە دەبێت و بەپێی ئامارەکان ڕەشەووڵاخ و بزن و بەراز لەوانی دیکە هەستیارترن زیاتر تووشی سیل دەبن و بەڵام ووڵاخە بەرزەو مەڕ کە بەرگری یەکی سروشتیان هەیە کەمتر تووشی نەخۆشی یەکە دەبن. لە وولاتە پێشکەوتووەکانی جیهان بەباشی کۆنترۆڵی نەخۆشی یەکە کراوە. مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی زۆر هەستیارە بە تووشبوون بەنەخۆشی سیل و لە ئەنجامدا زیانی تەندروستی و ئابوری پێ دەگات و ئەمەش ڕوو دەدات لە ووڵاتە تازە پێگەیشتووەکان کە نەخۆشی یەکە لە ئاژەڵی تووشبووەوە

دەگوێزرێتەوە ، سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یەکە لە ژینگەی ئەو وڵاتانەدا زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ مانگای تووشبوو بە هۆکاری نەخۆشی یەکە کە دەبێتەهۆی تەشەنەکردنی و تووشکردنی ئاژەڵی دیکە بەهۆی هەناسەدانەوەی بەردەوام و بڵاوکردنەوەی بەژینگەداو هەروەها لەڕێگەی پاشەڕۆو شیرومیزو دەردراوی لوت و زێ وە. هەروەها دەرکەوتووە کە ئاژەڵە کێوێ کان هەروەك کۆگایەك ڕۆڵیان هەیە لە مانەوەی هۆکاری نەخۆشی یەکە لە لەشیان و لە ئەنجامدا بڵاوکردنەوەیان بەژینگەدا.

هۆکاری نەخۆشی سیل و چۆنیەتی گواستنەوەی : هۆکاری نەخۆشی سیل بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریایەك کە تایبەتە بە ڕەشە وڵاخ و پێ ی دەوترێت(( Mycobacterium bovis )) ئەم بەکتریایە لەناو خانەدا دەژیت (( Intracellarbacteria )) واتە شوێنی هەڵبژێراوی بەکتریا کە ناوخانەکانە کە بێگومان ئەم خەسڵەتەش وا دەکات بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە لەشدا بمێنێتەوە. بەکتریاکە بە هۆی تیشکی ڕۆژەوە ڕاستەوخۆ لەناودەچێت و لە ناوەندێکی گەرمی شێداردا بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك بە چالاکی دەمێنێتەوە وەکو پاشەڕۆی ئاژەڵ و خاك وخۆڵ. گواستنەوەی هۆکاری نەخۆشی سیل لە نێو ئاژەڵاندا ڕوودەدات بەهۆی چەند ڕێگایەکەوە لەوانەش :

یەکەم: بەهۆی کۆئەندامی هەناسەوە لەکاتی هەناسەوەرگرتن (( Inhalation)) لەژینگەیەکی تووشبوو بە هۆکاری نەخۆشی یەکە بە تایبەتی لەوشوێنانەی کە داخراون و ژمارەیەکی زۆر مانگایان تێدا بەخێودەکرێت و ئەمەش بەسەرەکیترین ڕێگەی گواستنەوە دادەنرێت چونکە ژمارەیەکی زۆر لە مانگا لە شوێنێکی ڕووبەر بچوکدا بە ڕێگە خۆشکەری بڵاوبونەوەی نەخۆشی یەکە دادەنرێت لەبەرئەوەی ئاژەڵەکان زیاتر لە یەکتری نزیك دەبنەوەو هەناسەیان باشتر بەریەك دەکەوێت بەمەش ئەگەری گواستنەوەو تەشەنەکردنی نەخۆشی یەکە خێراتر دەبێت.

دووەم: بەهۆی کۆئەندامی هەرسەوە (( Ingestion )) لەکاتی لەوەڕیاندا لەو لەوەڕگایانەی کە بە هۆی هۆکاری نەخۆشی یەکەوە تووشبوون لەئەنجامی پیسبوونیان بەهۆی پاشەڕۆی ئاژەڵە تووشبووەکان و بڵاوبوونەوەیان بە ئالف و ئاوی خواردنەوەیان بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە ئاوی

وەستاویان تێدایەو هۆکاری نەخۆشی یەکە بۆ ماوەیەکی درێژ تێیدا دەمێنێتەوەو بۆ ماوەی هەژدە ڕۆژ توانای تووشکردنی ئاژەڵی ساغی هەیە بەتایبەتی لە وەرزە ووشکەکاندا.

سێیەم: خواردنەوەی شیری تووشبووی (( Infected Milk )) گوانی ئاژەڵی تووشبوو لەلایەن ئاژەڵە ساواکانەوە بە ڕێگەیەکی گرنگ دادەنرێت لە بڵاوبوونەوەو گواستنەوەی نەخۆشی یەکە.

نەخۆشی سیل لە مرۆڤدا: نەخۆشی سیل بە یەکێك لە نەخۆشی یە هاوبەشە گرنگەکانی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ دادەنرێت (( Important zoonosis )) کە تەندروستی گشتی دەخاتە مەترسیەوە بە تایبەتی لەو وولاتانەی کە خەڵکەکەی تا ئێستا دەناڵێنن بە دەست کەم خۆراکی یەوەو هەروەها ئەو نەخۆشییانەی کە دەبنەهۆی نزم بوونەوەی بەرگری لەش وەکو نەخۆشی ئایدز چونکە بەپێی سەرچاوە پزیشکی یەکان نەخۆشی سیل زیاتر تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە ئاستی بەرگری لەشیان نزمە((Immuno compromised humans)) مرۆڤ ( وە زیاتر لەنێو منداڵاندا ) تووشی نەخۆشی سیل دەبن لە ئاژەڵەوە بەهۆی بەکارهێنان و خواردنەوەی شیری تووشبووی ئاژەڵی تووشبوو بە هۆکاری نەخۆشی یەکە و هەروەها دەرکەوتووە لە ڕێگەی هەناسە وەرگرتنەوەش مرۆڤ تووش دەبێت، لەبەرئەوە کوڵاندنی شیر پێش بەکار هێنانی بە شێوەیەکی ڕێك و پێك ڕێژەی تووشبوون بەنەخۆشی یەکە دێتەخوارەوەو مرۆڤ بەهۆیەوە خۆی دەپارێزێت .

لە نیشانە دیارەکانی لە مرۆڤی توشبوودا:

- تای لێ دێت و ئارەزووی خواردنی نامێنێت.
- هەست بە ماندووبون دەکات وکێشی زۆر کەم دەکات.
- ئازارێکی تیژ لەسنگی نەخۆشدا پەیدا دەبێت و هەندێك جار خوێن هەڵدێنێتەوە ( Hemoptysis)
- هەندێك جاری دیکە تووشی سکچوون دەبێت.

نیشانەکانی نەخۆشی سیل: نیشانە گشتی یەکانی نەخۆشی سیل لەسەر مانگای تووشبوو بەوە دەستپێدەکات کە لەڕولاوازی یەکی لەبەرچاوی پێوە دەردەکەوێت و بێ هێزدەبێت و بەرەبەرە لە لەوەڕ دەکەوێت و بەشێوەیەکی پچڕپچڕ تای لێ دێت.

- لەشێوەی هەناسەی نەخۆشی یەکە (( Respiratory form )) ئاژەڵی تووشبوو تووشی هەوکردنی سی و بۆری یەکانی هەوا دەبێت(( Bronchopneumonia )) و لەئەنجامی ئەمەشدا کۆکەیەکی درێژخایەنی پچرپچری پێوەدەردەکەوێت و هەندێك جار تووشی هەناسەبڕکێی دەکات بەتایبەتی لەکاتی بەیانیان و وەرزە ساردەکاندا.

- گەورەبوون وئاوسانی گرێ لیمفاوی یەکانی لەش بەشێوەیەکی گشتیەوە بەتایبەتی ئەو گرێ لیمفاوی یانەی دەکەونە قوڵایی لەش و هەندێك جار وەك بەربەستێك دەبنە هۆی گیرانی ڕێڕەوە هەوایی یەکان و لەئەنجامدا هەناسەبڕکێی ئاژەڵەکە دەست پێ دەکات.

- دەبێتە هۆی نەزۆکی لەئەنجامی تووشبوون و پەکخستنی کۆئەندامی زۆربوون و هەروەها بەرخستنی ئاژەڵە ئاوسەکان .

- دەبێتە هۆی هەوکردنی گوان(( Mastitis )) کەلەڕووی تەندروستی گشتی یەوە بایەخی هەیە چونکە لەڕێگەی خواردنەوەی شیری گوانی مانگای تووشبووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئادەمیزادو هەروەها لەنێو ئاژەڵە ساواکاندا بڵاو دەبێتەوە.

چارەسەر و کۆنترۆڵ کردن: بە پێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری چارەسەری نەخۆشی سیل لە ئاژەڵە تووشبووەکاندا هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت وسەرکەوتوو نابێت، ئەمەش لەبەرئەوەی هۆکاری نەخۆشی سیل مایکۆبەکتریۆم لەناو خانەکاندا ژیان دەباتەسەر و دەرمان بەبڕێکی تەواو ناگاتە ناو خانەکان. گرنگترین ڕێگە بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی سیل کە لەزۆربەی وڵاتانی جیهان پەیڕەو دەکرێت بریتی یە لەڕیشەکێشکردنی نەخۆشی یەکە لەنێو ئاژەڵاندا بەهۆی پرۆسەی: (( Test and Slaugter )) کە بریتی یە لە پشکنین و دەستنیشانکردنی ئاژەڵەتووشبووەکان و لەئەنجامدا لەناوبردن و ناردنی ئاژەڵە تووشبووەکان بۆ سەربڕینخانە ، لەئەنجامدا دوای ماوەیەك ناوچەکە پاك دەبێتەوە و پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستانیش بیر لەم جۆرە پرۆگرامە بکاتەوە بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی سیل لە ئاژەڵ و مرۆڤدا چونکە تا لە ئاژەڵدا بنبڕنەکرێت لە مرۆڤدا کۆنترۆڵناکرێت.

ئەو سەرچاوانەی سودیان لێ وەرگیراوە:

1.Sulaiman, R.R.,2001.The prevalence of Tuber Culosis Among the Cattle in Sulaimani region. MVSc Thesis , college of veterinary Medicine , sulaimani university.
2. Radostis , O.M., Gay, C.C.,Blood ,D.C.and Hinchcliff, K.w.,2007. Veterinary Medicine.A text book of the Diseases of cattle,sheep , Pigs,Goats and Horses.
٣ الأمراض المشركة بين الانسان والحيوان. نووسينى د.صباح الحلوچى و د. عبدالحسين بيرم (١٩٨٥).

## (( زاووزێ وزۆربوون لەگامێشدا ))

سامانی ئاژەڵ یەکێك لە پایە سەرەکی یەکانی ئابووری کوردستان پێك دەهێنێت و سەرچاوەیەکی سەرەکی پرۆتینی ئاژەڵە کە ئادەمیزاد کەڵکی لێ وەردەگرێت،لەبەرئەوە بایەخدان بە پرۆژەکانی بەخێوکردنی ئاژەڵ وئاژەڵداری بەشێوەیەکی گشتی بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت لە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی کوردستان و هەروەها بەهێزکردنی ئابوری وولآت. گامێش (( Buffalo )) یەکێکە لەو ئاژەڵانەی کە سودێکی ئابوری زۆری هەیە بەوەی سەرچاوەی بەرهەم هێنانی برێکی باشە لە شیرو گۆشت و هەروەها پێستەکەیشی لە زۆر پیشەسازی بەکاردەهێنرێت. بە پێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری گامێش جۆرێك لە شیر بەرهەم دەهێنێت کە خاوەن کوالێتی یەکی بەرزە بەوەی ٧٪ ی چەوری تێدایە و ٤٪ پرۆتینە. بەپێی ئامارەکانی رێکخراوی (( FAO)) ژمارەی گامێشەکان لە جیهاندا گەیشتۆتە ((١٥٠)) ملیۆن سەرو ٥٣٪ ی ئەو ژمارەیە لە وولآتی هندستان بەخێودەکرێت.بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر گامێش لە جیهاندا هەیە کە هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆیان هەیە لەوانەش:

یەکەم: گامێشی رووبارەکان (( River buffalo ))

- ناوە زانستی یەکەی بریتیە لە (( Bubalus bubalis )) زیاتر لە وولآتانی هندستان و میسرو هەندێ لە وولآتانی ئەوروپا دەژین بەشێوەیەکی سەرەکی بەکاردەهێنرێن بۆ بەرهەم هێنانی شیر و گۆشت و پێستە.

دووەم: گامێشی زۆنگاوەکان (( Swamp buffalo ))

- ناوە زانستی یەکەی بریتیە لە (( Bubalus Carabanesis ))
- ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی : ٤٨ کرۆمۆسۆمە. زیاتر لە باشوری رۆژهەلآتی ئاسیاو چین بەخێودەکرێن و بەشێوەیەکی سەرەکی بەکاردەهێنرێن بۆ بەرهەم هێنانی گۆشت و لە ئیش وکاری جیاجیادا سود بە مرۆڤ دەگەیەنێت . لەکوردستانیشدا ژمارەیەکی باش گامێش بەخێودەکرێت کە سوودی زۆری بە بازاڕەکان گەیاندووە لەبەرئەوە زانیاری لەبارەی پرۆسەی زاووزێ و زۆربوون لە گامێشدا بەپێویست دەزانرێت.

بەپێی سەرچاوەکان لەیەکچونێکی زۆر هەیە لەنێوان کۆئەندامی زۆربوون لە گامێش و مانگادا لە ڕووی فسیۆلۆجی و توێکاری،کۆئەندامی زۆربوون لە گامێشدا پێکهاتووە لەجووتێك هێلکەدان و جووتێك جۆگەلەی هێلکەو گوێرەکەدان و ملی گوێرەکەدان وزێ. یەکێك لەخەسڵەتە گرنگەکانی مێ بەشێوەیەکی گشتی بوونی سوڕی مانگانەیەکەپێی‌دەوترێت سوڕی هێلکەدان (( ovarian cycle)) یان سوڕی زۆربوون ((Reproductive ))

وە لە نێو خاوەن ئاژەڵدا پێی دەوترێت سوڕی هاتنەکەڵ (( Estrus cycle)) ماوەی سوڕی هاتنە کەڵ لە گامێشدا نزیکەی ((٢١)) ڕۆژە. لەئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆجییانەی کە بەسەر هێلکەداندا دێت سوڕی هێلکەدان بەچەند قۆناغێکی یەك لە دوای یەکدا تێدەپەڕێت لە ژێر سەرپەرشتی و کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی کۆئەندامی دەمارو ژێر مێشکە ڕژێن ؛ قۆناغەکانی سوڕی هاتنەکەڵ بریتین لە:

١. قۆناغی پێش هاتنەکەڵ (( proestrus phase )).
٢. قۆناغی کەڵ ((Estrus phase)).
٣. قۆناغی دوای کەڵ (( Metestrus phase )).
٤. قۆناغی تەنەزەردە (( Diestrus phase )). هەر قۆناغێك لەم قۆناغانەی سوڕی هێلکەدان چەند خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی هەیە کەلەسەر هێلکەدان دا دەردەکەوێت و گرنگترینیان پرۆسەی هێلکەدانانە

(( ovulation )) و درووست بونی هێلکەیە لەژێرکاریگەری ڕاستەوخۆی هۆرمۆنی لیۆتینی (( LH )) کە لە پلەی پێشەوەی ژێرمێشکە ڕژێنەوە دەردەچێت. پرۆسەی هێلکەدانان لەگشت جۆرەکانی ئاژەڵ لە قۆناغی کەڵ دا (( Estrus phase )) ڕوودەدات بەڵام لە گامیش و مانگادا پرۆسەی هێلکەدانان لەقۆناغی دوای کەڵ ((Metestrus phase )) ڕوودەدات. بەشێوەیەکی گشتی و بەپێی سەرچاوەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری ڕادەی بەپیتی (( Fertility rate )) لە گامێشدا بە بەراورد لە مانگادا کەمترە، ئەمەش بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانەش:

یەکەم// تەمەنی باڵغبوون (( puberty )) لە گامێشدا دوادەکەوێت واتە گامێش بەدەست کێشەی (( Delayed puberty )) دەناڵێنێت کە ئەمەش وادەکات گامیشەکان درەنگتر سوڕی کەڵیان

لەسەردەربکەوێت و زاووزێ بکەن. دەرکەوتووە گامێشی ڕووبارەکان لە تەمەنی ١٥–١٨ مانگ دەگەنە تەمەنی باڵغبوون و گامێشی زۆنگاوەکان لە تەمەنی ٢١–٢٤ مانگ دەگەنە تەمەنی باڵغبوون

دووەم// گامێش بەشێوەیەکی گشتی زیاتر تووشی هاتنەکەڵی بێ دەنگ (( Silent estrus )) دەبن واتە نیشانە دیارەکانی کەڵ لەسەر ئاژەڵی بەکەڵ بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا دەرناکەوێت کە ئەمەش وادەکات خاوەن ئاژەڵ توانای دەستنیشانکردنی ئاژەڵی بەکەڵیان نەبێت و لەئەنجامدا نێگەتیڤانە کاردەکاتەسەر پرۆسەی زاووزێ و زۆربوون لە گامێشدا.
سێ یەم// لەدوای زایینی ئاژەڵەئاوسەکان بۆماوەیەکی درێژ هێلکەدانەکان بەناچالاکی دەمێننەوە (( Long post-partum ovarian in activity )) ئەمەش وادەکات گامێشەکان درەنگتر بێنەکەڵ و لە ئەنجامدا زاووزێ بکەن و زۆربن، بێ گومان ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر ئابووری خاوەن ئاژەڵەکان و هاتنەخوارەوەی ئاستی بەرهەم هێنان.
چوارەم// ژمارەی چیکڵدانە سەرەتایی یەکان: (( primordial follicles )) لە هێلکەدانەکانی گامێشدا زۆر کەمترە بە بەراورد لە مانگادا،لەگامێشدا دەگاتە ( ١٠,٠٠٠–١٩,٠٠٠) چیکڵدانە بەڵام لە مانگادا دەگاتە نزیکەی (١٥٠,٠٠٠) واتە ژمارەی هێلکەکان لە گامێشدا زۆر کەمترە لە هێلکەکانی مانگا.
پێنجەم// ژمارەی چیکڵدانەپێگەیشتووەکان (( Mature follicle )) لە هێلکەدانی گامێشدا زۆر کەمترە بەبەراورد لە مانگادا .
شەشەم// پرۆسەی پوکانەوەی چیکڵدانەکان: (( Follicular atresia )) لەهێلکەدانەکانی گامێشدا زیاتر ڕوودەدات بەبەراورد لە مانگادا ئەمەش بێ گومان دەبێتەهۆی کەم بوونەوەی بەرهەم هێنانی هێلکە. بەشێوەیەکی گشتی و بەپێی زۆربەی سەرچاوەکان گامێش پۆلێن دەکرێن لە چوارچێوەی ئاژەڵە کەم بەرەکان یان کەم بەرهەم (( shy breeder )) واتە لەڕووی سێکسی یەوە کەمتر لە ئاژەڵەکانی دیکە بەرەو زاووزێ کردن یەکتر ڕادەکێشن.ماوەی سوڕی کەڵ نزیکەی ٢١ ڕۆژەو ماوەی قۆناغی کەڵ نزیکەی ٢١ کاتژمێرەو درێژی ماوەی ئاوسی لە گامێشی زۆنگاوەکان

( ٣٢٠-٣٤٠) ڕۆژەو لە گامێشی ڕووبارەکان دەگاتە ( ٣٠٥-٣٢٠) ڕۆژ. زۆر هۆکارهەن کاردەکەنە سەر سوڕی هاتنەکەڵ و کۆئەندامی زۆربوون لە گامێشدا:

١. پلەی گەرمی: کەش وهەوای زۆر سارد یان زۆر گەرم دەبێتەهۆی دابەزینی ئارەزووی سێکسی لەنێوان نێر و مێ داو لە ئەنجامدا پرۆسەی زاووزێ و زۆربوون پەکی دەکەوێت.
٢. وەرزی زاووزێ: بەپێی سەرچاوەکان گامێش لەچەند وەرزێکی دیاریکراودا چالاکی زاووزێ ی پیشان دەدات، لەبەرئەوە پۆلێن دەکرێن لەچوارچێوەی ئەو ئاژەڵانەی کە وەرزە زاووزێن (( Seasonally polyestrus )) و دەرکەوتووە لە وەرزە فێنکەکانی وەکو پایزو زستان کۆئەندامی زاووزێیان چالاك دەبێت و نێرو مێیان ڕوودەکەنە زاووزێ کردن.
٣. ڕووناکی: کۆئەندامی زۆربوون لە گامێشدا لەو وەرزانەدا چالاکن کە ڕۆژ کورتە و ماوەی تاریکی زیاترە،ئەمەش بێ گومان لە وەرزەکانی پایزو زستاندا ڕوودەدات.
٤. خۆراك: کەمی ئاڵفی سەوزو ڤیتامین و کانزاکان بەشێوەیەکی گشتی کاریگەری خراپیان هەیە لەسەر ئاستی زاووزێ و زۆربوون لە گامێشدا.
٥. ئاستی بەرهەم: لەو ئاژەڵانەی کەبەرهەمی شیریان زۆر زیاترە لە ئاستی ئاسایی دەرکەوتووە بەدەست نەخۆشی یە درێژخایەنەکانەوە دەناڵێنن.
٦. ناهاوسەنگی لە هۆرمۆنەکان : ناهاوسەنگی لە هۆرمۆنەکانی زۆربوون وەکو ئیسترۆجین و پرۆجسترۆن بەشێوەیەکی خراپ کاردەکاتە سەر کۆئەندامی زۆربوون و دەبێتەهۆی نارێك و پێکی لە دەرکەوتنی سوڕی کەڵ بەمەش ئاستی زاووزێ و زۆربوون دێتەخوارەوە.

ئەو سەرچاوانەی سودیان لێ وەرگیراوە:

1.Suthar,V.S.and Dhami,A.J.( 2010). Estrus Detection Methods in Buffalo.Veterinary world vol.3(2): 94-96.
2.Hafez , B.and Hafez, E.S.E.(2000).Reproduction in farm Animals . 7th edition.

## نوسەر لەچەند دێڕێکدا:

- لەساڵی ١٩٦٩ لەشاری کەرکوك لەدایك بووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی وناوەندی وئامادەیی لەشاری سلێمانی تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٩١ کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرینەری لە زانکۆی بەغداد تەواوکردووە.
- لەساڵی ٢٠٠١ بڕوانامەی ماستەری لەزانستەکانی پزیشکیی ڤێتێرینەری لەزانکۆی سلێمانی بەدەستهێناوە.
- ساڵی ١٩٩٤ وە مامۆستایە لەزانکۆی سلێمانی.
- لەساڵی ٢٠٠٣ فەرهەنگی ڤێتێرینەری داناوە بە سێ زمانی (کوردی-عەرەبی-ئینگیزی) کەبەیەکەم فەرهەنگ دادەنرێت لەبواری پزیشکی ڤێتێرینەری لەسەر ئاستی کوردستان وعێراق.
- لە زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا ووتاری بڵاوکردۆتەوە.
- لەساڵی ٢٠٠٥ لەزانکۆی هۆهنهایم و دام و دەزگاکانی ڤێتێرنەری لەشاری شتوتگارت لەئەڵمانیا سێ مانگ بەشداری ڕاهێنانی کردووە.
- لەساڵی ٢٠٠٨ هەڵبژێراوە بەسەرۆکی کۆمەڵەی ئەکادیمیای کوردستان.
- لەساڵی ٢٠٠٩ بڕوانامەی دکتۆرای لەزانستەکانی پزیشکی ڤێتێرنەری لەزانکۆی سلێمانی بەدەستیهێناوە.

- کۆمەڵێك توێژینەوەی زانستی بڵاوکردۆتەوە لە گۆڤارە زانستی یەکانی زانکۆکانی کوردستان و عێراق.
- ئێستاش یاریدەدەری راگری کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرنەری یە لەزانکۆی سلێمانی.